# گەردەلوولی سیاسەت

فوئاد سدیق



بەشی دووەم

چاپی یەکەم


دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● گەردەلوولی سیاسەت

● ئامادەکردنی: فوئاد سدیق
● نەخشەسازی ناوەوە: شاخەوان جەعفەر
● بەرگ: لوقمان رەشیدی
● ژمارەی سپاردن: ٢٦٧٨
● نرخ: ٢٥٠٠
● چاپی یەکەم ٢٠٠٩
● تیراژ: ١٠٠٠
● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٥١)



ماڵپەر: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## لە جیاتی پێشەکی

بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردســـتان، بزووتنەوەیەکی ئاســـایی نەبووە، بگرە لە مێژووی خەباتی گەلانی جیهانیشـــدا، ناوازەیە، زۆر هەڵکشـــان و داکشانی بەخۆیەوە دیوە... تەمەنـــی ئەو بزووتنەوانە، قۆناغ بە قۆناغ لە گۆڕاندا بووە، هەڵوێستی سیاسی پێکناکۆك و ئاڵۆزبووە.... هەر لە سەرەتای قۆناغی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستانیدا بووە کە فیکرەو بۆچوونی جودا بۆ شۆڕش هەبووە، ئەنجـــام جیابوونەوەی لێ هاتۆتە بەرهەم دواتریش شـــۆڕش شکســـتێکی زۆر گەورەی پێ گەیشت و جارێکی دیکە شۆڕشی نوێ سەریهەڵدایەوە و ئەمجارە بە چەندین ئایدۆلۆژیا و کاریگەریی چەندین شۆڕشـــی جیهانی، شـــۆڕش لە شاخەکانی کوردستان داگیرسایەوە.

تا ئێســـتا چەند کتێبێك کە بیرەوەری هەندێ کەسایەتی سیاسین، کەوتوونەتە بەردەســـتی خوێنەران، لێ گرفتەکە ئەوەیە، لە هەموو ئەو بیرەوەری و یاداشت نووسینانەیاندا کەســـێکمان نەدی پاڵەوانی دۆڕاندنەکان بێت، بەڵکو هەموویان پاڵەوانی داستانە نەمرەکان و سەرکەوتنە هەمیشەییەکانن. لەم بەرگی دووەمەدا، هەندێ راســـتی مێژوویت بۆ دەردەکەوێ، دەزانی ئاراستەی شۆڕش لە کوێوە بۆ کوێ چووە، ســـەرکردەکانی چۆن بوونە، چ ئایدۆلۆژیایەك بەسەریاندا زاڵ بووە، راســـتە ئەم بەرگی دووەمەش تەواو و راستی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانت پێ نیشـــان نادات، چونکە ئەم قۆناخی رزگاریخوازییە پێویستی

به چەندین بەرگ هەیە، زۆر کەســـایەتی دیکەش ماون، دیمانەی لەم شێوەیان لەگەڵ بکەم کە ئەزموون و ڕۆڵێکی گرنگیان بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستاندا هەبووە، هیوادارم لە بەشی سێیەمی ئەم گەردەلوولی سیاسەتەدا بتوانم، بەشێکی تری ئەو کەسایەتییانە بخەمە ناوی، کە ڕۆڵیان هەبووە، هیوادارم بەم دوو بەشە توانیبێتم حەقیقەتی ئەو شۆڕش و ئەو قۆناخ و زهنیەتی سەرکردە کوردەکانم بە خوێنەر گەیاندبێ، کە دەکرێ خوێنەر بۆ خۆی لێکدانەوەی خۆی بۆ بکات.

کەسایەتییەکی دیاری بزاڤی کۆمۆنیستی بووە بەدرێژایی نزیکەی نیو سەدە، لەناو خەباتی سەختدا ژیانی گوزەراندووە، هەر لە شەق و تێهەڵدانەوە تا دەگاتە ئاستی سکرتێری حزبی شیوعی و لەوێوەش بۆ سەرکردایەتی و دواجاریش بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەو مشتومڕێکی سیاسییانە، لە کۆنگرەی چوارەمی حزبی شیوعی کە لە ١٩٨٥دا بەسترا، نەیانهێشت بەشداری ئەو کۆنگرەیە بکات، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ، بەهادین نوری هەمیشە بەرامبەر بە ئەوانی دی با لە یەك حزبیشدا بووبن لە ململانێ و جۆرێك ناکۆکیدا بووە، هەر لە حەمید عوسمان-ەوە، تا دەگاتە عەزیز محەمەد، بەڵام هەست دەکەی بەهادین زۆرجار گوێیشی لێنەگیراوە قسەکانی، بیروڕاکانی، زۆر بە هەند هەڵنەگیراون، سەرئەنجامیش دۆخەکە گەیشتە ئەوەی بەهادین نەك هەر لە حزبی شیوعی دا نەمێنێت، بەڵکو لەگەڵ ڕەوتی ناسیۆنالیستدا جۆرێك لە تەبایی بنوێنێت و بەم تەمەنەیەوە دوای نیو سەدە خەبات، بەرهەمەکەی ئەوەیە کە دەبینرێ!!

بەهەرحاڵ ڕەنگە نموونەی وەکو بەهادین نوری کەم نەبن، حزبێك بەم هەموو هەلومەرجە دژوارە تێپەڕ ببێ، زۆر قوربانی داوە، بەڵام سەرکردایەتییەکی نا سەردەمانە ئەو حزبەی وردە وردە بردەسەر لێواری مەرگ، کە ئێستا نووزەی لێوە نایە.

*** دەكـــرێ بزانین بەر لەوەی ئینتیمات بۆ ناو (حزبی شـــیوعی عێراق- حشـــع) هەبوویێت، هیچ جۆرە ئینتیمایەكی سیاســـی ترت هەبووە، لە حزبێك یا رێكخراوێكی سیاسیدا بووی؟**

- من لە بەهاری ١٩٤٦ دا بۆ یەكەمجارم بوو پەیوەندیی سیاســـی ببەستم، ئەویش لەگەڵ حزبی شیوعیدا بەستم و دەستم بەكاری حزبایەتی و سیاسەت كرد.

*** لە ســـاڵی ١٩٤٥ یەكێتیی تێكۆشین جیابوونەوەو ئینجا داوایانكرد یەكبگرنەوە، بەڵام هاورێ فەهد لەسەر ئەم یەگرتنەوەیە بۆچوونێكی توندی هەبوو، داوای لێكردن خۆیـــان هەڵبوەشـــێننەوە، ئینجا یەكە یەكەو بە تەنها بۆ خۆیـــان پەیوەندیی بە حزب بكەنەوە، ئەمە بۆ؟**

- لە راســـتیدا من بە گەورەیی ئەو شتانەم زانی، ئەو وەختە یەكێتیی تێكۆشین لە ســـلێمانی نەبوو، تەنزیمی حیزبی شیوعی تازە پەیدا ببوو (مەبەستم حزبی شیوعی عێراق و جەماعەتی فەهدە)، من یەكســـەر چوومە ناو حزبی شیوعی سەر بە فەهد، هەر لە ئەوەلەوە لەو حزبە ئیشمكردووە هەتا ساڵی ١٩٨٤.

*** باشە تاقمەكەی هەولێر، وەك ساڵح حەیدەری، حەمید عوسمان، جەمال حەیدەری، عەزیز محەمەد، ئەوانە خۆیان هەڵنەوەشـــاندەوە، كەچی لە ساڵی ١٩٤٥ نەهاتنە ناو حزبی شیوعی و خۆشیان هەڵنەوەشاندەوە؟**

- ئاخر دوای ساڵێك ئەوانیش خۆیان هەڵوەشاندەوە.

***ئێوە كە بارەگای سەركردایەتیتان ئەوكات لە بەغدا بوو، چەند ئاگاداری پەیوەندیی نێوان حزبی رزگاری لەگەڵ حزبی شـــۆڕش بووی؟ پەیوەندیی ئەم دوو حزبە لەگەڵ یەك چۆن بوو؟**

- خۆی یەكێتیی تێكۆشـــین لقی ئەو بوون، تابعی ئەو بوون و خۆی هەڵوەشاندەوە، حزبی شۆڕش كە تۆ ناوت هێنا مانەوە، بەڵام دوای ساڵێك ئەوانیش خۆیان هەڵوەشاندەوە هاتنە ناو حشع.

*** ئەوانە مەبەســتم حەمید عوســمان، جەمال حەیدەری، عەزیز محەمەدو...هتد لە ســاڵی ١٩٤٥ لە دەرەوەی حشــع بوون و کوتلەیەك بوون و بڕواشیان لەگەڵ حشع و سیاســەتەکەی نەدەگونجا، پرســیارەکە ئەوەیە ئەی چۆن هەریەك لەوانە گەیشتنە لوتکەی ئەو حزبە کە ســکرتێری حزب بوو، ئەوانە پێشــتر لــە حزبی دیکە کاریان دەکرد؟!**

- ئەوانە پێشـــتر فیکری مارکسیان هەبوو، تەنانەت وەك شیوعییەك ئیشیان دەکرد، راســـتە لـــە دەرەوەی حیزب بوون، بەڵام ئەو وەختە حیزب هێشـــتا بە تەواوی هەموو شیوعییەکانی بۆ کۆ نەدەکرایەوە ناوخۆی، ئینجا ئەوانە کە هاتنە ریزی حزبی شیوعی عێراق بوون بە ئەندام، ئەندامیش لە حزبی شیوعی ئەوکات وەك هەر ئەندامێکی دیکە مافی تەواوی هەیە چ لە بواری هەڵبژاردن چ لە بوارەکانی دی، ئیتر بۆچی نەبن؟ ئەوەی خەباتی باش بکات، ئەوەی دەوری بووبێ بۆ نەبێ، بابێ.

*** ئێوە کە بارەگای ســەرکردایەتیتان لە بەغدا هێنایەوە کەرکوك، رێك ئەو وەختەی کە هاتە کەرکوك کێ سکرتێری حزبی شیوعی بوو؟**

- کە من هاتمە کەرکوك؟

*** تۆ بە تەنها وەکو خۆت هاتی یان بەو سیفەتەی کە سکرتێری حزبی؟!**

- من پێت بڵێم لەو رۆژەی کە چوومە بەغدا لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٤٩ هەتا ١٣ی نیسانی ١٩٥٣ ئەو چوار ساڵە هەر من سکرتێر بووم.

*** نازانم، چۆنێتی بوون بە سکرتێریت تا ڕادەیەکی زۆر سەیر دێتە بەرچاو، چونکە تــۆ ئــەو کاتە وەك تەمەن زۆر بچووك بوویت، تەنها (٢٢) ســاڵ بوویت وا بزانم لە لیژنەی محەلی ســلێمانیدا بوویت، ئیتر چۆن لە لیژنەی محەلی (پارێزگا) یەکسەر بۆ سکرتێری حزبی شیوعی؟!**

- بەڵێ بەر لەوەی ببمە ســکرتێری حزب، بەرپرســـی لیژنەی محەلی ســـلێمانی بووم.

*** باشـــە چۆن لە لیژنەی محەلی یەکسەر گەیشتی بە سکرتێری، ئەمە چ جۆرە بڕیارێکە؟!**

- لە حیزبی نهێنیدا ئەو شتانە ئەبێ، حیزبی شیوعی حیزبێکی نهێنی بوو، کەوتە بەر هێرشی توندوتیژی پۆلیس لە مانگی (١٠)، مالك سێف و هی دیکە کە نیادەی مەرکەزی بوون، گیران پاش مانگێك مالك سێف رووخاو ئیعترافی کرد لەسەر هەموو

ئەو شـــتانەی کە ئەیزانی، (ســـەلام ناســـری و عەزیز ئەلحاج)یش گیران، ئەوانیش بەهۆی ئیعتراف و شتی دیکەوە رووخان.

*** ئەگەر قەوسێکم بدەیتێ، مەبەستی من ئەوە بوو، جەنابت کە بووی بە سکرتێر، بە بڕیار بوو، یان کەس لە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی دا نەمابوو، چۆن بوو؟!**

- تۆ وا ئەزانی سکرتێری ئەو کاتە چۆن بوو، خۆ دەستکەوت و ئیمتیازات نەبوو وەکو ئێســـتا کە هەیە، بەڵکو هەر گرتن و راونان بوو، کێ ئازایە با بچێتە پێشەوەو ئاڵاکە هەڵگرێ، هەڵبژاردن نەبوو ئینتیخابات و ئیمتیازات و ئەو شتانە چی دەکرد....

*** یانی لە کۆمیتەی ناوەندی کەس نەمابوو؟**

- کـــوڕە نەوەڵڵا کەس نەمابوو، یان لە دەرەوە بوون، یان توانایان نەبوو، من کاغەزم بۆ هات لەو برادەرانەی کە گیرابوون، بۆ نموونە حەمید عوســـمان لە زیندان نامەی بۆ ناردم کە ســـکرتێری حزب بگرمە ئەســـتۆی خۆم. هەریەکەو ناوەند (مرکز)ێکی دروستکرد، حەمید عوسمان پێنجەمین ناوەندی دروستکرد.

*** چۆن؟ مەبەستت لە(ناوەند)ی چییە؟**

- لە مانگی (١٠)ی ساڵی ١٩٤٨ تا مانگی (٦)ی ساڵی ١٩٤٩ لەو هەشت نۆ مانگەدا، حەمید عوســـمان پێنجەم ناوەندی دروستکرد، پێش ئەویش مەهدی حەمیدو جاســـم الگحاب ئەوانە چوارەم مەرکەزیان دروســـتکرد، پێش ئەوانەش ســـێیەم ناوەند دروستکرا، هەروەها مالك سێف و خەڵکانی دیکەش ناوەندی دیکەیان دروستکرد، من هاتم شەشەم ناوەندم دروستکرد، لە ماوەی (٨-٩) مانگدا، ئیتر کەس هەڵنەبژێردرایەوەو کەس نەبوو کەس هەڵبژێرێ، حیزب لەژێر زەرمینی دا بوو.

*** رەخنەت لەســـەر نەبوو کـــە چۆن گەنجێکی تەمەن (٢٢) ســـاڵ دەبێ ببێت بە ســـکرتێری حزبێك کە بە حیســـاب حیزبێکی شۆڕشـــگێڕو دروشـــمی زل زلی هەڵگرتووە؟!**

- کەس ئاگای لێ نەبوو کێ ئەگیرێ و کێش ئەبێ بە سکرتێر، لە حزبێکی نهێنیا ئـــەوەی ئەکەوێتە ئەوێ، جاری وا هەیە بە صدفەیە، جاری وا هەیە بەهۆی خەبات و زانیاری خۆیەوەیە، من ئەو کاغەزەم بۆ هات لە ســـلێمانییەوە، پاش ئەوەی تەنکیدم کردەوە، کە ئەوەی هاتووە دروســـتەو مەوســـوقە، ئیتر چووم بۆ بەغدا، لەوێ یەکێکی هەولێریم دی ناوی هادی ســـەعدی بوو لە دارلموعەلمین قوتابی بوو، ئەو پێی وتم حەمید عوســـمان گیراوەو پێش گرتنەکەش وتی ئەگەر گیرام بە شـــوێن فلانە کەس

(واته من- بەهادین نوری ) بنێرن بابێت ئیشمان پێیەتی، هادی وتی، بیلال عەزیزیش لـــە بەغدا بوو لەگەڵ هادی دا بوو، ئەویش لـــە دارلموعەلمین بوو، بیلال عەزیزیش ئێستا ماوەو لە هەولێرە، نازانم ئێستا، لەناو پارتییە یان نا، وەختێك لەگەڵ عەبدولخالق زەنگەنـــە بوو، ئەویش چووە ناو پارتی، ئەو دوو کەســـە لەو جەماعەتە بوون کە من لە ١٩٤٩ چووم لە بەغدا دیمن، قوتابی بوون، دەیانخوێند، شـــیوعیش بوون، تاقمێك عەرەب و تاقمێك کوردو من بە حوکمی ئەوەی تەجروبەشم زیاتر بوو، رەنگە مستەواشم باشتر بووبێ، چوومە ئەوێ هەر بۆ ئەوە بانگکرابووم کە جێی سکرتێر بگرمەوەو ببمە شەخسی یەکەمی ئەو حیزبە، بوویشم، ئیتر بەبێ هیچ مەرسوومێکی جمهوری، بەبێ هیچ هەڵبژاردنێك بووم بە سکرتێر.

هەوڵمـــدا ببینە دوو کـــەس لە هەرەمی حیزب، یەکێك بێـــت یارمەتیم بدات، پاش مانگێـــك یان دووان، ناردم بەدوای زەکی وەتبان کـــە رێکخەری رێکخراوی لیژنەی مەحەلی بەســـرە بوو، زەکیم لە ١٩٤٩/٨/٢٤ گەیاندە بەغدا، هادی ســـەعید کە پێشتر باســـم بۆ کردی، خەڵکی هەولێر بوو گیرا و رووخـــا، چونکە ئیعترافی کرد، ئیدی ئێمە ناچار خۆمان شـــاردەوەو پاش هەفتەیەك ئینجا کەوتینە کەمینێکی ئاسایشـــی گشـــتی (ئەمنی عام) کـــە هادیان لەگەڵدا بوو، بەهۆی ئـــەوەوە من گیرام، زەکی گیرا، برادەرێکی ترمان لە دواوە بە دووری (٥٠) مەتر ئەڕۆیشـــت، کرێکاری نەوتی کەرکوك بوو، ئەویش گیرا، ئیتر لە ناو ئەو مەوقیفە من کەوتمە شـــەڕە شەق و زرمە زلێ لەگەڵ جەماعەتی ئەمن، شەش حەوت کەس بوون، وا بزانم هەشت کەس بوون، خۆم رزگارکرد بەشـــەڕە شەق و شەڕە بۆکس و. ئەو شـــتانە خۆم رزگارکرد، رەنگە پەنجـــا (٥٠) دەمانچەیان زیاتر پێوەنام، بـــەس پوختە بەرم نەکەوت، دوای من زەکی بەســـراوییەکە خۆی رزگارکرد، دەمانچەیان پێوەنـــا، دەمانچەیێ بەر قاچی کەوت، شانسی نەبوو گیرا، ئێستاش بەهۆی ئەو دەمانچە پێوەنانەوە شەلەو وا بزانم هێشتا لە ژیاندایەو لە بەسرە دەژی.

کە زەکی گیرا بە برینداری بردیان ئەویش هەڵوێســـتی نەبوو، برادەرێکی تریشمان کـــە ناوی رەئوف بوو، کەرکوکی بوو، کرێـــکاری نەوتی کەرکوك بوو، ئەویش گیرا، دوای گرتنی ئەو رەئوفە، من چووم بۆ کەرکوك، تەقدیرم وا بوو ئینسان بۆ فەترەیەك لە بەغدا دوور بکەوێتەوە، ئەمە لە رووی ئەمنییەوە ســـەلامەتترو باشترە، ئیشەکانیش باشـــتر بەرێوەدەچن، تەرتیباتم دروســـتکرد لە بەغدا، مەسئولمان داناو رێکخستنمان

دروســـتکردەوەو پەیوەندیان لەگەڵما هەبوو، لە کەرکوك موراسیلمان هەبوو لە نێوان من و ئەو رێکخستنە نوێیە بێت و بچێت، واتە هاتوچۆ بکات، بە کاغەز ناردن بۆ یەکتری ئاگامـــان لە یەکدی بوو. لـــە کەرکوك مامەوە لە مانگی ئەیلولی ١٩٤٩ تا ئایاری ١٩٥٠ دوای ئەوە کەرکوکم بەجێهێشت و گەڕامەوە بەغدا.

*** مامۆستا فراکسیۆنی الاتحاد خەڵکی سلێمانی بوون؟**

- جەماعەتی الاتحاد، مەسئولەکەیان کەریمی سۆفی بوو، پێش ئەوەی من بگیرێم مەسئولی من بوو.

*** مەبەســـتی من ئەوەیە، بۆچی جیابوونەوە، رەخنەیان لەسەر حزب چی بوو، یا تێڕوانینی ئێوە لە جیابوونەوەکەیان چۆن بوو، هۆکاری جیابوونەوەکە چی بوو؟!**

- وەڵڵاهی بێشك جۆرێك لە رەخنەیان دەگرت لە حزب، بەڵام رەخنەکانی ئەو کات، مســـتەوای کادیری ئەو کات زۆر لاواز بوو، بۆیە مەرج نەبوو رەخنەی سیاســـی و مەبدەئی لە حزب بگرن.

*** باشە پلەی حیزبی کەریم سۆفی چ بوو؟!**

- کەریم لە ساڵی ١٩٤٩ لە سلێمانی، کاتێ ساسان دەلال بڕیاریدا راپەڕینی (١٩٤٨) تازە بکاتەوە، حەمید عوســـمان بەرپرســـی ســـلێمانی بوو، ئەو وەختە کەریمی سۆفی شەخســـی دووەم بوو لەناو رێکخستنی ســـلێمانی، پلەکەی ئەوە بوو. منیش شەخسی ســـێیەم بووم، بەڵام منیان هەڵبژارد، واتە منیان تەکلیف کرد بۆ ئەوەی ســـەرکردایەتی خۆپیشاندانەکانی سلێمانی بکەم، سێ خۆپیشاندانمان رێکخست، لێرە لە سلێمانی دوای سێیەمین خۆپیشاندانەکە، راپۆرتێکم دا بە حەمید عوسمان و گوتم، توانای خۆپیشاندان نییە، خەڵك ئامادە نییەو هەڵەیەو دەبێتە هۆی لە ناوچوونی بەقایەی رێکخستنەکانمان، ئەویش (حەمید عوســـمان) پەسندی کردو ئیتر خۆپیشاندانمان وەستاند، پاش ماوەیەك حەمید عوسمان لە سلێمانی نەما، من درەنگتر زانیم کە چووە بۆ بەغداو مەسئولییەتی وەرگرتووەو بووە بە بەرپرســـی یەکەمی حزب لە بەغدا، ئیتر کەریمی ســـۆفی بوو بە مەسئولی یەکەم لە سلێمانی، بەڵام هەمووی چەند رۆژێکی پێچوو، وەفدێکی ئەمنی عام لە بەغداوە هاتن بۆ ســـلێمانی و کەریمیان گرت، شەوکەت غەفور کاغەزێکی بۆ ناردم، شەوکەت برای ئەسعەد غەفور بوو شیوعی بوو، وتی کەریم گیراوەو وا لە فلان جێیە، چووم بووم بە مەســـئول، وتم تەبیعەتی حـــاڵ هەروایە، پاش ماوەیەك هەر دوو سێ هەفتە دەبوو، ئەکرەم یامولکی بەنێژراوێ تەکلیف کرا ببێ بە مەسئولی یەکەم لە

سلێمانی، خۆی خەڵکی سلێمانیش بوو، ئیتر بوو. خیلافی من لەوەوە لەگەڵ ئەکرەم دەستی پێکرد، ئەوانەی گیرابوون و لە شوباتدا ئیعدام کرابوون لە ١٤ و ١٥ی شوباتدا ئیعدام کران وەك فەهدو حازم و سارم و ئەوانە، کەچی لەو وەختەی کە ئەوان وا رژێم شەهیدی کردوون، ئەکرەم لەو وەختە ئیدانەی دەکردن.

*** ئیدانەکەی چی بوو؟**

- ئەو شکستەی تووشی حزب بووبوو، بەرەئی ئەکرەم، فەهدو زەکی بەسیم و حوسێن شەبیبی (پێیان دەوترا حازم و سارم- ف.س)بەرپرسن لە خولقاندنی ئەو وەزعە خراپە، وای بۆ دەچوو، ئەو وەختەش تەبعەن مەیلی عیبادەتی شەخسی بەهێز بوو، نەك لەلای ئێمە بە تەنها، بەڵکو لای هەموو شیوعییەکانی دونیا.

*** ئەی تاقمی نەجمە، ئەوان چی بوون و چیان ئەویست؟!**

-با ئەوەشت پێ بڵێم ئەکرەم بەیاننامەیەکی دەرکرد، لەسەر ئەو ناوانەی سەرەوە کە بۆم باسکردی، حزب کردی بە مەسئولی ئێمە، بەڵام ئێمە رەفزمان کرد، ئیتر رێکخستنی سلێمانی بوو بە دوو بەش، دوو کەرت، سەدی هەشتا رێکخستنەکە لەگەڵ من مایەوە، بەڵام ئەوەی مایەوە یانی سەدی بیستی لەگەڵ ئەکرەم بوو، ئینجا تۆ لە پرسیارەکە باسی تاقمی نەجمەت کرد، ئەو تاقمە کە سەتی بیست دەبوون نەجمە ئەکرەم- یان پێ دەوت، ئەکرەم عەبدولقادر یا موڵکی. بەڵام کەریم گیرا تا من چووم لە مانگی شەشا کەریمیان حەپس کردبوو، رێکخستنمان هەبوو لە سلێمانی ئەو رازی نەبوو، ئەکرەمیش رێکخستنێکی دیکەی دروستکردو بڵاوکراوەیەکی بەناوی الاتحاد دەرکرد، ئیتر جەماعەتی الاتحادیش ئاوا پەیدابوون.

*** دەتوانین بڵێین لەناو حزبی شیوعی دا هەردوو گرووپی نەجمەو الاتحاد سەرەتای باڵی گەرتبوون و ئینشیقاق بوونە لە حزبی شیوعی دا.**

- پێش ئەوانیش هەبوون.

*** کوا کێ بوون؟**

- داود فائق ئینشیقاقی کردووە، جەماعەتی وەحدەت ئەلینزال ئینشیقاقیان کرد، خەڵکی تریش ئینشیقاقیان کردووە، بەڵام لە دوای گرتنی فەهدو ئیعدامکردنی فەهد، ئەوە یەکەم ئینشیقاق بوو، نەجمە والاتحاد. دوای ئەوەش لەملاو ئەولای تریش شتێك پەیدا بوو، بەڵام یەکەم ئینشیقاق بوو لەم فەترەیا لە دوای ١٩٤٦وە لە سلێمانیشا پەیدا بوو، لە سلێمانیەوە سەری هەڵدا، ئینشیقاقی پێشتر لە سلێمانی نەبوو.

*** مامۆستا ئەگەر بێنەوە سەر مەسەلەی سالح حەیدەری و عەلی عەبدوڵلاو نافیع یونس و ئەوانە وەفدێکیان پێکهێنابوو، بۆ لای فەهد چوون، لەوێ داوایان کرد کە حزبێکی شیوعی کوردستانی دابمەزرێت لە هەولێریش، مەلا شەریف سەرکردایەتی ئەو حزبە کوردستانییە بکات کە گوزارشت لە رەشی کوردستانی بکاتەوە، واتە حزبێکی مارکسی کوردستانی بێت، بەڵام فەهد رازی نەبوو حزبێکی لەو جۆرە هەبێت و مەلا شەریف سەرکردایەتی ئەو حزبە شیوعییە کوردستانییە بکات، ئەو خەڵکەش سالح حەیدەری، عەلی عەبدوڵلا، نافع یونس ئەوا بچنە ناو ئەو گرووپە، پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی فەهد ئەو گرووپەی پێ ئیستیعاب نەدەکرا؟!**

- خۆی فیکرەی تەئیدی عام لەناو شیوعیەکانی جیهاندا بەتایبەتی ئەوانەی سەر بە لینین و ستالین بوون لەبرەودابوو، ئەوانەش سەی ٩٥ی شیوعیەکانی دونیا بوون. ئیتر بیرو بڕوایەکە هەر ئەوەبوو لە وڵاتێکدا نابێ لەیەك حزبی شیوعی زیاتر هەبێ، ئەوەی دووەم ئەگەر دروست ببێ ئەوا بێ هیچ ئەملاو ئەولایەك ئەوا لادەرە، تەبعەن ئێستا جیاوازە، دونیا دونیایەکی ترە، من باسی ئەو سەردەمە دەکەم کە عەقڵیەتی شیوعییەکانی دونیا وابوو، ئەوەش سەرچاوەکەی لە تەوجیهەکەی لینینەوە بوو، تەسقیفی هەموو شیوعییەکانی دونیای پێ کرابوو.

*** کە زۆر هەڵە بوو**

- نێ تەبعەن، دوای ئەوە ژیان گۆڕاو ئەم قسەیە بوو بە قسەیەکی پووچ.

*** مامۆستا ئەوانە، ئەو جەماعەتە چوون حزبی شۆڕشیان دروستکرد، پاش ماوەیەك بەشێکی زۆر لەوانەی کە حزبی شۆڕشیان دروستکرد چوونە ناو حزبی شیوعی، بەشەکەی تریش کە حزبی رزگاری بوو چوونە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان، مەبەستم ئەوەیە، چۆن وا رێککەوت ئەوانەی حزبی شۆڕشیان دروستکرد چوونە ناو حزبی شیوعی و ئەوانەش کە حزبی رزگاریان دروستکرد، چوونە ناو پارتی؟!**

- پرسیارەکەت زۆر دروستە، بەڵام سروشتیشە وایان لێ بێت، چونکە بەشێکیان جۆرێك لە فیکری نەتەوەیی بەسەریاندا زاڵ بوو، ئەوانە هەر لە حزبی شۆڕشدا بوون، واتە فیکری قەومیشیان هەبوو، فیکرەی مارکسیشیان هەبوو، واتە مارکسی- نەتەوەیی بوون، ئێستاش مارکسی نەتەوەیی هەر هەیە، واتە هەردووکیانە، کابرا مارکسیشەو نەتەوەییشە، ئەوانە مارکسی نەتەوەیی بوون، کە حزبی شۆڕشیان دروستکرد دوایی وردە وردە بەشێکیان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئەو فیکرەی لینین لە حزبێکی دیکەی شیوعی یا مارکسی دابێ، لەبەر

ئەوە ئەو گرووپە بڕیارياندا بچنە ناو حزبی شیوعی، تەبیعیی بوو، ئەمە من مەعلوماتم لەلا نییە، ئەوان وایان وتبێ، هینی خۆمە، بۆچوونی ئەوانی دیکەش کە لای قەومی بەسەریاندا زاڵ بوو، بەسەر بیرو بۆچوونەکاندا زاڵ بوو، چوون حزبی رزگارییان دروستکرد.

*** ئەو دوو حزبە، حزبی رزگاری و حزبی شۆڕش چ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە هەبوو، ئایا راستە دەڵێن عەلی عەبدوڵڵا سکرتێری حزبی رزگاری بوو، لەهەمانکاتدا ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شۆڕشیش بوو.**

-پێشتر پێشتر ئەمە ببوو

*** یانی لە دوو قۆناغی جودا جودابوو**

- ئا ئا پێشتر، دوای جیابوونەوەکەی هیچ پەیوەندییەکی نەما

*** من پرسیارەکەم ئەوەبوو لەیەك کاتدا سکرتێری حزبێك بێت و ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبەکەی تریش بێ؟**

- بەڵــێ کە چــووە ئەوێ ئیتر وردە وردە بە تەدریج ئەو ئیشــانە لە رۆژێکا نەبڕاوەتەوە، لەمــــاوەی چەند مانگێکا بڕیـــاری خۆی وەرگرتووە، واتە ئیســــتقراری خۆی وەرگرتووەو کۆتایی پێ هاتووە، واتە زۆر درێژەی نەبووە، لە یەك کاتدا دوو مەسئولیەتی گەورە لە دوو حزبدا.

*** ئێوە لە چلەکان تا حەفتاکانیش زۆر گرنگیتان بە پیتاك دەدا، ئابوونەتان کۆ دەکردەوە، واتە پیتاکتان کۆ دەکردەوە، ئەمە لە کاتێکدا حزبی شــیوعی سەر بە کامپی سۆسیالیستی بـــوو، دەوڵەتێکی عوزمای وەکو ســۆڤێت پشــتگیری دەکردن و یارمەتــی دەدان، ئێوە چ مەجبـــوری پیتاکی کوڕە کرێکارێك، کوڕە جوتیارێکی هــەژار بوون کە باری دارایی زۆر خراپ بوو، هیچی نەبوو؟**

- مساعەدە بکە، ئێمە خەرجیمان هەبوو، ئێمە حزبێك بووین کادیری پیشەیی (معترف)مان هەبوو، حزبێك بووین ماڵی حزبیمان هەبوو، چاپکردن و ئەدەواتی چاپ و رۆژنامەو بڵاوکراوەو ئەوانەمان هەبوو، ئەوانە ئەگەر بە حیسابی ئێمە بوایە پارەیەکی زۆری تێدەچوو.

*** ئەوە راســـتە، بەڵام ئێوە لەلایەن دەوڵەتێکی گەورەی وەکو سۆڤێت پشتگیری دەکران و یارمەتی دەدران؟**

- من چوار ســـاڵی خۆم باس دەکەم کە ســـکرتێری حزبی شـــیوعی عێراق بووم لە هیچ کەســـێکی دونیا، لە هیچ دەوڵەتێك، لە هیچ حزب و هیچ لایەنێك یەك فلسم وەرنەگرتووە، وەك یارمەتی بۆ حزبی شیوعی عێراق.

*** یانی لە ١٩٤٩ تا ١٩٥٣؟**

- بەڵێ لە ١٩٤٩ تا ١٩٥١لەســـەر ئەو پوولە پوولـــەی ئابوونەو پیتاك کۆکردنەوە کاری حزبیم هەڵدەسوڕاند.

*** باشە مامۆستا لەو فەترەیەی کە تۆ سکرتێر بووی، پەیوەندیتان لەگەڵ سۆڤیێتی ئەوکاتە نەبوو؟!**

- پەیوەندیی ڕێکخستنمان نەبوو، هیچ نەبوو، تەنها پەیوەندیی ڕۆحیمان هەبوو، هەر لە دوورەوە دەروێشی ئەوان بووین.

*** بێ ئەوەی ئەوانیش ئاگادارین؟ دڵدارییەکە یەك لایەنە بووە!!**

- بەگشتی ئەیانزانی حزبی شیوعی لە عێراقدا هەیە.

*** بەڵام کۆبوونەوەتان لەگەڵ یەکتری نەدەکرد، گفتوگۆتان لە نێواندا نەبوو؟**

- نەءەڵلا، نەبوو، ئەو چوار ساڵە باس دەکەم کە سکرتێر بووم، هیچ پەیوەندییەکمان نەبووە.

*** باشە لەبەرچی نەبوو؟**

- وەڵڵاهی ئێمە ســـەرقاڵی ئیشـــی خۆمان بووین، یا ئەم پەیوەندییەی تۆ باســـی دەکەی ئێمە بەشتێکی زۆر گرنگ و موهیممان نەئەزانی، ڕۆحیەن پەیوەندیمان هەبوو، ڕۆحیەن ئێمە دەروێشـــی سەرکردایەتیی ســـۆڤیێتی بووین، بەڵام لەڕووی عەمەلییەوە هیچ جـــۆرە پەیوەندییەکمان نەبوو، هیچ جۆرە تەوجیهێکمان وەرنەگرتووە، هیچ جۆرە یارمەتییەکی ماددیمان وەرنەگرتووە.

*** کادیرەکانیشتان نەدەنارده سۆڤێت بۆ دەورات و شتی وا؟**

- نەوەڵڵا

*** ئەوەش نەبوو؟**

- نەءەڵلا کەسمان نەئەنارد، ئەوە یەك لە ئەسبابی قوەتی حزبەکە بوو کە بەتەواوی لە ئیشی سیاسیی خۆماندا سەربەخۆ (مستقل) بووین.

*** هەر خۆشت بڕوات پێ نەبوو پەیوەندی دروستکەی لەگەڵ سۆڤێت؟!**

- وەڵڵاهی مەســـەلەکە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە لەو وەخت و سەردەمە ئێمە ٢٤ سەعات موعـــەرەز بووین بۆ گرتن و تێهەڵدان، پۆلیس بەدوامانا دەگەڕا، فریای پەیوەندی و کادیـــر ناردنە دەرەوە نەدەکەوتین، لەلایەك ئیعترافات و لەلایەکی دیکە زەربە لە دوای زەربە بە حزبی شیوعی ئەکەوت، لە ڕاستیدا ئەسڵەن حاڵمان حاڵ نەبوو، دوای ئەوەی

وەزعمان باشتر بوو، رەنگ بوو ئەگەر بهاتایە پێشەوە ئەو شتەمان بکردایە، بەڵام دیارە ئێمەش بە شوێنیان نەگەڕاین.

***لە نیسانی ١٩٥٣گیرای، دوای تۆ کێ کرا بە سکرتێر، چۆن کرایێ؟!**

- دوای گرتنی من کەریم ئەحمەد کە یەك لە سـەرکردایەتی حزبی شیوعی بوو، کرا بە سکرتێر، من لە سجنەوە کاغەزێکم بۆ نووسی، پۆلیسێکم کەسب کرد لە ئەمنی عامە، بە شـەو پاسەوان بوو لەسەرم، دوو پۆلیس یەکێکیانم کەسب کردو لێی ئەمین بووم، کاغەزێکم نووسی و ناونیشان و ئەدرەسم دایە، لەو کاغەزەدا داوام کردبوو کەریم ئەحمەد بەشێوەیەکی کاتی ببێتە سکرتێر.

*** بەشێوەیەکی کاتی ببیتێ؟!**

- مەبەسـتم ئەوەیە داوام کرد جارێ یەکێك دابنێن بۆ سـکرتێری تا وەزعەکە باش دەبێتەوە.

*** واتە کەریم ئەحمەد لەسـەر پێشنیاری بەڕێزت بوو بە سکرتێری حزبی شیوعی عێراق؟!**

-بەڵێ پێشـنیار، یا داوای من بوو، ئەوانی تریش رەنگە لەو باشـتر نەبوون، لەو رۆژانە سەلیم چەلەبی کە ئامۆزای ئەو ئەحمەد چەلەبیەیە، سادق فەللاح بوو، ناسر عەبود بوو، ئەوانە بوون.

*** ئەی لە کوردەکان؟!**

- لە کورد بەس کاکەی فەللاح هەبوو، کەریم ئەحمەدو من بووین، لە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی سێ کەس بووین، ئەو سەرکردایەتیەش هەر من دروستمکردبوو.

*** حەمید عوسـمان لـە حوزەیرانی ١٩٤٩ گیرا، زیندانی کـرا، زۆرجار باس لە هەڵوێسـتی ئەو لە سجن دەکەن، بەراستی هەڵوێستی حەمید عوسمان لە سجن چۆن بوو؟!**

- وەکو تۆ زۆر کەس باسـدەکەن، وەك تۆ منیش بیسـتوومە، من لە سـجنا بووم دوو پۆلیس بە شـەو ئەهاتن لەناو ژوورەکەمان دائەنیشـتن، تا بەیانی حەرەس بوون، مفەوەزێـك لەبەر دەرگاکە بوو لـە تەحقیقاتی جینائی لە ئەمنـی عام، یەکێ لە پۆلیسـەکان دەیگوت لەسەرچی گیراوی، وتم لەسەر شیوعی، وتی قسەت نەکردووە لەسـەر برادەران، وتم جا عەیب نییە پیاو خۆی بە ئیختیاری خۆی هاتۆتە ئیشەکەوە لـە دوایی خیانەت لە برادەرانی خۆی بکات، بە تەنیا بـوو، رەفیقەکەی نەهاتبوو،

هەڵسا لەوێوە ناوچاوانی ماچ کردم، خەڵکی عەمارە بوو، لە فەلاحەکانی عەمارە بوو، جاسمی ناو بوو، ئیتر لەوێوە کەوتینە عەلاقەیەکی باش لەگەڵ جاسم، دوایی بوو بە شیوعی، ئەو کابرایە وتی باسی حەمید عوسمانت بۆ دەکەم لێرە زۆریان ئازارداوە، بەڵام هیچ قسەی نەکردووە.

*** هیچ قسەی نەکرد؟**

- ئاوای وت، ئەو شایەدیەی جاسم لایە بۆ حەمید عوسمان و بیستووشمە کە حەمید عوسمان ئیعترافاتی کردووەو رووخاوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی وردم نییە.

*** تا ئێستاش هیچ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نییە کە ئەو ئیعترافی کردبێ؟**

- تا ئێستا بە شوێنیا نەگەڕاوم.

*** دوای ئەوەی ئێوە لە حزب مانەوە، لەگەڵ حەمید چۆن بووی؟!**

- حەمید خۆی کوتلەیەك بوو لە تەناقوزات، زیرەك بوو، وریا بوو، لە هەمانکاتدا شێتێك بوو بۆ خۆی، یانی جۆرە شێتێك بوو.

*** بەڵام قسەیەکی تریش دەکرێ گوایا پەیوەندی نێوان بەهادین نوری و حەمید عوسمان هەمیشە ناکۆك بووە؟**

- نەوەڵلا وا نییە کە حەمید مەسئول بوو من لە سلێمانی نەمدەناسی، ئەوەندەم نەزانی مەسئولی حزبییە، ناویم نەزانی لەم فەترانە نەمئەزانی، خەڵکی کوێیە، ناوی چییە، ئێمەش لە ناو حزبی شیوعیا ئەو شتانەمان نەبوو، ئەو وەختە ئەوەی بۆی نەگەڕاین حزبی بێ و شیوعی بێ و بەس، ئەوە هەموو شتێك بوو بۆ ئێمە، لە دواییدا ئەو داوای کرد کە من بچم بۆ بەغداو ببمە مەسئول و مەسئولیەت وەربگرم.

*** ئەوە سەرەتا بوو، بەس دوایی کە یەکترتان ناسی؟!**

- ئاخر با عەرزت بکەم، باسی دواییت بۆ ئەکەم، لەسەر داوای ئەو چووم بۆ بەغا، مانای وایە ئەو باوەڕی بەمن هەبوو.

*** واتا تۆ لەسەر داوای حەمید عوسمان بووی بە سکرتێری حزب؟**

- بەڵێ لەسەر داوای حەمید چوومە بەغاو بووم بە سکرتێر، ئەشبوو ببم، چونکە کەس نەبوو لە من باشتر، حەمید عوسمان خۆی گیرابوو، منیش پەیوەندییەکم لەگەڵی هەبوو، دیفاعم لێی دەکرد، دیفاعەکە لەو روانگەیە بوو کە قارەمانێکی حزبی شیوعی یەو، دواتر لە سجن رایکرد، لە سجنی بەعقوبە بوو، سێ چوار کەس بوون تەکبیریان کردبوو، کە ئەو رایکرد من لە سجنا بووم، کەریم ئەحمەد ئەو وەختە سکرتێری

حزبی شـــیوعی بوو، یەکەم مەســـئول بوو، بەڵام کەریم ئەحمەد ئەو مەسئولییەتەی کە ســـکرتێری حزب بوو، بە ئارەزووی خۆی و بە داوای خۆی پێشـــکەش بە حەمید عوســـمان کردەوەو وتی تۆ شایستەی ئەو جێیەی، ئیتر حەمید عوسمان جارێکی دی کرایەوە بە سکرتێر.

*** یانـــی کەریـــم ئەحمەد بەخۆی گوتی تۆ وەرە ببەوە بە ســـکرتێر، دوای ئەوەی حەمید عوسمان لە سجن دەرچوو؟**

- حەمید عوســـمان رایکرد دەرنەچوو. بەڵێ کەریم ئەحمەد خۆی داوایکرد، ئەوەشت پێبڵێم کە من چوومە ســـجنەوە، حەمید عوســـمان لەوێ بەرپرسی رێکخستنی حزبی شیوعی بوو لە گرتووخانەکە، لەوێ جمهوریەتێکی لەناو سجن دروستکردبوو، تاخمێك بەرمیلیان کڕیبوو، پارچە پارچەیان کردبوو، کردبوویان بە شمشێرو خەڵکی پێ چەکدار کردبوو، جمهوریەتی شـــەعبی لە نوگرە سەلمان، لەو قەڵایە دروستکرد بوو، دواتر کە من چووم ئەو جمهورییەتەم تێکوپێکداو نەمهێشت چی تر خوێنی خەڵك بڕژێ، حەمید عوسمان لەوە لەمن توڕەبوو، بەڵام هەموو گرتووخانەکە پشتگیریان کردم تەنها حەمید نەبێ.

*** حەمید عوسمان لە ئیشکردنیا تاکڕەو بوو؟!**

- لە تاکڕەویش زیاتر، من ئەڵێم شـــێت بوو، پیاوێکی وریا، زیرەك، جیدی و ئازابوو، بەڵام شێتیش بوو، لە ناو خەڵکی وادا هی شێتیشی لێ هەڵدەکەوێ.

*** موسەقەفیش بوو؟**

- بای خۆی، ئا.

*** باشـــە حەمید عوسمان ئەوها توندبوو، ئەوها ئەو مارکسییە بوو، کە لە سجنیش هەڵات کرایەوە بە ســـکرتێری حزبی شـــیوعی، ئەی چۆن بوو، دواتر چووە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان؟**

- زۆر تەبیعییـــە، ئەو کەســـانە ئاوا هاتن هەر ئاواش بە ئاســـانی بائەدەنەوە، ئەوە تەبیعییە.

*** ئەگەر تیشك بخەیتەسەر جیابوونەوەکەی عزیز الحاج؟**

- با ئەوەشـــت پێبڵێم کە حەمید عوســـمان لە گرتووخانەی بەعقوبە هەڵات، کەریم ئەحمەد یەکسەر وتبووی ئیتر تۆ سکرتێری حزبی، من پێشکەش بە تۆم کردەوە، عزیز الحاج لە نوگرە لەگەڵمان لە حەپسخانە بوو، قسەی لەسەر هەبوو کە هەڵوێستی لاوازە،

راستیش وابوو کە چووینە بەعقوبە، یانی گواسترایینەوە بۆ بەعقوبە لەویَ لە ئینفرادیا بووین، ئیتر عزیز تەواو رووخا، کەلەپچەمان لە دەست بوو، ئەلقەی زنجیرو. چوزانم لە قاچمان بوو، وەزعمان ناخۆش بوو، نەمانئەتوانی قاچمان بهاوێین دەتوت خەتەنەکراوین، هەمـــوو کەس خۆی نەدەگرت، ئیتـــر عزیز رووخا، خۆی پێنەگیرا،ماینەوە تا ١٩٥٨ لەگەڵ لێبووردنە گشـــتییەکە دەرچووین، ســـلام عادل لە ١٩٦٠ عەزیزی پاڵاوت بۆ کۆمیتەی ناوەندی، من بەتوندی دژی وەســـتام، وتم عزیز ترسنۆك بوو لە سجن لاواز بوو،...هتد بەڵام سەلام عادل هەر پاڵاوتی و ئیتر بوو بە ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی، دوای ئەوە نێردرا بۆ دەرەوەو لە (قچایا الســـلم و الاشـــتراکیە) لە پراگ لە ساڵانی ١٩٦٠-١٩٦١ کاری دەکرد، بەڵام لە ساڵانی ١٩٦٦-١٩٦٧ لە دەرەوە گەڕایەوە وڵات ئەمجارەیان خەتای عەزیز محەمەد بوو چونکە هێنایە مەکتەبی سیاســـی، لە کاتێکدا عەزیز محەمەد ئاگاداری هەموو هەڵوێستە لاوازەکانی عزیز الحاجیش بوو.

*** ئەی عەزیز محەمەد بۆ وایکرد، بەرژەوەندی چی بوو لەو کارەی؟**

- ئەیوت عزیز الحاج نووســـەرە، لە بنەڕەتیشـــدا کابرا خۆی ماستاوچییەکی باش بوو، خێرا خۆی لە بەرپرسی یەکەم نزیك دەکردەوەو توانای نووسینیشی هەبوو، تا دواتر ئینشقاقی کردوو بوو بە یەکەمین ئینشیقاقەکە.

*** ســـەبارەت بە فەهد، ئەوەندەی ئاگاداری بوویی، ئاستی رۆشنبیری و سیاسی چۆن بوو؟**

- ئینتیباعێکی زۆر باشـــم هەیە لەسەر فەهد، پیاوێکی رۆشنبیر بوو تێکۆشەرێکی نـــەزەری و عەمەلیش بـــووە، هەرچەندە لەگەڵی دانەنیشـــتوومە، بـــەڵام لە میانی نووسینەکانی ئەو ئینتیباعەم دروست بوو.

*** بەڵام مەرج نییە نووسین و کردەوە یەك بن، زۆر کەس هەیە گوفتاری پێچەوانەی کردارییەتی؟**

- بەنیسبەت زەمانی خۆی، (فەهد) سەرکردەیەکی بە تواناو لێهاتووبوو.

*** ئەی لە بەڕێوەبردنی ململانێ (إدارە الصراع) چۆن بوو؟**

- بێشك ستالینی بوو، بەڵام لە ستالینە باشەکان، نەرمەکان، نەك توندەکان.

*** بەڵام ستالینییەت نەرمیی تێدا نییە؟**

- کاك فوئاد هەموو شـــتێك بە نسبی وەربگرە، هەموو شتێك نسبییە، ستالینیزمیش نسبییە، پێچەوانەکەشی هەر نسبییە.

*** راســـتە لە دوای راپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ کە یەکێتی گشـــتیی قوتابیان دامەزرا، تۆ حەمدی ئەیوبت دانا بۆ سکرتێری؟**

- بەڵێ وابوو.

*** لە ئازاری ١٩٥٣ تاقمی ئاڵای کارگەران (رایە الشغیلە) لە حزبی شیوعی جیابوونـــەوە، ئەو تاقمە بڕوایان بە رووخانی پاشـــایەتی نەبـــوو، لەبەرچی دژی رووخانی پاشـــایەتی بوون و لەگەڵ هێنانە ســـەرکاری حکومەتێکی دیموکراسی نەبوون؟**

- راســـتدەکەی، جەماعەتی ئاڵای کارگەران رووخانی رژێمی پاشـــایەتیان بە توندڕەوی چەپڕەوییان دادەنا واتە (التطرف الیساری).

*** چۆن، یانی؟**

- ئەیانووت ئەمە هەڵەیە یەسارییەتە.

*** یانی دەرەبەگایەتی یەسارییەتە؟**

- لەســـەر مەســـەلەی بەرزکردنەوەی شـــیعاری کۆماری میللـــی و رووخانی پادشـــایەتی و ئەو شـــتانە ناڕازی بوون، پیاوێکیان لەگەڵدابوو، ســـجن بوو ناوی (ئیبراهیم شائول)بوو نەختێك لەشـــت تێئەگەیشت، بەڵام عەزیز محەمەد ئەوکاتە هێشتا خام بوو پێنەگەیشتبوو، سادەبوو، ئیتر ئەو و جەمال حەیدەری و ئەوانە هێشتا لە فایلی نەزەری نەدەگەیشتن، بەڵام ئیبراهیم شائول وابزانم رۆڵی سەرەکی هەبوو لە نەخشەی ئەو فیکرەی ئینشیقاقەکە، بەڵام هەموویان شائول و عەزیز محەمەدو جەمال حەیدەری و...هتد مەیلێکی راسترەویشیان تێدا هەبوو.

*** راستە جەمال حەیدەری لێپرساوی یەکەمی ئەو رێکخراوە مونشەقە بوو؟**

- شـــکلیەن عەزیز محەمەد بوو، بەڵام عەمەلیـــەن لەرووی فیکرییەوە ئیبراهیم شائول بوو. جەمال حەیدەری توند بوو، فیکرییەن لەگەڵ عەزیز محەمەد نەدەگونجا، توندڕەوو چەپڕەو بوو.

*** ئەدی عەزیز محەمەد ئەو کاتە گەنج بوو توندڕەو نەبوو؟**

- نەخێر عەزیز محەمەد قەت توندڕەو نەبووە، نە لەو ســـەردەم و نە دواییش، من عەزیز محەمەدم لەســـجن بە رێگای نامە گۆڕینەوە ناســـی، بەڵام جەمال کە لە زیندان رایکردو چووە دەرەوە، بوو بە سەرکردەی مەیدانی و قسەی جەمال دەیخواردو حساب بۆ قسەی جەمال دەکرا.

*** قسەی عەزیز نەیدەخوارد؟**

- عەزیز محەمەد لە زیندان بوو ئەوکات.

*** دەڵێن ڕێکخستنی نەجەف هەمووی لەگەڵ ئەوان بوون؟**

- هەمووی نا، بەڵام بەشی زۆری لەگەڵ ئەوان بوون، نزیکەی ۸۰٪ی ڕێکخستنەکانی نەجەف لەگەڵ جەمال بوون.

*** جەمال ئەو کاریگەرییەی چۆن لەسەر نەجەف هەبوو؟**

- لێپرسـراوی نەجەف پێش ئینشـقاقەکە لە زیندان دەچووە لایـان، چونکە ئەوان ئینشیقاقەکەیان لە زیندان پێکەیاندبوو..

*** تۆ لە سـاڵی ۱۹۵۲ ئافرەتێکی جوولەکە بەناوی (ماردین میلی)ت خواست و بوو بە هاوسـەرت، ئایا لەو کۆمەڵگە دواکەوتـووەی کوردی، بەتایبەت لای خزم و کەسەکانت گرفتی بۆ دروست نەکردی کە ئافرەتێکی جوولەکە هاوسەرتە؟**

- ئەو کادیری حزبی بوو، لە بەغا بەیەکەوە بووین، لە کاری حزبی ناسیم، بەنیسبەت خزمانیشم لە ئەسڵدا ئێمە عەشیرەتگەر نین، دانیشتووی گوندێکین، ئێمە نە جاف و نە هەرکی و نە شتی واین، دواتریش کە من بووم بە شیوعی، بە دابونەریتی شیوعییانە بیـرم کردۆتەوە قەت بیرم لەوە نەکردۆتەوە ئـەوە عەرەبە، یا جوولەکەیە، یا ئینگلیزە. مرۆڤ هەمووی مرۆڤە، ئێستاش هەروا بیردەکەمەوە.

*** سەبارەت بە باوك و خزمە زۆر نزیکەکانت، چۆن ئیستیعابیان کرد؟**

- جـا ئەوانە هـەر ئاگایان لە ژنهێنانەکەم نەبوو، من لـە بەغدا موختەفی بووم، ئەوانم جێهێشتبوو، تا گیرام ئاگایان لەمن نەبوو، یەکجار لە (پەنجا- ۱۹۵۰) هاتمەوە سلێمانی.

*** دوای ئەوەی گیرایت و ئینجا بەربووی و زانیشـیان ژنێکی جوولەکەت هێناوە رایان خراپ نەبوو لەسەرت؟**

- نەء هیچیان، رەنگە لە دڵی خۆیاندا تێبینی شـتێکیان هەبووبێ، بەڵام هیچیان بە من نەوت.

*** تــۆ پێتوانییە حزبی شـیوعی تا چواردەی تەمـموزی ١٩٥٨ رووحێکی زۆر شۆڕشـگێڕانەی هەبووە، سـەرکردایەتی دەیان راپەڕین و خۆپیشاندانی کردووە بەڵام دوای ئەم مێژووە رووحی شۆڕشگێڕی تێدا کوژێنراوەتەوەو وردە وردە ساردو سڕ بۆتەوە تا دەگاتە ئەمڕۆش؟**

- نــەء، دوای ١٩٥٨ ئەو رووحیەتە شۆڕشـگێڕییە زیادیکرد، لە ١٩٥٩ گەورەترین خۆپیشـاندانی کرد لە بەغدا کە ئەوکات هەموو دانیشـتوانی بەغدا یەك ملیۆن کەس نەدەبوو، کەچی خۆپیشـاندانەکەی حزبی شـیوعی یەك ملیـۆن کەس بوو، خەڵك لە شـارەکانی دی هاتبوون بۆ بەغدا تا بەشداری لە خۆپیشاندان بکەن بەڵام لە (١٩٦١) بەدواوە وردە وردە دابەزی و کەوتە لێژی.

*** ئەی لە ١٩٥٨ کە دەسەڵاتی وەرنەگرت؟**

- راسـت دەکەی بەڵام کتوپـڕ ئەنجامەکەی نەدا، لە (١٩٥٩) بـەدواوە وردە وردە ئەنجامەکەی هەسـت پێدەکرا، لە سـاڵی ١٩٥٩ دوای ئەو خۆپیشـاندانە جەماوەرییە گەورەیە کە لەو خۆپیشـاندانە خەڵك داوای دەسەڵات گرتنەدەستی دەکرد، خەریك بوو هەندێك لە سـەرکردایەتی حزبیش فیکریان بەلای دەسـەڵات گرتنەدەستەکەدا چوو، تەنانەت سـەلام عادلیش رای لەگەڵ رای جەماوەرەکە بوو، ئەوەبوو من تەکلیف کرام بە وتاری رۆژانە پاسـاوی تیۆری و فیکری بۆ ئەو مەسەلەی دەسەڵات گرتنەدەستە بهێنمەوە، ئەوەبوو (٣) ئەلقەم بەناوی بۆچی ئەبێ حزبی شـیوعی بەشداری بکات لە حکومەت، ئەو وتارانەم لە ئایاری ١٩٥٩ نووسـی، کۆنترۆڵی ئیشمان کردبوو، کەوتینە کۆنفراسـاتی حیزبی، گەرم بووین، لەپڕ هەواڵێکمان بۆ هـات وتیان فەرمانبەرێکی سـەفاراتی سۆڤێتی هاتووە (ئەمجارە پەیوەندیمان لەگەڵ سۆڤێت هەبوو، وەکو ساڵانی ١٩٤٩-١٩٥٣نەبوو)، ئیتر ئەو فەرمانبەرە هات لەگەڵ من و زەکی خەیری دانیشت.

*** زەکی خەیریش لەگەڵ هەڵوێستی تۆ دابوو؟**

- بەڵێ، سـەلام عادلیش لەگەڵ ئێمە هاوڕابوو، زۆربەی هەرە زۆرمان هاوڕابووین، ئەمانویست ئەمجارە دەسەڵات بگرینە دەست، بەتایبەتی سەلام عادل، جەمال حەیدەری زەکی خەیری، ئەبو لعیس و من.

*** ئێ، کە ئەو فەرمانبەرەی سەفارەتی سۆڤێتییە داوای کرد بتانبینێ؟**

- من و زەکی چووین بۆ لای، خۆی داوای ئەو دوو کەسـە (من و زەکی) کرابوو. وتی ئەم نامەیە لە سـەرکردایەتی حزبی شـیوعی سۆڤێتی بۆ حیزبی شیوعی عێراق

هاتـــووه، بۆی خوێندینەوه، نامەکە گوێ راکێشـــان بوو، نەڵێ عەبدولکەریم قاســـم رووبەڕووی ئیســـتعمار بۆتەوه، ئیستعمار موئامەرەی لە دژی دەکات، ئەیەوێ قاسم برووخێنێ، نابێ ئێوەش بیترســـێنن، نابێ داوای دەســـەڵات گرتنەدەستی لێ بکەن و لاوازی بکەن.

*** کاغەزەکە ئیمزای لەسەر بوو؟ بە ئیمزای کێ بوو؟**

- بە ئیمزای کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤێتی، مەکتەبی سیاسی، ئێمەش دەروێش بووین، گەڕاینەوە مەکتەبی سیاسی، کۆبووینەوەو لەسەری رێککەوتین.

*** ئەوە لە ١٩٥٩ بوو، ئەی لە ١٩٥٨ بۆ دەسەڵاتەکەتان وەرنەگرت؟**

- لە ١٩٥٨نەمانئەتوانی.

*** پێشتر پرسیاری حەمید عوســـمانم لێکردی وەڵامت نەدامەوە، بۆچی لە حزبی شیوعی توڕەبوو، چووە ناو پارتی؟**

- پێموایە باســـمکرد، حەمید عوسمان لەو کەسانە بوو، وریا بوو، زیرەك بوو شێتیش بوو. هەروەها قەبووڵی نەدەکرد کەس لەســـەرووی خۆی بێت. لێپرســـراوبوو لە ساڵی (١٩٥٤)دا بەشداریکرد لە هەڵبژاردنی عێراقی ئەوسا، نامەیەکی بڵاوکردەوە بەناوی حەمید عوســـمان، برادەرانی دی لێی رازی نەبوون وەك ســـەلام عادل و ناسر عەبودو ئەوانـــەی لەگەڵیدا بوون و ئیتر لێپێچینەوەیـــان لەگەڵ کردو گرتیان و پێیان وت تۆ دەست نادەی بۆ سکرتێری و هەڵبژاردنیان کرد، لە کۆمیتەی ناوەندی لایانداو لەجێی ئەو (سەلام عادل)یان هەڵبژارد.

*** کەوابێ حەمید عوسمان لە حزب دوورخرایەوە؟**

- بەڵێ لە ســـکرتارییەت هێنایانە خوارەوە، بۆیە رایکـــردو چووە بەغداو تا دوایی گەیشتە مەکتەبی سیاسی پارتی.

*** دۆستایەتی تۆ لەگەڵ حەمید عوسمان چۆن بوو؟**

- من ســـێ جار حەمید عوســـمانم دیتووە، جارێك دیم مەسئولی ئێمە بوو، یانی ســـکرتێری لیژنەی مەحەلی ســـلێمانی بوو، جاری دووەم دیتم سەرۆکی ئەو کۆمارە بوو کە لە ســـجن بۆ خۆی دروســـتی کردبوو، جاری ســـێیەمیش بە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردســـتان هاتە سەردانمان بینیم. جاری چوارەمیش رۆژنامەی خەباتی دەردەکرد لە دێی لێوژە لە ساڵی (١٩٦٦) وا بزانم نوێنەری شەخسی بارزانی بوو من ئەوەندە جارە حەمید عوسمانم دیتووە.

*** گۆرانی شاعیر لەسەر حزبی شیوعی گیرا، کەچی لە زیندان ئەندامێتییەکەی لێ سەنرایەوە، ئەوە راستیەکەی چۆن بوو؟**

- ئەوە توندوتیژی و بێ عەقڵی هەندێ برادەری مەسئول بوو..

*** کێ بوون ئەوانەی بەربەرەکانێی (گۆران)یان دەکرد؟**

- مـن کە لە زیندان هاتمە دەرەوە، سـەلام عادل پێشـوازی لێکردم و گۆرانیش لەگەڵمـان بـوو، کە لە بەعقوبـە دەچووین بۆ بەغدا، لەگەڵ سـەلام عادل لەناو ئۆتۆمبێل دانیشـتبووین، گوتم ئەو پیاوە شـاعیرە بەناهەق ئەندامێتییەکەیان لێی سـەندۆتەوە لەسەر شـتی بێ مانا، ئەویش (سەلام عادل) گوتی تەبلیغی بکە من وەکو سـکرتێر دەڵێم ئەوە لای ئێمە ئەندامەو ئەو بڕیارە مەرفوزە، منیش بە گۆرانم گوت.

*** ئەگەر بزانی بڕیارەکە کێ دابووی؟**

- رێکخسـتنی زیندان، یەکێکیان وابزانم مەهدی حەمید بوو کە لە ساڵی ١٩٦٣ شەهیدیان کرد.

*** پاسـاوی ئەو برادەرانـە چی بوو، بۆ ئەوەی ئەندامێتی لە گۆرانی شـاعیر بسەننەوە؟**

- وەڵڵاهی، مەسائیلی ئەخلاقیان کردبووە بیانوو، کە شتێکی بێ مانا بوو

*** جا لە بنەڕەتدا ئەو مەسائیلە ئەخلاقیە هەبوو؟**

- نەبوو، گریمان شتێکی بچووکیش هەبوو، شتێکی بچووك بچووك.

*** ئەخلاقیەکە لەکاتی زیندانیکردنی بوو، یان پێش زیندانیکردنی؟**

- لەکاتی زیندان، لە زیندانا کەبتی جنسی هەیە، بۆی هەیە هەندێ جار هەندێ کەس دەست بۆ کوڕێك ببات، لە زیندانێك کە هەموو گەنجن و بێبەشکراون لە جنس و ئەوانە، ئیتر لەسـەر شتێکی بێ مانای ئاوەها ئەو بڕیارە درابوو، من بە بڕیارەکە رازینەبووم.

*** تۆ لە زیندانا سکرتێری رێکخستنی ناو زیندان بووی؟**

- نەخێر من لە هەموو لێپرسراویەتییەك تەجمید کرابووم.

*** مرۆڤ که سەیری مێژووی حیزبی شیوعی دەکات زۆر سەیر دێتە بەرچاوی. ساڵی ١٩٥٨ سەلام عادل سکرتێری حزبی شیوعی بووەو جەمال حەیدەری و عامر عەبدوڵلاو ئەوانە لە (١٩٥٨) ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بوون، کەچی عامر عەبدوڵلا لە (١٩٥٣) تەنها دۆستی حزبی شیوعی بووەو ئەندامیش نەبووە، تەدی باشە لە (٥٣ تا٥٨) کە تەنها پێنج ساڵە چۆن گەیشتە مەکتەبی سیاسیی؟**

- عامر شایستەی مەکتەبی سیاسیی نەبوو، بەڵام کە سەلام عادل لە زیندان هاتە دەرەوە، سەلام عادل لە توێژێکی رۆشنبیر بوو هەرچەندە مامۆستای قوتابخانە بوو، بەڵام ئەزموونی عەمەلی پێش ئەوکاتە دەوڵەمەند نەبوو، عامریش یەکێك بوو لەو کەسانەی قسەزان و (لەبلەبان) بوو، کاریگەری لەسەر سەلام عادل دروستکردبوو، ئێمەش وشکبووین، خۆم زۆر وشکبووم بەتایبەتی لە مەسەلەی ئەندام بەخشین و وەرگرتن.

*** جگە لە عامر، خۆ جەمال حەیدەریش تا ١٩٥٦ ئاڵای کارگەران (رایە الشغیلە) بوو؟!**

- بەڵام کادیربوو، وەك کادیرێکی حزبی شیوعی وابوو، لێپرسراوی یەکەم بوو لە ئاڵای کارگەران ئەوە جیایە، بەڵام بەیانی دوو رێکخستن یەکتریگرن یان رێکخستنێك بێتە ناو پارتی، یان یەکێتی، ئەوانەی هەندێك بەتوانان جێگایان هەیەو دەگەنە سەرکردایەتی. نموونەش زۆرە.

*** با بێینە سەر عەزیز محەمەد، لە ساڵی (١٩٥٩) کرا بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی لە حزبی شیوعی، کۆمیتەی ناوەندی دەنگی بۆدا، ئایا پێشتر لە کۆمیتەی ناوەندی بوو تا ببێت بە مەکتەبی سیاسیی؟**

- کە من لە زیندان دەرچووم مەکتەبی سیاسیی بریتی بوو لە سەلام عادل و جەمال حەیدەری و عامر عەبدوڵلاو منیش یەکسەر خرامە مەکتەبی سیاسیی، واتە چوارەم بووم لە ساڵی (١٩٥٨)، عەزیز محەمەد لە (١٩٥٩) لە لیژنەی مەرکەزی دەستنیشانکرا بۆ مەکتەبی سیاسیی.

*** پێشنیارەکە هی کێ بوو؟**

- نایەتە بیرم بە باشی.

*** ئەدی بـــۆ ئەوکات کەریم ئەحمەدتان هەڵنەبژارد بۆ مەکتەبی سیاســـی، چونکە ئەو پێشتر سکرتێری حزب بوو....**

- کەریم ئەحمەد تواناى عەزیز محەمەدی نەبووە، ئەوســـاو ئێستاش لە هەموو بوارێکدا، عەزیز لە رووی تیۆری و عەمەلییشـــەوە لە کەریم ئەحمەد بەتواناترە، هەروەها لە رووی سیاســـەتکردن و دیپلۆماسیەت و عیلاقات و ئیدارەش هەر لە کەریم بەتواناترە، کەریم لە رووی تیۆرییەوە لاوازە بەقەد عەزیز لە شـــت ناگات، خاوەنی راوبۆچوون نییە..

*** بەڵام هەســـت ناکەی هەڵوێســـتی ئیزدواجی لە کەریم ئەحمەد دانییەو لە تێکۆشان راستگۆترە؟**

- ئەو مەســـەلەیەکی دیکەیە، بەڵام لە تواناد‌ا عەزیز لە کەریم بەتواناترە جیاوازییەکی دیـــارو بەرچاویش لەنێوانیاندا هەیە، بۆیە عەزیز محەمەد هەڵبژێردراو کەریم ئەحمەدیش نارازی بوو، ئیستقالەی پێشکەشکرد.

*** دەڵێن سەلام عادل، کەریم ئەحمەدی لە ئیستقالەدانەکەی پەشیمانکردەوە؟!**

- بەڵێ دوای (٣) رۆژ پەشیمانی کردەوە، کە سەلام عادل زانی کەریم ئەحمەد دەستی لەکارکێشاوەتەوە.

*** ئێوە وەك چەند کەســـێك یان وەك مەکتەبی سیاســـی بوو داواتان کرد سەلام عادل دەست لە سکرتێری حزبی شیوعی هەڵبگرێت، ئەوکاتە هەڵوێستی کەریم ئەحمەد، عەزیز محەمەد چۆن بوو؟**

- کەریم زۆر زۆر لەگەڵ سەلام عادل بوو، پێموایە عەزیزیش هەر لەگەڵ سەلام عادلدا بوو، بەڵام بەشێوەیەکی دیپلۆماسی، واتە عەزیز خۆی نەدەکردە تەرەفی زەق.

*** ژیانت لەگەڵ هاوسەری یەکەمت چۆن کۆتایی هات؟**

- یەك ســـاڵ بەیەکەوە ژیانمان بردەسەر، پاشان مانگێك لە پێش من ئەو گیرا، من لە نوگرە سەلمان و ئەویش لە زیندانی ژنان، پاش ماوەیەك وەك ژن و مێردێك نامە گۆڕینەوە کەوتـــە نێوانمان، ئەو (١٠) ســـاڵ زیندانی و منیش موئەبـــەد حوکم درابووین، لەگەڵ یەکدی دانیشتین تا ماوەی دوو ساڵ و دوو مانگ لەگەڵ یەکتری ماینەوە، پاشان من نەخۆشـــبووم دەبوایە بۆ چارەســـەرکردن بە بڕیار بچمە مۆسکۆ، ئیتر بە وەفدێك چووم، بەڵام ســـەلام عادل لەبیری نەچوو بوو کە داوامکردووە لە سکرتێری حزب بێتە خوارەوە، بۆیە دوای ئەوەی چارەســـەریم تەواو بوو، ویستم بێمەوە، بڕیارێکی مەکتەبی سیاسیم بۆ

هات له رێگەی حزبی شیوعی سۆڤێتییەوە، كە بمێنمەوەو لەوێ بخوێنم، چەندی هەوڵمدا بگەڕێمەوە بێ سوود بوو دواتر بەناوی ئەوەی تەكەتولم كردووە، تەجمیدیان كردم، ئەوەبوو من و عامر عەبدوڵلاو زەكی خەیری و ئەبو لعیس، لادراین و تەجمید كراین، گوایا دژی سەلام عادل كارمان كردووە.

*** هەست ناكەی لەگەڵ هەموو سكرتێرەكان هەمیشە ناكۆك بوویت و جۆرێك ململانێت هەبووە، ئەوە حەمید عوسمان، سەلام عادل، عەزیز محەمەد؟**

- عەزیز محەمەد كە كرا بە سكرتێر من دەنگم بۆدا.

*** بەڵام دوایی ململانێ بەتوندی دروست بوو؟**

- ئاخر كە دەبن بە سـكرتێر ئەگەر بە ویژدانەوە مەسەلەكە وەربگری و بیبەستیەوە بە بارودۆخی گۆڕانكارییەكانی ئەو سـەردەم، عەزیز محەمەد (٢٩) ساڵ سكرتێری حزب بوو، ململانێی من لەگەڵ عەزیز لەو كاتەوە دەسـتی پێكرد كە بەشـداری لە وەزارەتی بەعسی كرد بە عامر عەبدوڵلاو موكەڕەم تاڵەبانی.

*** بەڵام ئەو بەشداریكردنە بە قرار نەبوو بەڵكو بە دەنگدان بوو؟**

- ئەوە مەكتەبی سیاسـیی كردی، كۆمیتەی ناوەندی نەبوو، تا توانیم هەوڵمدا حزبی شـیوعی نەچێتە ئەو (بەرەیە)، عەزیز محەمەد سـەرۆكایەتی دەكـرد، ١٥ كەس لە كۆمیتەی ناوەنـدی كۆبوونەوە، پاش گفتوگۆو مشـتومڕێكی زۆر بە دەنگدان ئێمە بردمانـەوە كە ٨ بە٧ بووین، واتە (٨)كەس دژی (بەرە) بوو ٧ كەسـیش لەگەڵ بوو، كەچی عەزیـز محەمەد وازی نەهێنا گوتی (یا رفاق اناشـدكم های فرصە تأریخیە وكـژا وكژا....)و، ئەمجارە جیاوازی لە نێوان من و عەزیز دروسـتبوو، بەڵام لە رووی شەخسیەوە ئێستا پەیوەندیمان هەیەو بچمە هەولێر سەردانی ئەكەم.

*** سەبارەت بە خەتی ئاب هەڵوێستی تۆ چۆن بوو لەگەڵ ئەو خەتە؟**

- خەتی ئـاب لەگەڵ وەرگرتنی حوكم نەبوو، من لەگـەڵ وەرگرتنی حوكم بووم،؟ عادل، زەكی خەیری، ئەبولحسـین لەگەڵ وەرگرتنـی حوكم بوون، بەڵام عامر لەگەڵدا نەبوو، عەزیز محەمەد لە هەردوولا بوو، بەڵام كودەتای (١٩٦٣)بوو، دواتریش كودەتای تشـرینی ١٩٦٣ی بەدواداهات، كە عەبدولسەلام هاتە سـەر حوكم، سۆڤێت بەهیوا بوو عەبدولناسـر ببێت بە كاسترۆیەك لە میسـری عەرەبی و لە دنیای عەرەبیش كە بەرەو سۆشیالیستی بچێت و عەبدولسەلامیش ئەو رێگایە بگرێت، ئیتر ئەو فكرەی (لاراسمالیە- ناسەرمایەداری)ە دروستبوو، خۆت باشی ئەزانی لەسەردەمی عەبدولسەلام ئەو فیكرەیە

بەزەقی دروستبوو، ئیتر لە حزبی شیوعی عێراقدا، سەلام ناسری کە پاڵێوراوی مەکتەبی سیاسـیی بوو لێپرسراوی رێکخستنی حزبی شیوعی بوو لە دەرەوە، ئەو کابرایە (سەلام) یەمینـی بوو، لە ناوەوەش باقر ئیبراهیم لەگەڵ عەزیز محەمەد میزاجیان یەمینی بوو، ئیتر و وای لێهاتبوو ئەو قەناعەتەیان دروست ببێ کە بە رێگای ناسەرمایەداری ببن بە سۆشیالیسـتی، دواتر بۆم دەرکەوت ئێمە لە کوێین و خەڵك لە کوێیەو دونیاش لە کوێیە، تێگەیشتم خەتی ئاب هەڵە بوو، بۆیە لە نیسانی ١٩٦٥ کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیمان کرد لە بەغدا کە (١٠) کەس بووین، بڕیارماندا خەتی ئابمان (١٨٠) پلە گۆڕی.

*** ئینشیقاقی عەزیز الحاج کێی لە پشت بوو؟**

- لە بنەڕەتدا کەسـی لە پشتەوە نەبوو، تەنها بارودۆخی ناوخۆ نەبێت، ئاخر حزب تووشی هەڵەی راستڕەوی فیکری هاتبوو.

ماڵی من ئەوکاتە واتە (١٧)ی ئەیلولی ١٩٦٧ لە گەڕەکی قادسیە بوو لە بەغدا، ماڵەکـەم گیراو بەناوی ئەمن گرتمیان و رۆژی دوایی لەدەسـتیان هەڵاتم، دوای ئەوە زانیم ئەوە ئینشیقاقەکەیەو پلانێکی کودەتایی یە بۆ گرتنی لێپرسراوانی حزبی شیوعی، بەڵام ئەم پلانە دواتر فەشەلی هێنا، بوو بە ئینشقاق، نەبوو بە کودەتا، لە ١٩٦٧/٩/١٩ کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیمان لە بەغدا سـازکرد، تیایدا بڕیاری دەرکردنی عەزیز ئەلحاج و سەرۆکی تاقمەکەمان داو بەیاننامەمان دەرکردو یەکسەر ناردمان بۆ ئێزگەی دەنگی گەل لە بولغاریا، دوای دوو رۆژ خوێندیانەوە.

*** دوایی عەزیز الحاج- تان گرت؟**

- پاش (٣٩) رۆژ لە ئینشـیقاقەکە عەزیز الحاج لە ماڵی شـەوکەت خەزنەدار گیرا، بەڵام ئازادمانکرد، چونکە ئەودەم عەزیز الحاج لە سیاسەت نەدەگەیشت، شێت بـوو، ماوەیەك بەوپەڕی توندڕەوی و چەپڕەوییەوە بەیاننامەی دەردەکرد، راسـتیی ئەو جەماعەتەی لەگەڵیشـی بوون زۆر توندڕەو بوون لە پاشان گیران و ئیعترافاتی لێکەوتـەوە، یەکێك لەوانەی گیرابوون ئەحمەد مەحمود کە خەڵکی سـلێمانی بوو، هەروەها گوشام کە کادیرێکی عەرەب بوو لە بەغدا، ئەمانە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا کوژران و هیچ نهێنیەکیشیان نەدرکاند، بەڵام کە عەزیز الحاج گیرا، بەیەك شەقازللە گوتی لێم مەدەن هەموو شـتێکتان پێدەڵێم و دێمە سـەر تەلەفزیۆنیش قسە دەکەم، ئەوکات حەمید عوسـمان راوێـژکاری حزبی بەعس بوو لـە بەغدا، ئامۆژگاری کردبوون کە عەزیز الحاج بهێڵنەوەو سوودی لێوەربگرن و ئەلقەیەکە لە دەستان، نەکەن

بیبەنەسەر تەلەڤزیۆن، بەڵکو باشتر وایە قسەی نهێنی لێ وەربگرن.

*** حەمید عوسمان جارێکی دیکە گیرایەوە چۆن بوو بە بەعسی؟**

- نا حەمید جاری دیکە نەگیراوە.

*** ئەدی چۆن کرا بە راوێژکاری بەعس؟**

- هەر خۆی، ئەو کەسە (٢٠) جار سەنگەری گۆڕیوە...

*** سەرەتای بیرۆکەی ئینشقاقەکەی عەزیز الحاج بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

- راستیەکەی لە ساڵی ١٩٦٤ بیرۆکەی بەشداریکردنی حزبی شیوعی لە دەسەڵات پەرەیسەند، بەڵام رێکتر دەتوانم بڵێم ئەو ئینشیقاقە لە دوای (١٩٦٥)ەوە لە دوای کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی کە لە نیسان گرێدرابوو (١٨٠) پلە سیاسەتمان گۆڕی و لە تشرینی ١٩٦٥ەوە لە بەغدا کۆبوونەوەیەك کرا، کە بێ سێ و دوو دەبێ حزبی شیوعی حوکم وەربگرێت، عەزیز الحاج لەو کۆبوونەوەیە بەشداربوو، ئیتر فیکرەی ئینشیقاقەکە لەو کۆبوونەوەیەی ١٩٦٥ تەواو دروستبوو.

*** پێش ئەو کودەتایەی کە لە تەمموزی ١٩٦٨ بەعس کردی، پێشوەخت نوێنەرێکی ئەمریکی سەردانی عێراقی کردو لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکر دانیشتووە، ئەگەر بزانی ئەو دانیشتنە بۆچی بووە؟!**

- بۆ کودەتای (١٩٦٨) بوو و نەخشەکە ئەمریکاو بەریتانیا کێشابوویان بەیەکەوە. ئەوانەی کودەتاکەیان کرد (عەبدولڕەزاق نایف کە بەڕێوەبەری ئیستتخباراتی عێراقی بوو و پیاوی موخابەراتی بەریتانی بوو).

*** راستە دەڵێن ئەحمەد حەسەن بەکر لە ١٩٦٣ بەرانەتی دابوو کە ئیتر کاری حزبی و سیاسەت نەکات؟**

- راستە بەڵام ئەمریکا پەیوەندیی لەسەر ئەمە چییە، راپەڕین و خۆپیشاندان کرا کە تێیدا (٥تا٦) هەزار کەس بەشداربوون و ئەحمەد حەسەن بەکر چوو لەم خۆپیشاندانە قسەی کردو رووناکی سەوزیان بۆ هەڵکرد، ئەو خۆپیشاندان و قسەکردنە بۆ ئەوە بوو بە ئەمریکییەکان بڵێین بەنەزەری ئێوە دەتوانین کودەتا بکەین و ئامادەین.

*** باشە عەزیز حاج لە ١٩٦٨ چۆن گیرا؟**

- ئەو باڵێکی سەرەکی حزبی کەرتکرد، مەفروز بوو لەناو حکومەت تەنسیقەکی هەبووایە، بەڵام نەیبوو کەچی عەزیز حاج نەخشەو پلانی کودەتایی دانابوو.

*** بابێینە سەر شـــتە داخیلییەکانت، لە سەرەتای ساڵانی (١٩٨٠) لە کوردستان لێپرسراوی بەشی سلێمانی بووی، شەڕێکی خەست لە نێوان حزبی شیوعی و یەکێتی دا روویدا کە ئەو ماوەیە مەلا بەختیار لە یەکێتی لێپرسراوی سلێمانی بوو، ئێوە (تۆ و مەلا بەختیار) لەگەڵ یەکتر وەك دوو برا دادەنیشتن، سیاسەتی حزب دوولایەنە بوو لەلایەك شەڕبوو و لەلایەك ئێوە لەگەڵ یەکدی دادەنیشتن؟**

- من شەڕم نەکردو سیاسەتی حزب یەك لایەنە بوو نەك دوولایەنە، بەڵام من رازی نەبووم کە شەڕ بکەم.

*** ئەدی بڕیاری مەرکەزیی حزب چی بوو؟**

- هەوڵمـــدا ئەوانیش لەم بڕیارە دابەزن کە شـــەڕکردنە، لەلای خۆم (٢٧) کادیری حزبی و عەسکەری هەبوون چەندجار کۆبوونەوەم لەگەڵیان دەکردو گفتوگۆم لەگەڵیان دەکردو بابەتەکانم بۆ باس دەکردن راوبۆچوونم وەردەگرتن.

*** بەڵام بڕیارێك هەیە لە مەرکەزیی حزبەوە دەردەچێت؟**

- بەڵام بڕیارێکی هەڵەیە خۆ زەمان و کاتی ستالین و (٥٠)کان نییە ئەم دەروێشەی جاران بم ئەوەی شـــێخ دەیڵێت بیکەم، من لە ساڵی ١٩٧٩ یەکەم کەس بووم لە دەرەوە هاتمەوە کوردســـتان بۆ خەباتی چەکداریی، ئەو سیاسەتەی گرتمان من و عومەری مامە شـــێخەو مەلا ئەحمەدو برادەرانی دیکە سیاسەتی سەربەخۆیی حزبی شیوعی، نەبەلای یەکێتی نەبەلای پارتی دا ئەو سیاســـەتەمان بەوردی بردەســـەر تا ئەیلولی ١٩٨٢، عەزیز محەمەدو ئـــەوان کە لە دەرەوە بۆ یەکەمجار هاتنەوە، کۆبوونەوەیەکی لیژنەی مەرکەزیی کرا، ئەوان لە ئەیلولی ١٩٨٢ قیادەی حزبیان گرتە دەست (عەزیز محەمەدو کەریم ئەحمەدو عەبدولرەزاق ســـافی و باقر ئیبراهیم) ئیتر من و عومەری مامە شـــێخە (ئەبو فـــاروق) دەورمان نەما وەك جاران کە بتوانین ئەو سیاســـەتەی دامـــان نابوو پیادەی بکەین، چونکە تا ئەو کاتە بەهیچ لایەکمان دانەدەتاشـــی واتە نەلایەنگریی یەکێتی بووین نە پارتی و بۆ هیچ لایەکیشمان خوارنەدەکردەوە.

پەیوەندییەکی دۆســـتانەو خۆشـــمان لەگەڵ هەردوو لا هەبوو، دوای ئەوەی ئەوان هاتنەوە منیان کردە لێپرســـراوی کەرتی ســـلێمانی و کەرکوك، یوسف حەننایان کردە لێپرســـراوی هەولێرو تۆما تۆماسیان کردە لێپرسراوی بادینان. ئەو دابەشکردنە تازەیە، نەخشەی رێکخستن و سیاسەتی ناو حزبی گۆڕی و ئەو (عدم انحیازەکەیان) نەهێشت و ئێمەیان بڵاوەپێکرد.

*** دەڵێــن کاریگەریی مەلا بەختیار بوو وای لە بەهادین نوری کرد کە شــەڕ نەکەن چونکە شەڕ ئەوکاتە لە بەرژەوەندیی یەکێتی دانەبووە بەرەی شەڕەکە فراوان بکات.**

- جارێ پیاو قســە بۆ هەق بکات، هەموو رۆژێ بروســکە بۆ مەلا بەختیار دەهات کە شــەڕ بکات و لە ئێمە بدات، بەڵام ئەو شــەڕی نەدەکرد هەر لەسەر ئەمەش سزادراو تەجمیدکرا، لەلایەکی دیکە من کاریگەریم کردە ســەر مەلا بەختیار نەك ئەو کاریگەریی بکاتە سەر من.

چەندجار لەگەڵ مەلا بەختیار دادەنیشتم پێمدەگوت ئەوە شەڕمانکرد تۆ (١٠٠) کەست لە ئێمە کوشت و ئێمە (١٠٠) کەسمان لە ئێوە کوشت کێ قازانج دەکات؟ بەڵام مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی کە هاتنەوە ئەو سیاسەت و بێلایەنیە، حزبی شیوعیان تێکدا.

*** مەکتەبی سیاسی دەیویست بچنەناو شەڕەکە؟!**

- لەگەڵ ئیستیقلالییەت دانەبوون.

*** بۆ مەکتەبی سیاسی گوشاری لەسەربوو، هۆکار چی بوو؟**

پرســیار لەمن مەکە ئەو پرســیارە لە خۆیان بکە، عەزیز محەمــەد زۆری نەخایاند گەڕایەوە دەرەوەی وڵات، کەریم ئەحمەد بوو بە قائم بالاعمال، بۆ کەریم ئەحمەد لەگەڵ ئیستیقلالییەت نەبوو، چونکە هەر ئەوەندە لە دنیا دەگات ئەوە وەڵامی منە.

*** کەریم ئەحمەد بەوە ناســرابوو کە زیاتر لایەنگری مام جەلالە کەچی شــەڕ لەگەڵ یەکێتی دروستبوو.**

- وانەبوو، بەڵکو کەریم ئەحمەد بەوە جیادەکراوە کە لە بیرەوەرییەکانی خۆشم نووسیومە لە بەیانی تا ئێوارە سێجار راوبۆچوونی خۆی دەگۆڕێ.

*** تۆ دەڵێیت من کاریگەریم لەســەر مەلا بەختیار هەبوو ئەو شــەڕە دروست نەبێت، گەرچی مەلا بەختیار بە کابرایەکی توندڕەو دەناســرا هەتا کوشتنی شێرکۆ شێخ عەلی دەڵێن ئەوی لە پشت بوو؟**

- من نووســیومە، مەلا بەختیار لە پشت ئەمە دابوو، مەلا بەختیار جەمال باپیر نارد شێرکۆ شێخ عەلی بکوژێت.

*** نەوشــێروان کــە گیرا هێنایانە بارەگای حزبی شــیوعی، کە لــە زیندان رایکرد هاریکاری حزبی شیوعی لەگەڵدا بوو؟**

- نەخێر، بەهیچ شــێوەیەك شیوعییەکان ئاگاداری نەبوون، بەڵام ئازادییان پێ دابوو، هیچ جۆرە چاودێرییەکی لەســەر نەبوو، بەڵام کاوەی شــێخ لەتیف نەوشێروانی دەرباز

کرد، شیوعییەکان بە هیچ جۆرێك بیریان لەوە نەدەکردەوە نەوشیروان لای ئێمە رابکات، چونکە یەکێتی هاتنە لای ئێمە لە تۆڵەو زەلیێ و شەخسی خوالێخۆشبوو (کەمال خۆشناو)هات کە شەخسی سێیەم بوو لەناو یەکێتی لەوکاتداو گوتی ئێمە ترسمان هەیە کاك نەوشیروان بکوژن لەبەر ئەوەی داواتان لێدەکەین و تکا دەکەین با لە لای ئێوە سجن بێت، ئێمەش داوامانکردو ئەوانیش رەزامەندییان لەسەرداو هێنایانە بارەگای ئێمە.

*** کێ لە سەرکردایەتی سۆشیالیست توندبوو لەسەر نەوشیروان؟**

- ئەوانەی ئەوێ حەمەی حاجی مەحمودو تاهیری عەلی والی و ئەوانەی لەوێ بوون توندبوون.

*** دەڵێن قادر جەباری توندبوو؟**

- ئاگاداری هەڵوێستی ئەو نەبووم.

*** دووركەوتنەوەی تۆ لە قاتعی سلێمانی هۆكاری چی بوو؟**

- چونکە ئەوان تێکشکان و ئێمەش تێکشکاین، بەڵام وەکو ئەوان نەبوو، ئەوان لەوێ کردیانە ئەودیوی قەندیل، من لێرە کاغەزم نووسی بۆ برادەرانی پارتی و سۆشیالست، با هاوکاری یەکتر بکەین رۆژهەڵاتی شەقامی عەربەت و دەربەندیخان دەگرین و یەکێتی دەردەکەین و ئێمە خۆمان لەو ناوچەیە دادەنیشین و هەردوولا رەزامەندیان لەسەردا من هێشتا لە قەرەداغ بووم، هێزەکەی خۆم کرد بەودیوە، شەوکەتی حاجی موشیر لێپرسراوی ئەو ناوچەیە بوو لە یەکێتی، ئەوانیش لەلای خۆیان (پارتی و حسك) هاتن، یەکێتی بەجێیهێشت و شەوکەت جانتا دیپلۆماسیەکەی خۆی بۆ نەبردرا کەوتە دەست حەمەی حاجی مەحمود، ئێمە ئەو جێگایەمان گرت کە نەخشەمان بۆ دانابوو واتە بەشی زۆری شارەزوور لە دەست ئێمەدابوو و بارەگای پشتەوەشمان لە پشت ئەحماوە لە سورێن و هەرمێنە بووین.

نارازییەکی زۆر هەبوو لە ناو کادیرو پێشمەرگەکانمان (حزبی شیوعی) من گوتم دیموکراسیانە چارەسەری دەکەین بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژاردنی حزبی و سەربازی دەکەین لەم هەڵبژاردنە ئەوانەی نارازین ئەو کەسانە هەڵبژێرن کە خۆتان دەتانەوێت، سێ فەوجمان هەبوو هەڵبژاردنی فەوجی یەکمان کرد هاتینە شارەزوور بۆ هەڵبژاردنی دوو فەوجەکەی دیکە پێش ئەوەی ئەو دوو هەڵبژاردنە بکەین بە چوار سەعات بروسکەیەکمان لە مەکتەبی سیاسی بۆ هات کە هێشتا مەکتەبی سیاسی لە ئێران بوون، ئەبوو سەلام و مەلا عەلی لە دەستەی قاتع بڕیاردرا دووربخرێنەوەو مەلا ئەحمەد بانیخێلانی کرا بە لێپرسراوی قاتع.

*** بۆچی ئەویان دانا؟**

- چونکە بە قسەی ئەوانی دەکرد، دوای ئەوەی مەلا ئەحمەد هاتە لای ئێمە گوتی ئێمە لەوێ حەیاو ناموسمان چووە لەسەر ئەوەی گیراوین و چووینە لای مام جەلال و بەیانمان دەرکردو مام جەلال دەمانچەی داوە پێمان و گەڕاینەوە لای برادەرانی خۆمان مـــن و کەریم ئەحمەد، پیاو چاك ئەوەیە هەندێ هـــاوکاری و یارمەتیم بدەن، بەڵکو هەندێك حەیاو ناموسمان بۆ دەگەڕێتەوە، پاش ئەوەی دوو مانگ لەوە لە ئێمە رازی نەبوون لەبەر ئەوەی تاوانی من ئەوەبوو کە شـــەڕم نەکردبوو بۆ رزگارکردنیان و نەشم دەتوانی شـــەڕ بکەم، بۆیە نەمدەتوانی بگەم بە فریای ئەوان، داوایان لێکردم فریایان کەوم، بەڵام خۆ کۆپتەرمان نییە پێی بێم لە شاخی هەلالانەوە چی دەمگەیەنێتە پشت ئاشان لەبەر ئەوە لەمن نارازی بوون و منیان تەجمیدکرد.

*** تەجمید کردنەکەت بە قراری مەکتەبی سیاسیی بوو یان هەر سکرتێر بوو؟**

- نەخێـــر نەوەڵا پێم وابوو مەکتەبی سیاســـیی بوو، ئەگـــەر لیژنەی مەرکەزیش نەبووبێ.

*** باشە تۆ ئەوکاتە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی نەبووی؟**

- با.

*** باشـــە ئەی چۆن لە کۆبوونەوەکە بەشدار نەدەبووی ئەگەر لیژنەی مەرکەزی بیێ؟**

- جا من ئەو پرسیارەم لە مزەکەراتی خۆمدا تەرحکرووە، بە چ هەقێ.

*** هەر ئەوەش بوو نەیانهێشت داخلی کۆنگرە بیت، کۆنگرەی ساڵی(٨٥)؟**

- نەچووم کەس بانگی نەکردم، لەســـاڵی ٨٤ انیشـــقاقم کرد یەعنی جێمهێشتن، اقامەی جەبریان لەســـەر دانام لە کوێ لە بنکەیەکی حیزبی تودە لە ســـێ سنووری لای ســـنووری عێراق ئێران تورکیا ئیقامەی جەبریان لەســـەر دانام لەوێ نزیکەی مانگێك مامەوە.

*** تۆ تەمەنێکی درێژت لەگەڵ ئەو سەرکردایەتییەی حزبی شیوعی بردسەر کە تەجمیدکرابوویـــت و دوایی لە کۆنگرە بانگیان نەکردی ئەندامانی کۆنگرە نەیانگوت هۆکاری نەهاتنی بەهادین نوری چۆنەو چییە؟!**

- نەءوەڵلا.

*** ئەی چۆن؟**

- فکرەیەکی دیموکراسیانەو واعی لەناو حیزبی شیوعیا نەبوو.

*** باشە لە قیادە کەس پشتگیریی تۆی نەکرد؟**

- کە سـەلام عادلیش تەجمیدی کردم لە ٦٢ هەر کەس پشـتگیریی نەکردم. لە سجنیشا کە تەجمیدیان کردم بەس زەکی خەیری و برادەرێکی عەرەب بەناوی عەزیز شێخ ئەو دوو کەسە پشتگیریان کردم لە سجنا.

*** باشە دوای ئەوەی ١٩٩١ کە هاتییەوە ئیتر مەرکەزەکت دانا مەرکەزی دیموکراسی و بڵاوکراوەیەکت دەرکرد، ئەو پاڵپشتە داراییەت لە کوێوە بۆ دەهات؟**

- کەس دەعمی دارایی نەکردم، دەعمی مالی بەرامبەر بەشتێکی چی.

*** ئاخر نا خۆ ئەوکاتە هەندێك مەساریف و خەرجیت هەبووە.**

- خەرجیم نەبووە، کە هاتمەوە سێ چوار هەزار دۆلارم لەگەڵ خۆم هێنایەوە.

*** مەبەستم خەرجی بۆ ئەو حزبی دیموکراسیە بوو کە دروستت کردبوو؟**

- ئەوە لە ١٩٩٤ دروستبوو.

*** ئا بەڵێ.**

- سـێ چوار هەزار دۆلارم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، ئەوەم خەرجکرد لە ٩١. بەڵام حیزبم لە ٩٤ دروستکرد، پێش ئەوە ئەو شتە کە دروستمانکرد دیموکراسی بەردەوام بوو تا کردمان بە حیزب لە ٩٤دا بۆ یەکەم جار پارەیەکمان بۆ هات ئەوەشم نووسیوە.

*** لە کوێوە؟**

- رۆژێك یەکێك هات بۆ نوسـینگەکەمان، وتیان یەکێـك هاتووە لە ئەحواڵی تۆ ئەپرسێ، لە سکرتاریەتی مام جەلال، گوتم بابێ، هات گوتی ئەوە ٢٠ هەزار دینارە مام جەلال ناردویەتی بۆ تۆ مانگانە.

*** پێشتر لەگەڵ مام جەلال باست لێوەنەکردبوو؟**

- نەءەڵلا، باسی پارە بکەم قەت نەمکردووە.

*** داوات نەکردبوو بۆ حیزبەکە؟**

- داوام نەکردبوو، منیش گوتم بۆ شەخسـی خۆم، گوتی ئا، گوتم دەبڕۆ سبەینێ وەرەوە، خۆت وەرەوە سـبەینێ جوابت دەدەمەوە، ئێسـتا جوابت نادەمـەوە. برادەرانم کۆکردەوە، قادری میرزا کەریم و سـۆران و سێ چوارێکی دیکە ماڵ لەوە حیکایەت

لەوە، گوتم من شەخسـی بۆ خۆم رەتیدەکەمەوە ئەگەر ئەتانەوێ بۆ بزووتنەوە وەری بگرن بـا بەناوی منیش بێت مانعـم نییە، گوتیان ئەمانەوێ، گوتم دەبـڕۆن وەری بگرن لەم دەقیقەیەوە سـبەینێ ئەیەتەوە لێیوەربگرن و با بەناوی من بێ، سۆرانمان تەکلیف کرد ببێ بە محاسـیب و پارەکە وەربگرێ و خەرجی کا، سۆران بەکر، وەریانگرت ئەوە لەساڵی ٩٤ بوو، پاشـان داوای مۆڵەتمان کرد بۆ بزووتنەوە بە فەترەیەك، لە ١٩٩٦ بوو یەکێتی راونرا لە هەولێـر، پارتی هەولێری گرت مقەری مام جەلالیان گـرت کاغەزێکی مام جەلالی تیاگیرا بڵاویانکردەوە کێ بوو لە هین ئیشـی ئەکرد لە سەحافەی پارتی ناوی چی بوو فەیسەڵ؟!.

*** کاك فەیسەڵ دەباغ؟**

- بەڵـێ ئەو بڵاویکردەوە یا یەکێکی دیکە بوو، ئەمە کاغەزەکەی بڵاوکردەوە کاغەزەکە هی مام جەلال بوو، کاغەزی مام جەلال ئەوە بوو نووسـیویەتی زوو وەکو ٢٠ هەزار دینار بۆ من تەرخان بکا مانگانە، منیش بەو نەوعە پارەکەم وەرگرت، کە باسمکرد جوابم دایەوە چی بوو لە گۆڤاری چیا بڵاوکردەوە ئەوکاتە، ئەوەهابوو کاکە ئەوە نەبوو ئەوی ئێوە بڵاوی ئەکەنەوە.

*** ئەی دوایی موشـکیلەیەکت دروسـتبوو لەگەڵ دیموکراسی لەسەر پارەو لەسەر ئەو شتانە، لە بنەڕەتدا ئەمە چۆن بوو؟**

- لەگەڵ کێ؟

*** لەگەڵ دیموکراسی، جەماعەتەکەی خۆت؟**

- پارەیان دزیبوو ئێ ئەوە؟

*** ئا پارە دزرابوو هەندێ شتی وا نووسرا؟**

- ئـەوە لـە ٢٠٠٢ بوو زەوییەکمان هەبوو فرۆشـتمان، من کرێبـووم، بزوتنەوە، دوای فرۆشتمان لە قاسەکا قاسەکە لەناو مقەرا بوو دزرا ٤٠ تا ٤٥ هەزار دۆلاری تیابوو لەسەر ئەوە مشکیلەمان بوو.

*** نەتیجەی نەبوو تا ئێستا؟**

- شتی یەقین نەوەڵلا، بەس شك و گومان تەبعەن ئەبێ.

*** باشە ئێستا پەیوەندیت لەگەڵ مام جەلال و قیادەی یەکێتی چۆنە؟**

- تقاعدم پەیوەندیم بۆ چییە، حەقم بەسەر کەسەوە نییەو شتم هەبێ ئەینوسم لەسەر هەر کەسێ بێ.

*** یارمەتی ئەدرێی یارمەتی ماددی؟**

- معاشێکی چوار گەڵایی کۆسرەت هێشتا رەئیس وزەرا بوو بۆی دانام، لە پاشان نازانم لەبەرچی رقی هەڵسا بڕی.

*** چوار گەڵا یەعنی چوار وەرەقە؟**

- ئا بەڵێ.

*** ماوەیەکی زۆری پێچوو بڕی؟**

- وەڵا نازانم ساڵێك رەنگە کەمتر زیاتر نازانم.

*** لەسەر چی بڕی؟**

- وەڵاهی میزاج نییە، هی کورد هەروایە، قابیلە لەســـەر چی بێ، دوایی عەدنان مفتـــی بوو بە وەزیری مالیە پێم گوت، عەدنان ئیعـــادەی کردەوە، تقاعدیم تایبەتە، رەسمی نییە بنەمای قانونی نییە.

*** یەعنی ئێستا ئەو چوار وەرەقەیەت هەیە؟**

- لەم مانگەوە تۆزێك زیادکرا، چووم لەبەر ئەوە هەر ئەو چوار وەرەقەیە بوو چوومە لای مەســـئولی پێشمەرگە دێرینەکان تەبعەن لەم ساڵانە لە پارتیش داوای تەقاعدیم کرد، داوام کرد بەڵام نەیان دامێ هەر ئەوەبوو لە پارتیش داوامکرد.

*** بە کێت گوت؟**

- وەڵاهی، دوو ســـێ جار کاغەزم نووســـی بۆ کاك کۆسرەت خۆی بەس لە پێشا بەمبادرەی دکتۆر رۆژ شاوێش، گوتی تقاعدمان بۆ بریتەوە وتم وەڵاهی لە ئێستاوەبێ مەغدورم ئەبێ مەفعولی پێشووتری هەبێ گوتی ساڵێك مفعولی پێشتری ئەبێ ئی ساڵێکی پێشوویان دامێ دوای ئەوە یەك فلسیان نەدامێ.

*** بۆ؟**

- بچۆ لێیان بپرســـە بۆ، هەر ئەوەیان دامێ ساڵێك، دوای ئەوە فلسێکیان نەدامێ، ساڵەکە بەناوی ســـاڵی رابردووە دامیانێ دوو کاغەزم زیاتر نووسی بۆ کاك مەسعود یەکیان لەڕێی حەمە ساڵح جومعەوە ناسیاو و دۆستایەتیم لەگەڵی بووە، وەختی خۆی یەکیان لەڕێی پەیوەندییەکانی پارتییەوە مەســـئولی پەیوەندییەکانی پارتی، جوابیان نەدامەوە داوای مەوعیدو شتمکرد نەیاندامێ. پارتی قەت نە بۆ ئیشی حیزبی نە بۆ شەخسی نە بۆ تەقاعدی قەت رۆژێك لەرۆژان یەك فلیسی پێمان نەداوە.

*** رەنگە لێرە دۆستایەتی و نەرمیت لەگەڵ یەکێتی هەبووبێ؟**

- من بە هەموو حەیاتی خۆم بێ لایەن بووم رەنگە رەخنەم لە هەردوولا گرتبێ.

*** بەڵام زیاتر لە پارتیت گرتووە؟**

- نەء بەس رەنگە ئەو بەعزە شــت خۆی بە قورسی حساب بکات، دەنا من فەرقم نەکردووە، ئەو تەقاعودە چوومە لای مەسئولی پێشمەرگە دێرینەکان ئەم دواییە بۆیان کردم، معاشەکەم چوار گەڵایە ئێستا من بە حەق بێ، حەقی معاشێکی باشترم هەیە من نزیکەی ٦٠ ســـاڵ لە خەباتی حیزبایەتیا بووم بەڕووی سپیا دەرچووم و خیانەتم نەکردووەو دژایەتی میللەتم نەکردووەو یەعنی چی چوار گەڵا چییە بۆ کەســێکی وەکو من، لەبەر ئەوە مەجبورم ناچارم بێم وەك پێشمەرگەیەك خۆم دیاری بکەم داوای تەقاعد بکەم بۆ ئەوەی زیاتر بێت، گوتی بەسەرچاو، ناوی باوکت ئەزانم باپیرت وتم ســـاڵح وتی باشە برۆ پاشی ٢٠ رۆژ تەلەفۆنت بۆ ئەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی بۆمان داناوی بە پلەیەك، ئەوە ئەو مانگە معاشـــی پلەیەکم وەرگرتووە یەك مانگ، نەختێك زیاترە لەوەی پێشـــوو، ئەوە معاشەکەمەو تەبعەن من بە هەقی خۆمی دەزانم معاشی وەزیرێك وەربگرم ئەگەر زیاتر نەبێ، عەزیز محەمەد زۆر دەمێ ساڵە مانگانە هەزارو پێنجسەد دۆلار لە پارتی وەرەگرێ، کەریم ئەحمەد وەریدەگرێ ئەبو حیکمەت پێموایە وەردەگرێ لە یەکێتی وەرەگرێ ئیتر نازانم.

*** کەریم ئەحمەدیش وەرەگرێ؟**

- وەرەگرێ ئەی بیستوومە خۆ من پرسیارم لە خۆی نەکردووە، منیش وەك ئەوانە وام، کەمتر نیم، ئەگەر بە هەق بجوڵێنەوە، ئەوەش پارەی میللەتە من داوای شـــتی شەخصی لە کەس ناکەم، خەباتم کردووە، بەشداریم کردووە لە خەباتا نزیکەی کە خۆم تەقاعدکرد ٥٨ ســـاڵی رێکم تەواوکرد بوو بە زیادیشـــەوە لە خەبات و حیزبایەتی لە ٢٠٠٤ خـــۆم تەقاعدکرد، من ئەمە حەقم نییە منیش معاشـــێك وەربگرم زەویتان داوە بەوان و پارەتان داوە پێیان.

*** لە ناو یەکێتی زەویت وەرنەگرت؟**

- لێـــرە عەردێکم وەرگرت لـــە ٩٤ لەناو پارتیش وەرمنەگرت نەیان دامـــێ داوام کرد نەیان دامێ.

*** لێرە لە ناو قیادەی یەکێتی لەگەڵ کامەیان باشترین پەیوەندیت هەیە؟**

- وەڵاهی دوژمنایەتیم لەگەڵ کەسیانا نییە.

***ئەی پەیوەندیت لەگەڵ کامەیان زۆر بەهێزە؟**

- وەڵاهی ئەوسا لەگەڵ مام جەلال عیلاقەتم خۆشتربوو، ئەوسا، بەڵام ئەم سێ ساڵەی دوایی هیچ نەئەیبینم نە لێی ئەپرسم نە هەوڵەدەم ببینم نە عەلاقەم لەگەڵی هەیە، خۆم تەقاعدکردو قــرارم داوە ئیتر ئەم عەلاقەتانە بە قووڵی واز لێبێنم، خەڵکی باش هەن لە ناو پارتی و یەکێتی بە باشــیان ئەزانم ئێستاش ئینسانی سیاسین، لە سیاســەت هەندێك هەن ئینسانی دیموکراتین ئەوانە پێم باشــە عەلاقەم خۆشبێ لەگەڵیان، بەڵام لە بیرت نەچێ خەڵکێکیش بە عەقلییەتی عەســکری وشکەوە لە هەردوولاوە هەن کەم تا زۆر رەنگە لێرە زۆر تربێ یا لەولا زۆرترن نازانم خۆشم ناوێن.

***بە کورتی چەند ناوێکت لێ دەپرسم رەئی خۆت بدەی؟**

**نەوشیڕوان مستەفا**

- عەلاقەم لەگەڵی نییە، وەڵاهی بڵێم چی رەنگە زۆرباش نەبێ نەوشــیڕوان مەســئولێکی توندڕەوە، مەسئولە لە توندکردنی شەڕی براکوژی.

***کۆسرەت؟**

- وەڵاهی کۆســرەت کوڕی فەلاحێکە پێشــمەرگەیەکی باشەو خەباتێکی باشی کردووە ئیتر بەس لەوانەیە سولتە ئینسان بگۆڕێ ئەو کاتەی دەسەڵاتدار بێ.

***عەدنان موفتی؟**

- پیاوی چاکە سیاسییەو هێمنە.

*** عەزیز محەمەد؟**

- عەزیــز محەمــەد خیلافاتی سیاســی و فکــری بخەیتە لاوە علاقەم خۆشــە لەگەڵی ئێستاش.

نەء وەکو رەئی لەسەر شەخسیەتی؟ خاوەنی رەئی خۆیەتی و لە رەئیەکانی غەلەت بووە. بەڵام ئەزانێ چی دەڵێ.

***جەلال دەباغ؟**

- بەخوا عەلاقەم زۆر دەمێکە لەگەڵی نەماوە.

دیمانەکردن لەگەڵ کەسایەتیەکی سیاسی وەکو بەڕێز مەلا بەختیارم بەپێویست زانی، چونکە ئەویش یەکێکە لەو سیاسییە کوردانەی کە ئەزموونێکی چڕو، پڕ لە هەڵکشان و داکشانی هەیە، (رەنگە زیاتریش داکشانەکەی بەرکەوتبێ)، ئیتر کە چووم بۆ سلێمانی بۆ ئەنجامدانی دیمانەکە، کاتی دیاریکراومان هەر لە شوێنی خۆی لە بارەگای مەکتەبی ناوەندیی رێکخراوە دیموکراتییەکان بوو، کە گەیشتمە نووسینگەکەی، ئەگەرچی نووسینگەیەکی زۆر زۆر سادەو ئاسایی بوو، بەڵام جمەی دەهات لە خەڵك، ئەمە زۆر دڵخۆشی کردم کەسێکی بڕیار بەدەست رۆژانە چاوی بەم هەموو خەڵکە بکەوێ، پێشتریش هەرگیز لەگەڵ مەلا بەختیار دانەنیشتبووم، بۆیە ئەمە یەکەم جارم بوو رووبەڕوو لەگەڵ مەلا بەختیاردا دانیشم، کە چوومە لای و جۆری دیمانەکەو درێژخایەنی دیمانەکەم بۆ باسکرد، ئەوەندەی تر دڵخۆش بووم کە گوتی، ئاخر چۆن دەبێ ئەم موراجیعانەم نەبینم کە چاوەڕوانی من دەکەن، بۆیە دیمانەکەمان خستە ئێوارە. یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی لە بەڕێز مەلا بەختیارم دی، زۆر بە جورئەت وەڵامی پرسیارەکانی منی دەدایەوە، سڵی لە هیچ پرسیارێکم نەدەکردەوە، لە راستیدا، لە دیمانەکانی پێشترم کەسی بەو جۆرەم نەدیبوو، مامۆستا کەریم ئەحمەدی لێدەرچێ، هەندێکیان هەزارو یەك حسابیان بۆ قسەکانی خۆیان دەکرد، بە هەرحاڵ ئەم دیمانەیە، تا ڕادەیەك شارەزایی چ بەرامبەر کۆمەڵە، چ بەرامبەر ئاڵای شۆڕش، چ بەرامبەر خودی مەلا بەختیاری تێدایە، کە بەبێ گەڕانەوەمان بۆ ئەو مێژووانە، ناتوانین قسە لە ئیمڕۆ بکەین.

*** کاک مەلا بەختیار، دەکرێ بزانین رێک ساڵی چەند ئینتیمای سیاسیت کرد؟**

- ئینتیمای سیاســـی من بۆ دوای بەیانی ئــادار دەگەڕێتەوە. ١٩٧٠/٦/١٠ کۆمەڵە دامەزرا، بەڵام ئێمە پێش ئەوە لە گروپێکی خوێندکاری چەپدا بووین، دوای دامەزراندنی کۆمەڵە راستەوخۆ چووینە ئەڵقەی رۆشنبیریی کۆمەڵەوە.

*** ئەو ئەڵقە رۆشـــنبیرییە چەپە ئەو کاتە رێکخراوێک بوو بەناوی ئەڵقەی رۆشنبیری؟ یان سەر بە یەکێتی لاوان بوو؟**

- نەخێر هیـــچ رێکخراوێک نەبوو، بەڵام با بڵێین درێژبـــووەوەی یەکێتی قوتابیان بوو، ئەو کاتـــە یەکێتی قوتابیان دوو بـــاڵ بوو، یەکێکیان پارتی شۆڕشـــگێڕ کە ئیمتدادی یەکێتی قوتابیان بوو، ئەو کاتە پێیان ئەوت جەلالی، تووشـــی رووداوی (١١)ی ئازار و مەســـەلەی گفتوگۆ بوو لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەوکاتە قوتابیانی ئەوان و هەندێـــک لە چەپەکانی خانەقین و کەرکووک و ئەوانە لەناوخۆیان مانەوە و لەناوخۆیاندا دیالۆگ هەر هەبوو، بەدەستنووســـیش شـــتیان لەنێوان خۆیاندا ئەنووسی، جا من سۆز و عاتیفەیەکم لەگەڵ ئەو رەوتە هەبوو لەناو خانەقین، ئەوکات تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو، بەرەو هەژدە ســـاڵ هەڵدەکشـــام. گفتوگۆمان لەگەڵیان هەبوو، شتم لێیان وەردەگرت، زاراوەیان لێ فێردەبووم، لە چایخانە، لە پیاســـەکانا، لە هەموو شـــوێنێک کـــە بەیەکەوە دەبووین، دانیشتنمان ئەکرد، وردە وردە ئەو گرووپە مایەوە، تا کۆمەڵە دامەزرا، کە کۆمەڵە دامەزرا، بیروبۆچوونەکانی لەگەڵ دامەزراندن و بنچینەکانی بیری کۆمەڵە یەکی ئەگرتەوە، بۆیە نەک وەکو گروپ، بەڵکو تاک تاک، بەشـــی زۆرمان، دەتوانم بڵێم هەموومان خۆمان لەناو کۆمەڵە دەدۆزییەوە.

واتا ئەتوانم بڵێم ســـێ چوار مانگ دوای دامەزراندنی کۆمەڵە، من بووم بە ئەندامی ئەڵقەی رۆشنبیریی کۆمەڵە.

*** دەتزانی بەرپرسی ئەو رەوتە کێ بوو؟**

- مامۆستا جەعفەر بوو، کە ئێستا بەرپرسی مەکتەبی بیرو هۆشیاری یەکێتییە.

*** ئەی بوونە پێشمەرگایەتیت بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

- ســـاڵی ١٩٧٤ بە شۆڕشی ئەیلول پەیوەندیم کرد، ئەوە بەیەکجاری بوو، هەتا کۆتایی شۆڕشەکە ١٩٧٥، ئەوکاتە من بەرپرســـیاری دووهەمی لقی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کردستان بووم لە خانەقین، بەرپرســـیاریەکی دووهەم واتا جێگری بەرپرسی لقی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان بووم، لە شاخیش هەر مامەوە.

*** بەرلەوەی ببی بە پێشمەرگە؟**

- بەرلەوەی ببم بە پێشـــمەرگە، کە چووینە شـــاخ، ئەو دامودەزگا و ڕێکخراوانە وەکو خۆی مانەوە و پارێـــزەران بارەگایان هەبوو، ئێمە لە دێیەك بەناوی (مەحمود قەجەر) لە خانەقین بارەگامان دانا و هەر ئیشـــی لاوانمـــان دەکرد، بیرم دێ ئەوکات قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری، باســـکردنی مێژووی کورد، ســـروودەکان، خولی هۆشیارکردنەوەی لاوان، خولی وەرزشی، شانۆگەری، ئەمانەمان زۆر زۆر پێشکەش ئەکرد، کتێبخانەیەکمان هەبوو، خەڵکمـــان فێری فیکر و ئەوانە ئەکرد، خۆشـــمان لە ژێرەوە کۆمەڵە بووین، ئێمە لاوانمان کردبووە چەترێك لە دەرەوەی خۆمانا، لە ژێر ئەمانەشەوە لە پاڵیا ئیشی خۆمان ئەکرد.

لە حەفتاکان، واتا (١٩٧٤-١٩٧٥) لەریزی شۆڕشـــا بووین، بەڵام خۆم ســـاڵی ١٩٧٣ لە خانەقین وەزعم زۆر زۆر خراپ بوو، ڕژێم زۆر فشـــاری خســـتە ســـەرم، چووم ببم بە پێشمەرگە، چووم بۆ تەوێڵە. لە تەوێڵە کتابێکی ڕەسمیان بۆ کردم کە بچم بۆ (ناوپردان) ئەو کاتە مەکتەبی عەســـکەری لە ناوپردان بوو، من و چەند گەنجێکی خانەقین بووین، هەموومان بەیەکەوە چووین، یەکێك لەوانە کاك عەباس ڤیدیۆیە، ئێستا ئەندامی مەکتەبە لە گەڵ خۆم، کوڕێك بەناوی ئەحمەد یاوەر ئێستا ئەفسەری ئاسایشە لە خانەقین، چەند کەســـێك بووین. بەهەرحاڵ کە چووین بۆ ئەوێ ئەوانیـــان وەرگرت و منیان وەرنەگرت، تۆمەز لەتەوێڵە لەســـەریان نووســـیبووم، ئەمە هەم جەلالییە و هەم سوورە، بێگومان من ئـــەوکات قەت جەلالـــی نەبووم، چونکە تەمەنم هی ئەوە نەبوو، بەڵام ســـوور بووم، ئەوە ڕاستە.

*** بەڵام وەکو خێزان و بنەماڵە جەلالی نەبوون؟**

- نا نا، لە خێزانی ئێمە، بەس من سیاسەتم کردووە.

*** باشـــە ئەوانەی کۆمەڵە، کە ڕوویان کردە شـــاخ، با بڵێین لە چیا ئەو ئالیەتە یا ئەو مســـداقییەتە چۆن درا ئەو خەڵکەی کە ئەندامانی کۆمەڵەن بچنە چیا بەناوی پارتی و لە ژێریشەوە کۆمەڵە بن؟**

- ســـەرکردایەتی کۆمەڵە ئەو کاتە بڕیارێکی دەکرد، ئەویش ئەوەبوو هەر کەسێك ترسی هەیە حکومەت بیگرێت، بچێت ببێ بە پێشمەرگە و سەنگەری مقاوەمەت بگرێ، چونکە ئەم خەباتە بـــە دەرە لە پارتی کە ئێمە ناکۆکی ئایدیۆلۆژیمان لەگەڵیاندا هەبوو، خەبات خەباتی ڕزگاری نەتەوەکەمان بوو، ئێمە دەبوو ڕۆڵی تێدا ببینین، هەرکەســـیش بیتوانیایە نەچێتە دەرەوە، ئەمایەوە و خەباتی لە ڕێکخســـتنە نهێنییەکانی خۆی ئەکرد، لەبەر ئەوە

ئێمە ئەوکاتە ئەرکەکانی رزگاری نیشتمانیی و گەلەکەمان لە شۆڕشی ئەیلولدا دەبینیەوە، زۆرێك لە ســەرکردەکانی کۆمەڵە و کادرەکانــی کۆمەڵە، ئەوانە هەموو هاتنە دەرەوە بە شــەهید (شەهاب)یشەوە، شەهید شەهابی شێخ نوری کە سکرتێری کۆمەڵە بوو، لەنێوان مانەوە لە شــارەکان و چوونە ریزی پێشمەرگە، چوونە ریزی پێشمەرگەی هەڵبژارد، کە ئەوکات بێگومان شــەهید شەهابی شێخ نوری کەسایەتییەکی چەپ بوو، ململانێییەکی ئاشکراشــی ئەکرد لەگەڵ پارتی، ناســراو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وتی من هەر سەنگەرم سەنگەری دەرەوەیە، ئەبێ بچینە دەرەوە، واتە ببینە پێشمەرگە.

*** باشــە کەواتــە بەرلەوەی کۆمەڵە دابمەزرێ، گفتوگۆ یــان با بڵێین ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژییە هەبوو لەناو پارتی؟**

- ئەو رەوتە رەگەزەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ســاڵی ١٩٦٧، کە بەبیری گیڤارایی دەستی پێکرد، (١٩٦٨-١٩٦٩) بەرەوبیری ماویزم رۆیشت، کە سازمانی ئینقلابی حزبی تودەی ئێران رێکخراوێك بوون، هاتن بیری ئەندێشــەی ماوتسیۆنگیان هەبوو، هاتنە کوردستانی عێراق، ئەوکاتە لەگەڵ پارتی شۆڕشگێڕ بوون، لە سلێمانی، کەربەلا، بەکرەجۆ، توانیبوویان ئەو بیروباوەڕە گەشــەپێبدەن کادیری باش باشیان هەبوون، تیئۆریستی گەورە گەورەیان هەبوو، ئەوکاتە گروپ و کۆمەڵەی ســەرکردەی ئەوان پردی گواستنەوەی فەلسەفەی مارکســیزم و ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ بوون بەناو کورد (سلێمانی و دەوربەری هەولێر و کەرکوك) ئەوانەش ئەوکاتە لە رێگەی ئەوانەوە ئەفکاری گیڤاریســتی کە ساڵی ١٩٦٧ کاریگەری لەســەر هەموو چەپەکانی دونیادا هەبوو بە کوردیشەوە وردە وردە ئەفکاری گیڤاریستی گەشەی کرد بۆ بیری ماوتسیتۆنگ، بیری ماوتسیتۆنگ مایەوە، چونکە نیشــی پێ ئەکرا، ئەوکاتــە گۆڤارێکیش دەردەچوو بەناوی گۆڤاری رزگاری ســاڵی (١٩٦٩-١٩٧٠)، ئــەو گۆڤارە ئۆرگانی نوێی ئەو ئەندێشــە چەپــە تازەیە بوو کە لە کوردستاندا هەبوو.

*** ئەسەور ناکەی، ئەوکات ئەو گۆڤارە نەیتوانی سەنگێك دروست بکات، بەتایبەتی کە هاتبوونە ناو حکومەت و لەوێ (ئێرە) دەردەچوو، سلبیاتی زیاتر بوو لەوەی ئیجابییاتی هەبێ؟**

- بــە پێچەوانەوە من پێموایــە گۆڤاری رزگاری بە هەموو کەموکورتییەکانیشــەوە توانی ئاراســتیەیەکی ئایدیۆلۆژی پیشــان بدات کە بە خەڵك، بە چەپ بگەیەنێ. ئەم ئاراســتە ئایدیۆلۆژییە نەك هەر جیاواز بوو لەگەڵ پارتی، بگرە زۆر جیاواز بوو لەگەڵ

حکومەتیش، چونکە ئەو کاتە..

*** بەڵام لە ژێر سێبەری بەعس دەردەچوو؟**

- زۆرجار لە مێژووی بزووتنەوەی کوردیدا، یا لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا، لەسەردەمی مەلیکدا، لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا، لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف و عەبدولرەحمان عارف و لە سەردەمی حزبی بەعسدا هەردوو باڵەکەی پارتی پێش ئەوەی پارتیش هەبێ، هەر گۆڤار و رۆژنامە دەردەچوو، هەر لەسایەی حکومەتیش دەرچووە، ئەوە یەکەم ئەزموون نییە، دەیان گۆڤار لەسەردەمی ژینی پیرەمێردەوە هەتا ئەگەینە سەردەمی رزگاری کاک نەوشیروان وا بووە.

*** بەڵام دەرکردنی رۆژنامە، یا کارە رۆشنبیرییەکان لە رێگای ئەو ململانێیە نەبووە، بەڵکو لە رێگای بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری دروست بووە، وەك ئەوانەی پیرەمێرد و... هتد؟**

- نا، پارتی کاتی خۆی لە شاخ شەی دەکرد و (التاخی)یش لە بەغدا دەردەکرد.

*** باشــە، ئەگەر لە بیرت بێت، دامەزرێنەری کۆمەڵەی رەنجدەران کێ بوو، ئەوەی کە بە دامەزرێنەر دادەنرێ؟**

- خۆی ئەوکاتە سێ گروپ هەبوو، گروپی مام جەلال، گروپی کاك نەوشیروان، گروپی شەهاب شێخ نوری، سێ گرووپ هەبووە و سەریان بە یەکەوە ناوە، گفتوگۆیان لەسەر ئەوە کردووە کە چۆن لە دوارۆژدا رێکخستنێکی مارکسی دروست بکەن، هەتا گەیشتنە بەیانی ئادار، لە بەیانی ئادارا بەپێی زانیاری من شەهابی شێخ نوری دەستپێشکەری کردبوو لە دامەزراندنی کۆمەڵە، دوایی گفتوگۆی لەگەڵ گروپەکانی تر کردبوو و یەکیان گرتبوو..

*** ئەوکاتە کە یەکیان گرت، ئەو سێ گرووپە کۆمەڵەکی زۆر بوون، یا هەر چەند رۆشنبیرێك بوون، واتا مەبەستم رێکخراوێکی جەماوەری نەبوو زیاتر رۆشنبیری و فیکری بوو؟**

- خۆی فیکری جەماوەری بەهێز بوو، بەڵام کە کۆمەڵە دامەزرا، کادرەکانی ئەو بزووتنەوەیە لەناو کۆمەڵە کۆکرانەوە.

*** باشە کە هێندە لە نزیکەوە لەگەڵ کۆمەڵە ئاشنایەتیت پەیدا کرد و چەند مانگێکی پێچوو چوویە ناوی و ساڵی چەند یا چەند ساڵی پێچوو گەیشتیە سەرکردایەتی؟**

- ساڵی ١٩٧٣ بووم بە لێپرسراوی خانەقین لەناو کۆمەڵە، ساڵی ١٩٧٣ یەکەمین پلەی

بەرزکردنەوەم بۆ لێپرســــراویەتی خانەقین دەستی پێکرد، ساڵی ١٩٧٥ کە هاتینەوە، من لە (١٩٧٥/٤/١٤) هاتمەوە، چوومە خانەقین، دوای پێنج مانگ کەمتر چوار مانگ و نیو رژێم پەلاماری کۆمەڵەی دا، کە پەلاماری کۆمەڵەی دا، من ئەوکاتە بەرپرسی خانەقیـــن و ئەندامی هەرێمی بەغدا بووم. دوایی، ســــەرکردایەتی کۆمەڵە و برێك لە کادیرەکانی گیران و، هەندێك لە کادیرەکانی هەڵاتن، من بووم بە لێپرسراوی خانەقین و بەغدا و باشوور و هەموو ئەو کەسانەی کە هەمان بوون لە باشوور و هەموو ئەوانەی کە لە ئەڵقە رۆشنبیرییەکان بوون، کاتی خۆی لە ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٣)، ئەوەبوو وردە وردە هەموومان کۆکردەوە و دوایی کۆمیتەیەك دامەزرا بەسەرکردایەتی کۆمەڵە بەناوی کۆمیتـــەی هەرێمەکان، لە مانگی (١٠ی ١٩٧٥) بەدواوە ناوکی ئەم کۆمیتەیە دانرا کە مانگ و نیویك بەسەر (القاء القبض) و دوو مانگێك ئەبوو بەسەرگرتنی ئەندامانی ســــەرکردایەتی کۆمەڵە و هەڵهاتنی هەندێکیان و پەرشـــوبڵاوبوونی رێکخستنەکانمان تێپەڕی بوو، واتە من کە بووم بە بەرپرســــی هەرێم، هەرێمی ئەو کاتە رێکخستنێکی فراوانی نهێنی ســـنووری یەك پارێزگا بوو ئۆتۆماتیکی بووم بە ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکانی کوردستان لە مانگی (١٢ی ١٩٧٥) کۆمیتەی هەرێمەکان سەرکردایەتی کۆمەڵە بوو لەناو وڵاتدا، کە ئەوکاتە من بەرپرســـی هەرێمی خانەقین و بەغدا بووم و بووم بە ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان..

*** واتا هەر بە دامەزراندن و دانان (تەعین) دەبوون بە ســـەرکردایەتی، هەڵبژاردن و کۆنفرانس و شتی وا نەبوو؟**

- هەڵبـــژاردن و کۆنفرانس نەبوو، هەتا ســـاڵی ١٩٨٧ لەنـــاو کۆمەڵە هیچ جۆرە هەڵبژاردنێك نەبووە.

*** باشە بۆچی کۆمەڵە کۆنفرانسیشی نەدەبەست، وا بزانم تا ئاباری ١٩٨١، ئینجا کۆنفرانسی یەکەمی بەستا؟**

- ســـاڵی ١٩٨٠، ئـــەوە کۆنگرەی فراوان بوو، هەڵبژاردنـــی تێدا کرا، لە نەورۆزی ١٩٧٨ لــــە ناوچەی (زەڵێ و ناوزەنگ و نۆکان) کۆبوونەوەی فراوانمان کرد دووەمین ساڵی ١٩٧٩یە.

*** بەڵام ئەمانە کۆنفرانس نەبوون، هەر هەڵبژاردنێك بوون؟**

- بەڵێ، چونکە کۆنفرانس دەبێ تۆ هەڵبژاردنی بۆ بکەی، لە ناوچەکە.

*** باشـــە، مەلا بەختیار رۆڵێکی زۆر بەرچـــاوی لەناو کۆمەڵەدا هەبووە، لەگەڵ هەندێ کەسی دیکەشی وەك جەعفەر و سالار، کەچی لە یەکەم کۆنفرانسی کۆمەڵە هەندێکیان کە وەك گروپێك وابوون، تووشی شکست هاتن، با بڵێین هەتا ملازم عومەر بـــە دەنگێکی نزم دەرچوو، بەڵام ســـالار و جەعفەر دەرنەچـــوون، جەنابت و ملازم عومەریش بە دەنگێکی زۆر کەم دەرچوون، بۆ واتان بەسەر هات؟**

- ملازم عومەر دەرچوو، تەنیا کاك ســـالار و مامۆستا جەعفەر دەرنەچوون، ملازم عومەر لە من زیاتر دەنگی هێنا، من لەو کەمتر دەنگم هێنا..

*** باشـــە ســـالار و جەنابت بە تایبەتی، تا رادەیەکی باش قووڵایتان هەبوو لەناو کۆمەڵە، هۆی چی بوو لە یەکەم کۆنفرانس واتان بەســـەرهات، تووشی سەدمەیەك هاتن؟**

- ئەزانی، راســـتە ئێمە دەورێکی گەورەمان هەبوو لە هەڵگیرســـانی شۆڕش، لە گرتنەوەی کۆمەڵە و ئەوانە، بەڵام لەباری رۆشـــنبیرییەوە و لەبارەی شـــێوازەکانی ململانێمـــان و ململانێی ناو حزبایەتی و ئەوانەوە، ئێمـــە کەمتر ئەزموونمان هەبوو، بەتایبەتی من ئەزموونێکی کەمم هەبوو، بەراستی لەگەڵ ئەوەشدا من دەرچووم، واتا گرفتی دەرچوونم نەبوو، شێوازی کارکردن و هەڵوسوکەوتی من لەناو بنکەی کۆمەڵە هـــی ئەوە بوو کە بتوانـــم متمانە وەرگرم و دەنگم هێنا، من لە حەقیقەتدا هۆیەکانی دەرنەچوونی کاك سالار و مامۆستا جەعفەر بۆ دوو هۆ دەگێڕمەوە، هۆیەك ئەوەبوو ئەو کات فشـــارێکی نابەجێ لەسەریان هەبوو، هۆی دووهەمیش خۆشیان لە متمانە وەرگرتنی زۆرینەی دەنگەکانی ناو کۆنفرانس و کارەکانی کۆمەڵە کەمتەرخەم بوون، بەڵام هۆی یەکەمی ئەگێڕمەوە بۆ ئەوەی فشـــارێکی نابەجێ لەســـەریان هەبوو بۆ ئەوەی دەرنەچن فشارێکی نادیموکراتی هەبوو لەسەریان.

*** ئەڵێن چەند تەکەتولێك هەبوو، بـــەڵام تەکەتولەکەی ئێوە نەیتوانی کادیرەکانی بەشداربووی کۆنفرانس بۆخۆتان رابکێشن، بەڵکوئەوان واتە گرووپەکانی تر کاریگەری زیاتریان هەبوو؟**

- ئەوکات تەکەتول نەبوو، ئەوکاتە گفتوگۆ و موناقەشـــات هەبوو، بەڵام نەئەتوانرا پێی بڵێی تەکەتول، هیچ تەکەتولێك نەبوو.

*** بۆیـــە دەڵێین تەکەتول، چونکە دژایەتی یەکتریان ئەکرد و هەر گرووپە و خۆی بە خاوەنی فکرێك رێکخستنێك دەزانی؟**

- ململانێ هەبوو، بەڵام بڕوا بکە ئەوکاتە فکریشمان روون نەبوو، واتا مرۆڤ هەموو شـــتەکان وەك خۆی بباتەوە بۆ مێژوو باشە، خۆت حوکم نەدەی من حەز دەکەم ئێستا تۆ وا ئەزانی من ئەو کاتە فیکرم هەبووە.

*** بەپێی هەندێك سەرچاوە...**

- فیکرمان، فیکری کۆمەڵە بووە، بەڵام فیکری خۆمان جیانەکردبووەوە، گەڵاڵەمان نەکردبوو، ناشـــتوانم بڵێم ئێمە فیکرێکـــی روونمان هەبووە، بەپێی ئـــەو فیکرە، واتا ئەوە ســـەرەتای ململانێیەکانی ناو کۆمەڵە بووە، ئەو کاتە، دەتوانی ئاوهای ناوبنێی، سەرەتایی چەکەرەکردنی ململانێکانی ناو کۆمەڵە بوو..

*** باشە هەست ناکەی ئەوانەی لەگەڵ تۆ لە گروپێکا بوون یان لە رووی فکرییەوە یەکتـــان ئەگرتەوە، لە نێو هەموویان تەنیا تـــۆ مایەوە و ئەوانی تر تا رادەیەك نەمان، جەعفەر ماوەیەك دوورکەوتەوە، ســـالاریش ئێستا پەراوێز کراوە، وا نییە؟ ملازم عومەر دوورکەوتەوە، واتە ئەو رەوتە فیکریە یا با بڵێین ئەو تەنسیقەی لەنێوان ئێوە هەبووە کە بە ئومێدیکی گەورە بوون ئەوکاتە، بەتایبەتی هەمووتان گەنج بوون و بە هیوایەکی تر کارتان دەکرد، ئێستا تەنیا تۆ مایەوە و ئەوانی تر هەموو کەوتن، ئەمە بۆ؟**

- من بە کورتی پێت دەڵێم دوو هەڵەی گەورە ئەبینم لەم کارە، ئێمە خۆمان هەڵەی ئایدیۆلۆژیمان کرد.

*** چۆن هەڵەی ئایدیۆلۆژی؟**

- بەخۆمان ئەوەی کە وردە وردە بووین بە تەکەتول.

*** ئاخر تەکەتولی تریش هەبوو؟**

- بەڵێ، ئاخر ئێمە هەڵەی ئایدیۆلۆژیمان کرد، زیاد لە پێویســـت، خۆیان بە چەپ ئەزانی، ئەوکاتە بەرامبەرکانیشـــمان هەڵەی رێکخســـتن و هەڵەی سیاسی قورسیان بەرامبەرمان کرد، ئیتر دوو هەڵەکە شۆڕتی کرد.

*** ئێوە ئەوکاتە خوێن گەرمتر بوون.**

- بەڵێ..

*** رەنگە زۆر لە رووی رێکخستنەوە، گرنگیتان پێنەدابوویێ؟**

- نا، نەوهاش نا، لە رووی رێکخستنەوە ئیهتمامان نەدابێ، ئەو تێزە ئایدیۆلۆژیایانەی

ئێمە تەرحمـــان ئەکرد، تێزێك بوو زۆرتر نوخبە و کەســـانێکی چەپی تەواو قبوولی ئەکرد، بزووتنەوەی سیاسی و جەماوەری فراوان تێزەکانی ئێمەیان قبووڵ نەئەکرد.

*** بەڵام خۆ دوای راپەڕین بڵێین ئەو برادەرانە هەموویان تارادەیەك قاڵبوونەوە لەناو ئایدیۆلۆژیا و رێکخستنەوە، کەچی هەر نەیانتوانی بەردەوام خۆیان بپارێزن؟**

- جـــا ئەمەیـــان دوای راپەڕین شـــتێکی تـــرە، پێش راپەڕین بـــە رەتی من کەم نەبووین.

*** لە رووی جەماوەرییەوە کەم نەبوون؟**

- بەشێکی هەرە باشی کادرەکانی کۆمەڵە لەگەڵ ئێمە بوو، بەشێکی ناڵێم هەمووی، بەڵام بزووتنەوەی سیاســـی لەناو خەباتی شۆڕشـــگێڕانە بە نوخبەی کەوادر ناتوانێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ. خەبات، خەباتی بزووتنەوەیەکی جەماوەرییە، بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی و میللەتێکی ژێردەستەیە لە پێناوی رزگاری و ئازادی و دیموکراسی، تۆ ناتوانی نوخبە بکەی بە ئەلتەرناتیڤی بزووتنەوەیەکی جەماوەری فراوان، تۆ ئەبێ تێزەکانـــت تێزی چەپت تێزی دیموکراتیت بۆ بزووتنـــەوەی جەماوەری بێت، نەك بۆ نوخبـــە بێت، نوخبە دەتوانێ گرووپێکـــی بچووکیش لەخۆی کۆ بکاتەوە، وایە لەبەر ئەوەی لەوەیا تێزەکانی ئێمە ئەتوانم بڵێم تێزی خەڵکی هەرە وشیارەکان بوون.

*** باشە ئێوە بە ئیعتبار گرووپێکی مارکسی بوون، هەرواش بووە خۆ زۆرتان لەسەر مارکســـییەت بەتایبەتی لینینزمتان خوێندۆتەوە و لینین بەروونی ئەوەی باس کردوە کە هەرچەندە رۆشنبیریش بی، بەڵام لە خەباتدا دەبێ بزووتنەوەیەکی جەماوەری بەرپا بکەیت، دەنا ناگەیتە ئامانجت؟**

- ئا، بەڵام ئەو بزووتنەوانەی ئێمە مەحکومە بە خەباتی چەکداری، بەدەســـتی تۆ نییە ئەو گرووپەی هەمان بووە و ئەو خەڵکانەی هەمان بوو، ئەگەر لە شار بووینانە، ئەمانتوانـــی بزووتنەوەی جۆرەها رەهەندی، بزووتنەوەی تێکۆشـــانی تر بدۆزینەوە، بەڵام تۆ کە لەناو خەباتی. چەکداری بووی، رێکخستنەکەشـــت خەباتی نهێنییە، تۆ مەحکومی بەخەباتی چەکداری و لەو چوارچێوەیە ئەبێ هەڵبســـوڕێی ناتوانی لەوە زیاتر هەڵبسوڕێی کە لە رێکخســـتنەکە دەچیتە دەرەوە رووبەڕووی جوتیار ئەبیتەوە، جووتیاریش زەحمەتە تێزی تۆ قبوڵ کات.

*** باشـــە، کاك مەلا بەختیار لەوەتەی هەیە و دەیناســـین، کەسێکی مارکسی بووە و ئینتیمایەکـــی زۆر مارکسییەتیشـــی کردووە، بەڵام قەت لەگەڵ حزبی شـــیوعی دۆســـت نەبووە، واتە هەمیشە رەخنەی لە حزبی شیوعی گرتووە، بەتایبەتی کە حزبی شـــیوعی وەکو بزووتنەوەیەکی شـــیوعی بە هەموو ســـلبیاتەکانیەوە، بەڵام خۆ دەکرا نەرمییەك، دۆستایەتییەکت لەگەڵ حزبی شیوعیش هەبێت، بەتایبەتی لە حەفتاکان و هەشتاکانیشدا هەتا کۆمەڵەش لەگەڵ حزبی شیوعی دۆست نەبوو؟**

- بـــۆ زانیارییەکەت وردی تێدا بەکاربێنی باشـــە، بۆ ئەوەی کـــە مێژوو بە هەڵە نەچێ لەو پەیوەندییەی کۆمەڵە و حزبی شـــیوعی، من وەڵامەکەت ئاوا دەدەمەوە کە من لەبـــاری ئایدیۆلۆژییەوە و لەباری بەرنامـــەوە ناکۆکییەکی زۆرم لەگەڵ حزبی شـــیوعی هەبووە و پێموانەبووە حزبی شـــیوعی، حزبێکی رادیکاڵ بوو‌بێت، حزبێکی چەپی شۆڕشـــگێر بووبێت لە پێناوی کرێکاران و زەحمەتکێشان، ئەمە جگە لەوەی لە تێگەیشتنیان بۆ دیموکراسی و پەیوەندییان لەگەڵ سۆڤییەت و ئەورووپای رۆژهەڵاتدا، ئەمە ســـەد جۆرە ئیشـــکالی تیایە و ئەو هاوپەیمانێتییە لەگەڵ حکومەتی عێراقی ئەوا جۆرەها نیگەرانی تێدایە، ئەمە بە نیســـبەت منەوە، بە نیسبەت کۆمەڵەوە، حزبی شیوعی لە ساڵی (١٩٧٩، ١٩٨٠) هاتە دەرەوە و شاخ، ساڵی ١٩٨١ کۆبوونەوەیەکمان کرد، ئێمە بڕیارماندا هاوپەیمانییەتێکی ستراتیژی لەگەڵ حزبی شیوعی و لە رێگەی حزبی شیوعییەوە هەوڵ بدەین لەباری سیاسییەوە ستراتیژیمان هەبێت، حزبی شیوعی خۆیانمان راســـپارد، کتابی رەسمیمان دانێ، نامەی رەسمیمان دانێ، کە ئەمە بگەیەنن بە یەکێتی ســـۆڤیەت، بەڵام نە یەکێتی ســـۆڤیەت وەڵامی دایەوە، نە حزبی شیوعی رێبازی ئێمەی قبوڵ بوو، ئێمەش ئامادە نەبووین بەراستی رێبازی خۆمان لە بۆتەی رێبازێکـــی وەکو حزبی شـــیوعی کە ئەزانین تەمەنێکی درێژ و شکســـتێکی زۆریان بەســـەرداهاتبوو بتوێنینەوە، ســـەرەنجامی ئەم رێبازە نە ئێمە ئامادە بووین تەسلیم بە ئیرادەی ئەوان بین، نە ئەوانیش ئامادەبوون هەموو شتەکانی ئێمە قبوڵ بکەن.

*** مەرج نییە، تەســـلیم بە یەکتری بی، بەڵام دۆســـتایەتییەکی وەکو ئەوەی چۆن لەنێوان حزبەکانی تر هەبوو، واتە مەبەســـتم ئەوەیە ئاگاتە ئەو رادەیەی رێکخستنەکان دژی حزبێکی تر هان بدرێن؟**

- (بەپێکەنینـــەوە) دڵـــداری بە دوولا ئەکرێ، بە یەکلا ناکـــرێ، ئێمە بڕیارمانداوە دۆســـتایەتیان بکەین، ئەوان بڕیاراندا بوو دۆستایەتی ئەو کاتەی (قیادەی موئەقەتە)

بکەن، ئەمە زۆر لێکی دوورخســـتینەوە. چـــی دەکەی کە ئەو حزبە خۆی بڕیاریداود، ئێمەش ناکۆکی قووڵی لە نێوانی ئێمە و برادەرانی پارتی کە ئەو کاتە بەناوی قیادەی موئەقەتە ئیشـــان ئەکرد هەبوو، خوێن کەوتبووە نێوانمانەوە، حزبی شـــیوعی کە هاتە دەرەوە، ئێمە یارمەتییەکی ئێجگار زۆرمان دان بەراســـتی، هیچ موشـــکیلەیەکیش لە نێوانماندا نەبوو، وەکو وتیشم بڕیارماندا دۆستایەتییەکی ستراتیژمان هەبێ لەگەڵیان، بەڵام زۆرتر سەنگەری دۆستایەتی پارتیان هەڵبژارد لەوەشا سەرپشك بوون.

*** باشە، دوای ئەوەی کاك بەختیار هەڵوێستی وەرگرتوو لە یەکێتی جیابووەوە ئەو گرفتانەی کە دواتر باسی دەکەین، یەك خاڵی زۆر گرنگ هەیە، بۆچی ئەو کاتە لە کاتی شـــەڕی ناوخۆ بەتایبەتی لە هێرشەکەی پشت ئاشان و قەرناقەو شەڕی بالیسان کە خەڵکێکی زۆر پێشـــمەرگەی هەردوولا تیایدا شەهید بوون و، بەراستی شەڕێك بوو هەر کارساتێك بوو بۆ خۆی، بۆ ئەوکاتە هەڵوێستی وەرنەگرت؟**

ـ پێنەگەیشـــتبوو، پێنەگەیشـــتبوو، واتە هەڵوێســـت وەرگرتن بۆ سەربەخۆبوونی ڕێبازێکی ئایدیۆلۆژی تەنها لەســـەر ڕووداوێـــك ڕوونادات، تەنانەت ئێمە لە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتیش پێم وایە پێنەگەیشـــتبوو، هەڵەیەکـــی گەورەیە ڕووداوێك بکەی بەهۆی جیابوونەوە..

*** ئاخر ڕووداوێکی زۆر گەورەبوو؟**

ـ لەوەش گەورەتربوایە هێشتا پێی نەئەگەیاند، دەریشکەوت ئەوە شەڕی پشت ئاشان تەواو بوو، یەکێتی و حیزبی شـــیوعی ئاشتبوونەوە، ئەوە هۆیەکانیش نەمان، پارتی و یەکێتیش ئاشتبوونەوە.

***باشە بەڕێزت ئەو هەڵوێستە شۆڕشگێڕانەت هەبوو، کەچی کە یەکێتی کە لەگەڵ حکومەتدا کەوتە گفتوگۆوە، بەڕێزت ڕۆڵێکت لە گفتوگۆکە بینی، چەند جاریش بۆ بەغدا چووی، وابزانم بۆ دەرەوەش چووی؟**

ـ بەڵێ وایە..

*** هەتا ئەڵێن ئەوکاتە، جەنابت گوتبووت: (گووشینی موفاوەزات تا دواچۆڕی) وەك کاك نەوشیروان وا ئەڵێ، مانای ئەوەیە تۆ ڕۆڵێکی وات بینی، کە خەڵك بێت بۆ ناو یەکێتی و پاســاوت بۆ ئەومفاوەزاتەت دەکرد کە شتێکیان دەست دەکەوێ یەکێتی شــتێکی باش دەکا، کەچی دوایی کە جیابوونەوە، هەمــوو ئەو موفاوەزاتەت تەواو خستە ژێر پێتەوە، واتا تەواو نەفیت کردەوەو سڕیتەوە، واتا لە ماوەی ساڵێکدا تەقریبەن دوو هەڵوێستی زۆر..؟**

-ئەمەشــیان وا نییە، جا ئیجازە بدە با ئەوەت بۆ روون بکەمەوە، وەك چۆن لەسەر مەسەلەی شــەڕی قەرناقەو پشت ئاشان و شــەڕی ناوخۆو کە خۆت دەزانی ئێمە لەبەر ئەوە وەکو من روونم کردەوە بڕیاری یەکلاکردنەوەی کێشەکانمان نەدا، بەڵام خۆ هەموو کەسێك دەزانێ شەڕی قەرناقەو پشت ئاشان بەو ئاراستەی کە بۆی رۆیشت، من نیگەران بووم لەو شەڕەو، لە سنووری مەڵبەندی یەك کە من بەرپرسی سنووری مەڵبەندی یەك بووم، رێککەوتنمان هەبوو لەگەڵ حیزبی شــیوعی، رێککەوتنەکەش بەدەست پێشخەری ئێمەکرا، نەك بەهادین نوری، بەراستی کاك بەهادین نوری.....

*** ئەگەر یەك کەوانەم بدەیتێ؟**

- ئیجازە بدەی با قســەکانم بکــەم، کاك بەهادین نوری لەگەڵ رژێم بۆ مێژووی، بە هەڵە باســی ئەوە ئەکا کە گوایە ئەو تەئسیری لە ئێمە کردبێ، بێگومان هەموو شــایەدەکان زیندوون، کاك سالار زیندووە، کاك مەلا عەلی ئەوکاتە ئەندامی هەرێمی حیزبی شــیوعی بــوو لەوێ بوو، لەنێوانمــان بوو، من ئەوم ناردووەو ئێســتاش لە ســلێمانییەو ئەگەر بتوانن چاوپێکەوتنی لەگەڵ بکەن، مامۆستا بەهادین نوری لە راستیدا تەئسیری لەسەر حیزبەکەی خۆشی نەبوو، نەك حیزبەکەی ئێمە، چونکە ئێمە هەموو شــتەکانمان ئەبیســت لە خۆیانا، ئەم سیاسەتەی ئەو ئەیگرتە بەر (٨٠٪)ی حیزبی شــیوعی قبووڵی نەبوو هەر لە هەرێمەکەی ئــەو لێی بەرپرس بوو، من بە چاوی خۆم ئەمبینی و بەزانیاری ورد ئەمزانی کە مامۆســتا بەهادین نوری لەناو حیزبەکەی خۆیدا تەئسیری لەسەر (٨٠٪)ی ئەندامان و کادیرانی نییە، چۆن دەتوانێ تەئسیر لە مەڵبەندێك بکات کە مەڵبەندەکەی ئێمە، هێزەکەی ئێمە، جەماوەری ئێمە، پەنجا بەقەد حیزبی شــیوعی بووە، لەبەر ئەوە دەستنیشــانکردنی ئێمە بۆ ئەو شەڕە ئێمە پێمان وابووە ئەو شەڕە لەگەڵ حزبی شیوعی باش نییە، ئەوە لەوێ، دێیتە سەر

مەلەسەی گفتوگۆ، من بەش بەحاڵی خۆم لەباری تەکتیکیەوە، هەرگیز گفتوگۆم رەتنەکردۆتەوە، ئێستاش و لەئایندەش هەتا ئەو رۆژەی سەدامیش رووخاوە لەباردی تەکتیکیەوە، ئێمەو سەدام گفتوگۆمان رەتنەکردۆتەوە هەروەکو..

*** رەتکردنەوە تۆزێك جیاوازە لەگەڵ ئەوەی گەرموگوڕ بی بۆ کارەکە؟**

ـ ئیجازە بدە با ئەوەش روونکەینەوە، تا ئەو سەعاتەی سەدام رووخاوە، بەرپرسانی حکومەتی عێراق هاتبێ بۆ گفتوگۆ، ئێمە نەمانوتووە نایکەین، مەرجەکانی خۆمان وتووە، باشە، نەك هەر ئێمە پارتیش هەروا بووە، کە گفتوگۆیەکی نهێنی لە بەینی ئێمە و عێراق پەیدابوو شەهید د. قاسملو لەنێوانمان بوو، حکومەتیش ئامادەیی نیشاندا داخوازییەکانمان قبووڵ بکات، بێگومان ناڵێین نا، منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی ئەو کاتە نەمگوتووە نا. بەڵام یەکەم دانیشتنمان کە چووینەتە بەغدا لەدوای چەندین دانیشتن کە ئەوکاتە (تارق عەزیز) سەرۆکایەتی وەفدی حکومەتی عێراقی ئەکردو جەنابی مام جەلال سەرۆکایەتی وەفدی ئێمەی ئەکرد، یەکەم دانیشتن و لەدوای چەندین دانیشتن لەگەڵیان، هاتینە دەرەوە، من لەبیرمە جەنابی مام جەلال منی بردە دەرەوە لە باخچەی میوانخانەکە گفتوگۆیەکمان کردو گوتی پرسیارێکت لێ ئەکەم، لەدوای ئەم دانیشتنە رات چییە، وتم مام جەلال ئەم حکومەتە هیچمان ناداتێ، هەموو مانۆڕە بۆ ئەوەی کە دەستی بەدەستیمان پێ بکەن. وتی ئەی چی بکەین، وتم هیچ، چونکە ناشکرێ بڵێین ئێستا دەچینەوە کوردستان و بڵێن خواحافیز. دەبێ لەگەڵی ئیدامە بدەین بەم حاڵەتە، هێزەکانمان بپارێزین، رێکخستنەکانمان بەهێز بکەین، ئەوەی کە لە گفتوگۆدا بەدەستمان دەکەوێ، جەماوەری خۆمان بەهێز بکەین، خۆمان ئامادە بکەین بۆ ئاینده، لە سیاسەتدا. ناکرێ تۆ رۆژێك بڕیاربدەین و بەیانی خواحافیزی لێ بکەین. ئەمە کاری یاری منداڵانی کۆڵانە، یاری خەڵکی بەرپرس نییە لە دونیای سیاسەتدا، بەڵێ من وتومە هەتا ئەو ساتەی لەناو میللەتەکەمان، لەناو هێزەکان، لەناو رای گشتی ئیسپاتی ئەکەین ئێمە نین کە نامانەوێ رێککەوتن ئیمزا بکەین، ئەم ئۆباڵە ئەخەینە سەر حکومەتی عێراقی، دەبێ ئێمە درێژە بە گفتوگۆ بدەین، بەڵام بەوپەڕی ورییاییەوە ئاگامان لێی بێ و دڵنیاش بین ئەم حکومەتە هیچمان ناداتێ..

*** بەڵام لە پرۆســەی ئەم وتوێژە وا لەخەڵــك نەدەگەیەنرا، بەڵکو دەیانگوت (٥/١) دەقی ڕێککەوتنەکە ڕادەگەیەنــرێ، دوایی دەوترا (٧/١٢) ڕادەگەیەنرێ، هەر جارەی ڕۆژێك دیاری دەکرا، گوایە ڕێککەوتننامەکە دەیانگوت ڕادەگەیەنرێ؟**

ــــ هەموو جارێ ڕژێمی عێراق دەیانگــوت، ئێمە ڕێکدەکەوین، ئاخرجار جەنابی مام جەلال سەرکردایەتی وەفدی ئێمەی ئەکرد، ڕێککەوتنەکە تەواوببوو وە بڕیاربوو بچن بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی (مەجلســی وەتەنی) ڕێککەوتنامەکە مۆرکەن، حکومەتی تورکی شەو تەلەفۆنی کردبــوو، وتبووی هەموو شــتێك ئەکەین بۆ دژی ئەم ڕێکەوتنــەی ئێوە، وا ئەکەین دۆخی حکومەتی عێراق خراپ بێت بەرامبەر بەئێران لە شــەڕدا، هەر ئەو ڕۆژەی کە بڕیاربوو ئەو سەعاتەی کە بڕیاربوو ڕێککەوتنەکە ئیمزا بکرێ، حکومەتی عێراق پاشگەزبووەوە.

*** کەواتە ئەوە ڕاستە کە گوتبووت تا دواچرکە؟**

ـ ڕاستە، بەڵێ ڕاستە، هیچ نکۆڵیم لێی نییە..

*** بەڵام دوای ئەو بەیاننامانەو ئەو بڵاوکراوانەی کە لەناو ئاڵای شــۆڕش دەردەچوو، زۆر بە توندی لەسەر ئەو گفتوگۆیە قسەی دەکرد، وەك ئەوەی کارێکی زۆر خراپی بۆ کرا؟**

ـ نا، وامان نەوتووە، ئێمە لەناو ئاڵای شۆڕشــدا بەراســتی با لە بیرت نەچێ، ئێمە دوو بۆچوونی جیاوازمان هەبوو، بۆچوونێك من خستمەڕوو. دوای...

*** دوایی باسی ئاڵای شۆڕش دەکەین، مەبەستم ئەم خاڵە بوو؟**

ـ ئاخر بۆ ئەوەی مەســەلەی گفتوگۆ ئەوانە بۆچوونێك بوو من پێم ڕاســت بوو، ئەمگوت بەهیچ شــێوەیەك نابێ لەناو یەکێتی نیشــتمانی کوردســتان بچینە دەرەوە و، هەتا یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش لەگەڵ حکومەتی عێراقی نەگاتە دوائەنجام، ئێمە نابێ بەجیابوونەوە یەکێتی لەبەرامبەر ڕژێمی عێراقدا لاواز بکەین. من ســەرکردایەتی ڕێکخســتنی ناو وڵاتم وەرگــرت، خەڵکەکــە هەمووی هاتن بۆ لای من و گوێیان لەمن دەگرت، من ئەو قســەیەم ئەکرد. ئێمە لێژنەیەکی بچووکمان هەبوو، ئەوکاتە دائەنیشتین لەسەری، ئەوسا قسەمان ئەکرد و ئەیانــوت، یەکێتی زۆر ڕۆیشــتووە لەگەڵ حکومەت، با ئێمە بڕیــاری جیابوونەوە بدەین، دەموت ئەوە گەورەترین عەیبەی مێژوویی دێنێتە سەرخۆمان و، نابێ ئێمە لەبەرامبەر ڕژێمی عێراق ســەنگی یەکێتی لاواز بکەین، ئەمە لەباری نیشتمانی و نەتەوەییەوە بۆ ئێمە عەیبە. عەیبەیەکی گەورەیە، ڕاستە لەباری ئایدیۆلۆژییەوە بۆ ئێمە باشە، بەڵام لەباری مەسئولیەتی نیشتمانی و مەسئولیەتی نەتەوەیی عەیبێکی گەورەیە، ئەوە هەموو جارێك ڕێکخستنەکانمان فشــاری ئەهێنا کە ئێمــە دوابڕیار بدەین، هەموو جارێك مــن بەربەرەچم ئەدانەوەو ئەمگوت یەکێتی نیشــتمانی لەدوا لێکدانەوەی بەشێکە لە سەنگەری نەتەوەکەمان. ئێمە ئەگەر جیاش

ببینەوە، خۆ نابێ پاڵی پێوە بنێین تاکو حکومەتی عێراق زۆرتر سواری کۆڵی بێت.

*** باشــە دەتوانین بڵێین ئاڵای شۆڕش بۆیە دوای موفاوەزاتەکە خۆی راگەیاند لەبەرئەو هۆکاربوو کە باستکرد؟**

ـ لە هەقیقەتدا گفتوگۆی نێوان یەکێتی و حکومەت لەدوای ســاڵ و نیوێك تا دووســاڵ لە ململانێی فیکری و ئایدیۆلۆژی نێوان ئێمەو ناو کۆمەڵە ئینجا هاتۆتە پێشــەوە، یەکێکە لە وێستگە سیاســییەکان، ئەوە مومکین بوو گفتوگۆیەکە هەر نەکرێ. بەڵام ئەو ململانێیە هەر بمێنێ..ناکرێ موفاوەزات بە پاڵنەری سەرەکی هەموو کێشەکان و هەموو ناکۆکییەکان و هەموو بڕیارەکانی بزانرێ، ئەمە هەڵەیە لەباری زانستی مێژووییەوە بەراستی.

*** باشــە کاك بەختیار، بیرۆکەی ئاڵای شۆڕش سەرەتا لەلایەن کامە سەرکردایەتییەوە یا لەلایەن کادیرێکەوە دروست بووە، ئیتر جیابوونەوە؟**

ـ ناوی ئاڵای شــۆڕش من دامنا، وەکو (ناو)، بەڵام وەکو ململانێ کۆمەڵێ خەڵك بووین، یەك و دوو نەبووین.

*** سەرکردایەتی و خوار سەرکردایەتی؟ یان بەس سەرکردایەتی؟**

ـ خوارو سەرەوەی، واتە سەرکردایەتی..

*** باشــە بۆچی ئاڵای شــۆڕش ئەوکاتە بەنــاوی عێراقچێتی بوو، دەبوایــە ئێوە زیاتر کوردســتانیەت بکەنە هەوێنی رەوتەکەتان، کەچی ئێوە بەناوی عێراقچێتی قســەتان لەسەر دەکرد؟**

ـ من نکۆڵی لەوە ناکەم، کە لەناو ئێمە هەبوو تێزەکانی وا دەخســتنەڕوو کە زۆرتر مۆرکی عێراقچێتــی پێوە بێ، ئەگەرچی خۆیشــی عێراقچی نەبوویێت، نکۆڵــی لەوە ناکەم، بەڵام ئەتوانم پێ لەســەر ئەوە دابگرم کە ئێمە وەك ئاڵای شــۆڕش لەگەڵ دروستکردنی حیزبێکی سەرانســەری عێراق نەبوویــن، ئەمە یەك، دووەم ئەتوانم بە یەقینەوە بڵێم نە ئەوکاتە کەســم لەخۆمم پێ کوردستانیتر بووە. نە ئێستاش ئەوەندە عێراقچیم..

*** بەڵام ئەوکاتە وا بڵاوکرایەوە؟**

ـ سروشتییە.

*** هەڵوێست نەبوو، ئەوکات بۆچی وا بەرەو ئەو عێراقچێتییە بچێ؟**

ـ دەزانی ئێمە ئەوکاتە سیاســەتەکەمان، بیروباوەڕەکەمان وابوو کە مەسەلەی کورد بەشێکە لە مەســەلە دیموکراتێکەی ئێستای عێراق، پێم وانییە قسەی ئێمە بەحەڵەدا چووبــێ لەم بارەیەوە. لەهەر چییەکدا بەهەڵــەدا چووبین، لەمەیاندا رێك وەکو خۆی هێناومانەتەوە..

*** باشە ئاڵای شۆڕش، بە گورو تینێکی زۆرەوە کە دروستبوو، لە یەکێتی جیابووەوە، کەچی دوای ماوەیەکی زۆر کورت کوژایەوە، ئاسەواریشی وەك دەڵێن نەما، هەتا دوای راپەڕینیش کە جەنابت ماوەیەك بووژاندتەوە، بەڵام نەتتوانی لە دوای راپەڕینیش ببێتە بزووتنەوەیەکی جەماوەری، یان هەتا لە ناوەندی رۆشنبیریش خەڵکێك هەبوو، بەڵام ئەوە نەبوو کە ئاڵای شۆڕش وەك یەکەمجار بۆی جیابۆوە کە دەیویست لەناو یەکێتی وەك بڵێی هەموو کادیرانی یەکێتی بۆ لای خۆی رابکێشـــێ وای روونبکاتەوە کە ئەوەی ئەو راسترە؟**

ــــ من نازانم، تۆ ئامارت لایە؟ ئامارت لا نییــــە، ئێمە لە دوای کۆبوونەی فراوان کە رێکەوتووین لیســـتێکمان لەگــەڵ یەکێتی ئاڵوگۆڕکرد. زیاتــر لە (٧٠٠)کادرو ئەندامان هەبوو، کە ئێمە گفتوگۆمان لەگەڵ یەکێتی کردو یەکترمان گرتەوە لەگەڵ یەکێتی، (٧٠٠) بەس کادرو ئەنــدام، هیچ ئۆرگانێك لە ئۆرگانەکانی یەکێتی نەما لە سەرکردایەتیەوە بۆ خوارەوە ئێمە نوێنەرمان نەبێ، بۆ مەڵبەندەکان، بۆ مەکتەبەکان، هەتا بۆ بەشــی عەســکەری و دارایی، بۆ راگەیاندن، بۆ کۆمیتەکان، بۆ هەموویان ئێمە لیستێکمان هەبوو، من خۆم یەکە یەکە لەگەڵ هەموو مەڵبەندەکان و کۆمیتەکان رۆیشتم و هەموو ئەو لیستەم پێشکەش کردو جێبەجێمکرد.

*** خۆ ئەو لیستەش وەکو لیستەکانی ئێستا نەبوو، بن دیواری زۆربێ؟**

ـ مەعلومە ئێســتاش کادیرەکانی کۆنی ئاڵای شۆڕش ئاگادارن کە لەناو یەکێتیدا رۆڵی خۆیان چۆن دەگێڕن کێن و کێ نین.....

*** چونکە لیســـتەکانی هەموو حیزبەکان کاتێ پرسی یەکگرتن دێتە ئاراوە، لیستی وەهمی، پیاهەڵگوتن بەخۆیان دێتە ئارا، ئێستاش زۆر ئەوە هەیە، هی هەموو ئەحزابەکان، یەعنی چونکە لەراســتیدا لیستەکانی ئێســتا دوورە لەراستی، هی هەموو حیزبەکان پیاهەڵگوتنی پێوە زۆرە.**

- بەڵێ دەزانم، هەندێك لەو لیســـتانەی کە لەدوای ئێمە بە لیســـتی وەهمی هاتنە پێشـــەوە. مانگێکی نەبرد، هەم بۆ یەکێتی و هەم بۆ پارتی دەرکەوت کە ئەم لیستانە چەند وەهمین. بەڵام ئێمە کادیرەکانمان ئێستاش ئەوە هەموو مەکتەبەکان، ئەوە هەموو مەڵبەندەکان، ئەوە هەموو ئۆرگانەکانی یەکێتی، ئێســـتاش، وەرە بگەڕێ بزانە چەند کادیری ئاڵای شۆڕشـــی تێدابووە کاتی خۆی، ئەوە لە مەکتەبی سیاسی، ئێستا ئێمە دووانمان لە مەکتەبی سیاسین..

*** باشە، کاك بەختیار بەر لەوەی چەکدار بێنە سەرت، لە شەوی (٢- ١٩٨٥/١١/١) لە گوندی تەکیە، پشــکۆ نەجمەدین و شێخ عەلی و ئەوانیتر کە گیران، تۆ پێشبینی ئەوەت نەکرد تۆش دەگیرێی، خۆ تۆ لەوان زیاتر نەبووی، هیچ چارەسەرێکت بۆ خۆت نەکرد، بۆ ئەوەی تووشی ئەو گرفتە نەبیت.**

ـ بەڵێ، یەکەم مامۆستا پشکۆ لەگەڵ خۆم بوو.

*** لەکاتی گرتنەکە؟**

ـ بەڵێ لەکاتی گرتنەکە لەگەڵ خۆم بوو، دووهەم بەپێچەوانەوە کاتێك کە بڕیارماندا بچین بۆ قەرەداغ، بێگومان ئێمە نزیکی مەرزی ئێران بووین، نزیك بووین، لە مەرزەوە ئێمە چووین بۆ قووڵایی هێزەکانی یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان، من پێموایە ئەگەر مێژوونووســێك جوان مێژوو بنووســێ، باش باش ئەزانێ من بایی ئەوەندە ئەزموونم هەبووە لەوە تێبگەم مەرز بەجێهێشتن و چوون بۆ قووڵایی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان خەتەرەکانی چەندە. من مەلا بەختیار بووم، کادیرێکی ئاسایی نەبووم، باشە لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانویست بە سەرکردایەتی یەکێتی و بە هەموو لایەك بڵێین کە ئێمە نامانەوێ بەراستی لەباری عەسکەرییەوە جیاببینەوە، چۆن تۆ ئەم ئاماژەیە بە یەکێتی ئەڵێی بچیتە سەر مەرز لە خۆیەوە. ئۆتۆماتیك جیابیتەوە، جیابووینەوە، یەعنی چی، یەعنی ئەبێ بچتە ئێران، یان ئەبێ بچیتە ناو (جود).

*** ببی بە دوژمن؟**

ـــ من لەگەڵ هاوڕێکانی خۆشـــم چوونە ناو ئێران و چوونە نـــاو جودم موتڵەقەن ڕەتکردەوە..

*** بەڵام دوایی هەر چوونە ناو جود؟**

ـ نەچووین..

*** چوونە ناو سنووری ئەوان؟**

ـ ئەوە جیایە، دوای لێقەومان ئەمە جیایە، پێش لێقەومان نەچوونە ناو جودم قبووڵ کردووە، بێگومان پێش ئەوەی ئێمە ئەوە رابگەیەنین جود داوایان کرد ئێمە بچینە ناویان، من قبووڵم نەکرد. تەشـــکیلاتی ناوخۆ قبووڵیـــان نەکرد، ئەوەمان ڕەتکردەوە، بزانە لێرە مەسەلەکان دوو شـــتن، یەکێکی ئەوەیە چارەنووسی ئێمەیە وەکو شەخس، دووەمیشی ئەوەیە ئەرکە نیشتمانییەکانە، ئایا ئێمە ئەگەر بچووینەتایە ناو جود و بچووینەتایە ناو ئێران چی دەبوو، بێگومان ئەمەی خوارەوە بوو بە تەسەووری من:

یەکـــەم:- تۆ دەبـــێ هەندێ لە مەرجەکانی ئێران قبووڵ بکـــەی، وەکو جود قبووڵی نەکرد.

دووەم: هەندێك لە مەرجەکانی جود قبووڵ بکەی وەك چۆن پاسۆك و حیزبی شیوعی و حیزبی سۆسیالیست قبووڵی دەکرد، وایە؟!

ســێیەم: کە ئـــەو مەرجانەت قبووڵکرد، ماوەیەکی کەمیش بـــێ، ئێمە ئەبوو لەگەڵ یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان تووشی شەڕ ببین، من ئەمانەم هەمووی پێ خەتەر بوو. بەهیچ شێوەیەك ئەمانەم قبووڵم نەبوو، لەبەرامبەر ئەمەدا چی روویدا، لەبەرامبەر ئەمە کارەساتێك بەرامبەر بە ئێمە روویدا، وا نیە؟، من تەحەمولکردنی کارەساتەکە بۆ مێژوو پێم زۆر زۆر پێ باشـــترە، لە تەحەمولکردنی کارەســـاتی شەڕکردن لە گەڵ یەکێتی و چوونە پاڵ ئێران و چوونە ناو جود ئێستاش بۆ مێژوو ئەوە ئەڵێم.

*** بەڵام ئەو کاتەی کە تۆ ســـەرکردایەتی بووی لەناو یەکێتی، یەکێتی خۆی دایە پاڵ ئێران لە شەڕی ناوخۆ و تۆ هیچ هەڵوێستت نەبوو؟**

- ئەوە جیایە، ئەوە جیایە. نا، یەکێتی کاتی خۆی کە شەڕیشـــی لەگەڵ ئێران کرد من قبووڵم نەبوو.

*** باشە با بگەڕێینەوە سەر.....**

- یەکێتی کە شەڕی لەگەڵ ئێرانیش کرد، وتم وەك پرەنسیپ قبووڵم نییە، بەڵام وەکو پێشمەرگە پێشمەرگەم.

*** باشـــە کاك بەختیـــار کە هەڵوێســـتت بەرامبەر یەکێتی ئاوابـــووە، یەعنی هیچ گرفتێکی تیا نەبووە، ئەی چۆن دەڵێن لەماڵەکەت کە دوایی گیرای، دەستیان بەسەر ماڵەکەت داگرت، چەندین بڵاوکراوەی تێدابـــوو لە ماڵەکەت. هەمووی جنێونامە بوو بۆ یەکێتی.**

- جنێونامە نەبوو، یەکەمین ژمارەی ئاڵای شۆڕش بوو.

*** ئەمە وابزانم قسەی کاك نەوشیروانە کە من دەیڵێم؟**

- ئێستاش ماوە، ئەگەر یەك جنێوی تیابوو من تەحەمولی مەسئولیەتی هەرچی جنێو هەیە لە مێژووی کورددا ئەیکەم، ئەوە یەکەمین ژمارەی ئاڵای شۆڕش بوو، ئۆرگانی ئاڵای شـــۆڕش کە دەرمانکرد، ئەگەر یەك جنێوی تیابوو، من تەحەمولی مەسئولیەتی هەرچی جنێو هەیە، یەعنی هەرچی جنێو هەیە، ئێمە دامانهێناوە. بە پێچەوانەوە، ئێمە لە هەموو ئەدەبیاتی خۆماندا (ئاڵای شۆڕش) یەك جنێومان بەکەس نەداوە.

*** باشــە ئەی چۆن ئەو شــتانەی کە نووسراوە لە ســەرت لەو یاداشتانەی کاك نەوشــیروان هیچ وەڵامێکت نەبوو، لەکاتێکدا ئەوانە هەمووی زۆر بە سلبی لەسەرت نووسرابوو؟**

ـ لە وەڵامەکەی ســەید کاکە لە شــەش شــوێن وەڵامم داوەتەوە، لەشەش شوێندا وەڵامی کاك نەوشــیروانم داوەتەوە. وە لە ســیاقی وەڵامەکەشدا، زۆر شت هەیە بە پێچەوانەی یاداشتەکەی کاك نەوشیروانە، بەڵام جارێ من یاداشتی خۆم نەنووسیوە، تا تا بە درێژی و بە وردی وەڵام بدەمەوە..

*** دامنابوو ئەوەت لێ بپرســم، بــەڵام وا بابەتەکە خۆی هاتــە پێش، بەتەمای یاداشتیشت بنووسی یان هێشتا؟**

ـ بێگومان..

*** چونکە ئەزموونێکی سەیرت هەیە!!!**

-ئەگــەر تەمەنــم بەبەریــەوە مابــێ و دوو ســەیارەی تــرم پیــا نەتەقێنن، بێگومان..(بەپێکەنینەوە)

*** ئەگەر زۆر نەچیتە بەغدا؟**

-بەغدا نا، من لە سلێمانی سەیارمیان پیا تەقاندمەوە..

*** باشــە کاك مــەلا بەختیار ئەوکاتــەی کە تۆ گیرای، ســکرتێری کۆمەڵەی رەنجدەرانی ئەو کاتە کاك نەوشــیروان بوو، ســکرتێری یەکێتی نیشتمانی مام جەلال بوو، ئەوانە لە بەندیخانە هاتنە لات قسەت لەگەڵ بکەن و بڵێن گرفتەکانت هۆکاری جیابوونەوەو شتی لەم بابەتە. یا هەر پرس و رایەکیان لەگەڵ نەکردی، یا هەر تەنها لە رێگەی خەڵکی دیکەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردی؟**

-یەکەمین جار کە منیان برد بۆ سەرکردایەتی، جەنابی مام جەلالم بینی و لەسەر هەموو شتەکانیش قســەمان کرد، دوای ماوەیەك لە زیندان کاك نەوشیروان هات بۆ لام، کاك کۆســرەت هات بۆ لام، قادری حاجی عەلی هات بۆ لام، ئەو بەرپرســانە هاتن بۆ لام. هەروەها کاك حەمە تۆفیق هات بۆ لام، کاك د. خەســرەو خاڵ ئەهات بۆ لام، ئەمانە ئەهاتن بۆ لام.

*** باشـــە ئەی چۆن ئازادیان نەکردی، با بڵێین لە ڕێگای هەموو ئەوانە هەمووت بینی و قسەت لەگەڵ کردن و نەك هەر ئازادیان نەکردی، بەڵکو لە بەندیخانە ئەڵێن زۆر ئازارو ئەشکەنجەش درای؟**

-لە هەقیقەتدا ئازارو ئەشـــکەنجەی جەستەیی وانەبوو، ناڵێم هەر نەبوو، بەڵام بەو جۆرە نەبوو کە ئێوە، یا ئەوەی خەڵك بیستوویەتی.

*** واتا هەبوو، بەڵام کەم بوو؟**

- کەم بوو، بەڵێ..

*** باشـــە کە ئەوان ئەهاتنە لات، باســـی کەمی ئەو ئـــازارەت لەگەڵیان نەدەکرد، ئەشکەنجەکەت؟**

- نا، هیچ پێویستی نەئەکرد.

*** یانی هەڵوێستت لە بەندیخانەش هەر شۆڕشگێڕانەبووە؟**

- نا، مەسەلەکە شۆڕشگێڕانە نەبووە، چونکە هەندێك لەو شتانە لەو حاڵەتانە بوو، ئەوەنـــدەی من بزانم هەندێك لەو حاڵەتانە پەیوەندیی بـــە بڕیاری ئەوانەوە نەبوو، بە هەڵسوکەوتی خراپی هەندێك لە مەسئولی زیندانەکان و ئەوانەبوو..

*** باشـــە ئەوان کە دەهاتنەلات بە گرتنەکەی تۆ دڵگران نەبوون؟ واتا دڵگران ببن کە تۆ گیراوی؟**

- لە خۆیان بپرسی باشترە..

*** نا، وەکو خوێندنەوەی خۆت؟**

- لەخۆیان بپرســـی باشترە، چونکە ئەمە بەشێکە لە مێژوو، لایەکی منم، لایەکی ئەوانن. لەوان بپرسی، ئەوەندەی من بزانم بەشی زۆری مەسئولەکانی یەکێتی ئەوەیان پێ ناخۆش بوو..

*** باشـــە کاك بەختیار، دەکرێ لە هەڵوەشـــانەوەی ئاڵای شۆڕش بدوێی، چونکە ئـــاڵای شـــۆڕش هەر ئەو کاتەی کە تـــۆ گیرای، بـــە هەلومەرجێکی زۆر خراپ تێپەڕبوو، ئاڵۆزی تێدا بـــوو، دەکرێ بەر لەوەی ئێوە بێنەوە ناو یەکێتی بڵێین ئاڵای شۆڕش نەمابوو؟**

- نا، ناتوانی وا بڵێی، ئاڵای شـــۆڕش، ئەوەی تۆ ئەڵێی ڕاستە ئاڵۆزی تێکەوت، خەڵکـــی کەم ئەزموون ئاڵای شۆڕشـــیان دووچاری کێشـــەو گرفتـــی زۆرکرد کە

دەیانتوانی ئەو کێشــەو بێشەی بۆ دروســت نەکەن، بەڵام دوای ئەوەی من فریای کەوتمــەوە، وردە وردە گرتمانەوە، کە هاتینەوە ناو کوردســتان لەدوای راپەڕین، ئێمە توانیمان شیرازەکانی رێکخســتنی خۆمان کۆبکەینەوەو خەڵکێکی باشیش لەدەوری خۆمان کۆبکەینەوە، واتا ئاڵای شــۆڕش ببوو بە یەکێك لە رەقەمی هێزە چەپەکانی کوردستان.

*** لە رووی فکرییەوە یا لە رووی ژمارەوە؟**

- لە رووی ژمارەشەوە، لە رووی ژمارەوە ئێمە رێکخستنمان لە هەولێر، رێکخستنمان لە ســلێمانی، رێکخستنمان لە گەرمیان، رێکخستنمان لە هەڵەبجە، رێکخستنمان لە شارو شــارۆچکەکانی تر لە رانیە، لە شەقڵاوە، بە نهێنی لە خانەقین، بە نهێنی لە بەغدا، رێکخســتنمان لە ناوچەی بادینان تا رادەیەك، رێکخســتنمان لەم شوێنانە لە هەمووی هەبووە، وردە وردە فراوان دەبووین، ئێمە..

*** باشــە دەڵێن کە لەبەندیخانە دەرچوویت و لەگەڵ روناکی ئەو کاتە خێزانت بوو، یا دەســگیرانت بوو، چوونە شاخ لە ژمارە (٦)ی کۆمەڵە وتارێکت نووسی بەناوی باوکی ئاوارە وا بزانم، هێرشــت کردبووە سەر دوو لەو سەرکردانەی کۆمەڵە کە دوایی شەهید بوون؟**

- نا، هێرش لەســەر ســەرکردایەتی نەبوو، بەڵێ وتارێکم هەیــە بەناوی باوکی ئاوارە..

*** دوای وەڵامت درایەوە.**

- بەڵــێ وتارێکم هەبوو بەناوی باوکی ئاوارە، لەژمارە (٢)ی ئۆرگانی کۆمەڵە، لەوێدا من رەخنە لەو هەڵەیە ئەگرم کە سەرکردایەتی کۆمەڵە کوردستانیان بەجێهێشت و چوون لە رێگای ئێرانەوە بچن بۆ ســوریا، لەکاتێکدا بڕیارەکە لەگەڵ دەســتەی دامەزرێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان و جەنابی مام جەلال وابوو کە هەر چییەك ئەقەومێ لە رێکخستنەکانی ناو وڵات نابێ بچنە دەرەوە، بگرە بە پێچەوانەوە، ئەبێ بچنە شــاخ و مەفرەزە دروســت بکەن و خۆیان ئامادەکەن تا دەستەی دامەزرێنەری دەرەوەی وڵاتیــش دێتەوە بۆ ناو کوردســتان، من رەخنەم لەو هەڵوێســتە گرت، وتم ئەزموونی ئێمەی کۆمیتەی هەرێمەکان ســەلماندی کە ئەکرا سەرکردایەتی کۆمەڵە نەڕواو لە ناو وڵات بمێنێتەوە، وەکو چۆن ئێمە (من و شــەهید ئارام و شــەهید ئازاد

هەورامی و شەهید عەبدولڕەزاق و کاك سالار) توانیمان بمێنینەوەو سەرکردایەتی کۆمەڵەش بکەین و بناغەی شۆڕشی نوێش دابنێین..

*** باشە تۆ لەو کاتەوەی لە کۆمەڵە بووی، واتە هەر لە ساڵانی حەفتاکانیشەوە هەر لەگەڵ کاك نەوشیروانا ناکۆك بووی وەك ئێستا...؟! ئەوەی کتێبەکانی کاك نەوشیروان بخوێنێتەوە، ئەزانێ هەڵوێستی بەرامبەر جەنابتان چۆن بووە، واتا ئەوکاتیش هەر جیاوازییەکان ئەوها ڕەنگی دابووەوە، یان بەو دواییە تۆخ بوو؟**

- یەکەمین جار، یەکەمین چرکەساتی مێژوویی کە کاك نەوشیروانم دیبێ و ناسیبێ ١٩٧٧/٧/٢٠ بووە، حەوت ساڵ پێش ئەوەش کە کۆمەڵە دامەزراوە ناوێکم ئەزانی کە سەرنووسەری گۆڤاری رزگاری بووە قەڵەمێکی کوردی جوانی هەبووە، وتاری جوانی نووسیوە، کە ناوی (نەوشیروان مستەفا ئەمین)ە فەقەت ئەوەندەم ناسیووە.

*** ئەی ئەو جیاوازیانە؟**

- لەدوای ١٩٧٧/٧/٢٠ کە یەکەمین جار (نەوشیروان)م بینی، ئەتوانم بڵێم بەڵێ لە یەکەمین دانیشتنمانەوە جۆرێك لەجیاوازی بیرکردنەوە لە نێوانماندا هەبوو، ئەو بە ئەزموونتر بوو لەئێمەو دونیای سیاسەتی بە جۆرێك ئەبینی، ئێمەش کۆمەڵەبووین دنیای سیاسەت و ئایدیۆلۆژیمان بە جۆرێکی دیکە ئەبینی، واتا ئەتوانم بڵێم لەیەکەم دانیشتن و کۆبوونەوەماندا چەندمان پێ گرنگ بوو کاك نەوشیروان بێتە ناو کۆمەڵە، ئەوەندەش لەناو خۆماندا جیاوازی بیرکردنەوەمان دەرك پێ ئەکرد لەگەڵ یەکتردا، نەك هەر من، بەڵکو باقی برادەرانی کۆمەڵەش.

*** زۆرجاران وا باس دەکرێ دەڵێن نەوشیروان جارجارە نوقرچت لێ دەدا، چونکە لە کتێبەکەشیا زۆرجار هەست دەکەی گێڕانەوەکە بۆ ئەوەیە کە نوقرچێکت لێبدا، زیاتر لەوەی باسی ڕووداوێك بکا، یان لە جیاوازی فیکر یان جیاوازی سیاسی بدوێ؟**

- لە حەقیقەتدا ئەگەر بێینە سەر هەڵسەنگاندنی کتێبەکەی کاك نەوشیروان، ئەوەی لەو دوو کتێبەی نووسیویەتی ئەوە ڕەئی کاك نەوشیروانە لەسەر مێژووی کۆمەڵەو یەکێتی و جیابوونەوەی ئێمەو سۆشیالیست و لایەنەکانی تر، ڕەئی یەك کەسە، جارێ ئەبێ جەماوەری گەلەکەمان، مێژوونووسان، خوێنەوارانی کوردستان چاوەڕێ بکەن ڕەئیەکانی تر ببیستن، دوایی لێکۆڵەرو توێژەری مێژوویی دانیشێ و شتەکان لێك بداتەوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی بابەتی و زانستی ڕاستییەکان بزانێت، ئەوە یەك ڕەئیە، ناکرێ بۆ حوکمدان لەسەر هەموو ئەو کێشانەی کە لەناو یەکێتی یا لەدەرەوەی یەکێتی هەبووە، بیکەی بە پێوانە.

*** کاک بەختیـــار هەر بۆ مێژوو بێگومان ئەو کاتـــەی کە تۆ لە دەرەوە بە خەڵکت دەگوت ئەوە مفاوەزاتی یەکێتی و حکومەتەو، وەرنەوە کوردســـتان، یەك لەوانە گوتی ناگەڕێمەوە بۆ جاشایەتی، دەکرێ ناوی ئەو کەسە بڵێی کێ بوو؟**

- لەبیـــرم نییە، بەس ئەوەندە ئەزانم لە ئەڵمانیا کۆبوونەوەیەکمان کرد، لە فرانکفۆرت گرووپێـــك هەبـــوو نزیکەی (٢٣ ـ ٢٤) کەس دەبوون ســـەریان نابـــوو بەیەك، هاتنە کۆبوونەوەکەو زۆر توند بوون، بەڵام کە گوێیان لەمن گرت، دوایی چوارپێنج کەســـیان مانەوە، ئەوانی دی بیروبۆچوونەکانی ئێمەیان قبووڵکرد.

*** واتا دەکرێ بڵێین زۆربەیان توند نەبوون، هەندێکیان؟**

- ناڵێم بیســـت بیســـتوچوار کەســـێك ئەبوون ســـەریان نابوو بە یەکەوە بێگومان بە منیشیان وت، کاکە ئەوانە لە کۆبوونەوەکەت هەموو سەریان ناوە بەیەکەوە. وتم بابچینە کۆبوونەوەکـــەو گوێ لەوان دەگرین و ئەوانیش گوێ لەئێمـــە بگرن. لە کۆبوونەوەکە ئـــەوان زۆر توندبوون و من نەرم بووم. دوایی پێم وتـــن کاکە ئێوە لە ئەوروپا دەژین و منش لە شـــاخ هاتووم، من ئێستا لەئێوە دیموکراســـی ترم، ئەوە نییە من گوێتان لێ دەگرم، ئێوە بۆ هێندە توندن، پێم وابوو کوڕێك بوو بەناوی (فاخر) کە قســـەی دەکرد. ئەو لەهەموویان توندتر بوو..

*** ئێستا لەناو یەکێتی نییە؟**

- نازانم، زانیاریم لەســـەری نییە، ئەوەندەی بزانم و بیستبێتم، کە یەکێتییە، بەڵام بە کتومت نازانم و زانیاریم نییە..

**باشە کاك بەختیار، ئەو کاتە بڵێین دەیانگوت ئەوە خەتی ئارامە، ئەوە خەتی شەهابە، جەنابت لەکام خەت بووی؟**

- لە حەقیقەتدا من هەتا ســـاڵی (١٩٧٥ ـ ١٩٧٦) کە هاتمە ناو کوردســـتان و تا ئێستاش ڕێزێکی بێ پایانم بۆ شەخسییەتی شەهید شەهاب و بۆ قارەمانیەتی شەهید شـــەهاب و بۆ ئارامی و ئەخلاقی کاك شەهاب هەبووە، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان، تا ئـــەم لەحزەیەش خۆم بە خەتێك نەزانییوە دژی خەتی کاك شـــەهاب. بەڵام ئەگەر بێم مێژووی کۆمەڵە هەڵبســـەنگێنم، پێم وایە هەم لەســـەردەمی کاك شەهابا، هەڵەکراوە، هەم لەســـەردەمی کاك ئارامیشدا هەڵەکراوە. بە حوکمی ئیشەکانیش ئێمە لەگەڵ کاك ئارام کۆمیتەی هەرێمەکانمان دروســـت کرد، کاك ئارام وەکو بەرپرســـی یەکەمی ئێمە وابوو، مامۆستای ئێمە بووە، ڕێشاندەری ئێمە بووە، بێگومان پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ

کاك ئارام بە حوکمی ئەرکەکەی کە لەسەر شانمان بووە، سەرکرایەتی کۆمەڵە گیراوە، کۆمەڵەمان گرتۆتەوە، بێگومان من شەخسی لەگەڵ کاك ئارام پەیوەندییەکی فراوانترو قووڵترو پڕ لە تامی شۆڕشــگێڕانەتری بۆ مــن هەبوو، بەڵام من خۆم بەخەتی کاك ئارام نەزانیووە، لە دژی خەتی کاك شــەهاب لە حەقیقەتدا، خۆم تا ئێستاش شتەکان وا تەفســیر ناکەم، بەڵام وەکو وتم هەڵسەنگاندنی مێژووی کۆمەڵە لەساڵی (١٩٧٠ - ١٩٧٥) کە کاك شــەهاب گیراوە، ئەوە من نەك لەبەر خەتی کاك ئارام لەبەر خودی هەڵســەنگاندنی زانستیانەی مێژووەکەو ئەرکەکانی کۆمەڵە لەو ســاڵانە من کۆمەڵێك رەخنەم هەیە..

***باشە جاری وا هەبووە واباس دەکرێ تۆ لە خەتی شەهید شەهاب بووی، خەڵکێکی دیکەش لە خەتی ئارام بوون، با واز لەوە بێنین، بەڵام ئایا لە بنەڕەتدا خەڵکێك هەبوو ســەر بەخەتێك بێت، یا با بڵێین خەتی شــەهاب، ئایا لە خەتی ئارام لەنێو خۆشیاندا جیاوازییان هەبووە؟**

- ئارام خەتی نەبوو، هەتا کاك شــەهاب گیــراوە، ئەوە بوختانە بۆی ئەکەن، بەڵام رەخنەی هەبووە، هەرگیز و هەرگیز خەتێك نەبووە لەبەرامبەر خەتی کاك شەهابا، بڵێین ئەمە خەتە، چونکە جارێ خەتەکە نەکێشــرابوو. بەڵام رەخنەی هەبووە، بیروبۆچوونی جیاوازی هەبووە لەگەڵ ســەکردایەتی کۆمەڵە کاك ئارام هەر کاك ئارامیش نەبووە بە تاقی تەنها..

*** بەس رەنگە ئەو سەرکردایەتی کردبێ؟**

- نا، هەتا سەرکردایەتی کۆمەڵە گیراوە، کاك ئارام.....

*** سەرکردایەتی ئەم ئینتقادکردنە؟**

- نەخێر، سەرکردایەتی ئەم ئینتقادەشی نەکردووە ئەو کاتە، پێش ئەویش ململانێ و جیاوازی هەبووە لە نێوان ســەرکردایەتی کۆمەڵەو خەڵکی تردا، خەتی عێراقی هەبوو، خەتی رەنجبەران هەبوو، کەلە بەرامبەر سەرکردایەتی کۆمەڵە ئیشیان کردووە، ململانێ هەبووە لە نێوان کاك ئاوات عەبدولغەفور، کۆمەڵێك لە کادرەکانی کۆمەڵە هەر لەگەڵ کاك شەهاب و ئەوانە، واتا ئەوە یەکەمین ململانێ نەبووە کە هەبووە..

*** باشـــە کاك بەختیار بەڕێـــزت لەگەڵ ئەو کۆمەڵە کادیرەی کە ســـەرکردایەتی کۆمەڵەو دوایش بلێین لە هەڵوێســـتیان لەگەڵ ئاڵای شۆڕش و لەگەڵ ئێوەبوون، وەك پشـــکۆ نەجمەدین و حاجی مەمۆو چەند کەسێکی تر ئێستا پەیوەندیت لەگەڵ ئەمانە چۆنە؟**

- زۆر خۆشـــە، زۆر خۆشە، هیچ جیاوازییەکیان ناکەم لەگەڵ کەسێکی تر کە تازە یـــان لەدوای یەکگرتن رەفیقمن، رێزێکی گەورەم بۆ ماندووبوونی ئەوان هەیەو لەباری ئەخلاقییـــەوە چیم پێ بکرێ بەرامبەریان کەمتەرخەمـــی ناکەم، ئەگەرچی لەوانەیە ساڵەهای ساڵە لەگەڵ هەندێکیان، لەگەڵ نووسینی هەندێکیان لەگەڵ بیروبۆچوونی هەندێکیان جیاوازیشم هەبووبێ، بەڵام ئەم جیاوازییە نەبۆتە هۆی ئەوەی کە رۆژێ لە رۆژان من بەساردی سەیریان بکەم..

*** پەیوەندی دۆستایەتیت بەردەوامە لەگەڵیان؟**

- زۆر باشە، زۆر باشە، من لە ماڵ بم یا لە ماڵ نەبم، حاجی مەمۆ ئەچێتە ماڵی ئێمە، ئەوە باشترین بەڵگەیە کە برای ماڵەکەیە..

*** باشـــە کاك بەختیار لەدوای راپەڕینەوە حکومەتی هەرێم دامەزراوەو بەڕێزتان با بلێین لەوەتەی کە هاتییەوە ناو یەکێتی و رۆڵی بەرپرسیارێتیت وەرگرت، بەڵام تا ئێستا لە حکومەتدا کارت نەکردووە، بۆ؟**

- زۆرجار پێم وتراوە، من خۆم پێم خۆش نییە..

*** دەکرێ هۆکارەکەی بزانین؟**

- لـــە حەقیقەتدا من خۆم باوەڕم بەم دیموکراتی و ئـــازادی و بینای کۆمەڵگەی مەدەنـــی و ئەوانـــە زۆرە، پێم وایە ئەمە ئەرکێکی مێژوویی ئـــەم هەلومەرجەیە کە ئێمە پێیدا تێپەڕدەبین، لەم مەیدانـــەش تاڕادەیەك دەتوانم بڵێم هەندێك رەگم داکوتاوەو درێژەپێدانی ئەم خەباتە بە یەکێك لە بەرپرســـیارێتییە مێژووییەکانی سەرشانی خۆمی ئەزانم، لەبەر ئەوە ئەوەندەی پێم خۆشە، لەم بوارەدا خزمەت بکەم و توانای خۆم بکەمە کار، ئەوەنـــدە پێم خۆش نییە، بچمە وەزیفەیەکی حکومی کە بە هەندێك مەســـائیلی یاسایی و سیستەمی حکومی و هەندێك ئیلتیزاماتی دبلۆماسی بمبەستێتەوە..

*** واتا زۆر حەز لە مەسەلە یاساییەکە ناکەی؟**

- نـــا، ئەبێ بچیتە هەر وەزیفەیەك لـــە وەزیفەکان، هەر وەزارەتـــێ لە وەزارەتەکان، بێگومـــان ئەچیتە چوارچێوەی یاســـاییەکی دیاریکراوەوە، بـــەڵام تۆ کە لە مەکتەبی

رێکخراوەکان کار دەکەی، لەبەرامبەر هەموو یاســا لەبەرامبەر هەموو وەزارەتەکان بۆت هەیە ململانێ بکەی، داخوازیت پێ دابگری لەسەر مەسەلە مەدەنییەکان، لەسەر مەسەلە ئازادییەکان، لەم جۆرە مەکتەبە ئەوەندەی بەشێکم لەرای گشتی و لە خەباتی مەدەنی و ئازادیخوازی، ئەوەندە نەبەســتراومەتەوە بە پرۆگرامێکی دیاریکراوی وەزارەتێك، من چارەنووس و ســەرکەوتنی ئەزموونی دیموکراسی و حکومەتی دیموکراسی کوردستان بەیەکێك لە شەرافەتمەندترین ئەرکەکانی سەرشانی خۆشم ئەزانم، بەڵام لەو مەوقیعەوە، لەم جۆرە بیروبۆچوونە، ئــەم مەوقیعە بە ئەرکێکی گەورەی دوولایەنەی ئەزانم. کاکە گیان پێم وایە مێژووی ئێمە، مێژووییەکە بەیار لە عەقڵدایە، لە مەســەلەی عەقلانی، بەیار لە مەســەلەی رۆشنبیری. لە مەسەلەی رێنســانس. لە مەسەلەی چاکسازی ئایینی.. وەکو چۆن رزگارکردنی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان بوون، بە میرات بۆ ئێمە بەجێ ماوە، خۆزگە وانەبوایە، خۆزگە لە زەمانی شــێخ مەحمود ئەمە کۆتایی بهاتایە. خۆزگە لەزەمانی شــێخ عوبێــدوڵای نەهری ئەمە کۆتایی بهاتایە. خۆزگە کۆماری مەهاباد بە تەواوەتی سەرکەوتایە، وەکو ئەوە چۆن بە میرات بۆ ئێمە بەجێ ماوەو دەبێ ئێمە پەرلەمانی ئێســتای کوردستان، حکومەتی ئێستای کوردستان سەر بخەین، پێم وابێ ئەرکی رۆشنگەری و ئەرکی ئازادکردنی عەقڵی ئینسانی ئێمەو بونیادی کۆمەڵی مەدەنی، بونیادی دیموکراسیش بە میرات بۆ ئێمە بەجێما.

(١٥٠) ساڵ لەمەوبەر ئەگەر بزووتنەوەی رۆشنگەریی سەرکەوتنی گەورەی بەدەست بهێنایە، ئێســتا پێویستی نەئەکرد گۆڤاری رۆشنگەری دەربچێ، گۆڤاری مەدەنیەت دەربچێ، گۆڤاری نازانم چی بەم جۆرە دەربچێ کە سەرەتای خەباتی مەدەنی خوازی ئێمەیە ئەوە لەبەر ئەوە، تەجروبەی ئێستای کوردستان و حیزبە سیاسییەکانی کوردستان دوو ئەرکی هاوشــانی یەکتریان هەیــە، ئەرکێکیان بونیادنانی دەوڵەت و دەســەڵاتە، ئەرکێکیشــیان خەباتکردنە بۆ رۆشنی و رۆشنگەری و مەسەلەی مەدەنیەت و ئەمانە، خۆتان ئەزانن لە مێژوودا ئەم ئەرکە زۆرتر هزرڤانەکان، فەیلەســوفەکان و خەڵکانی بە توانا ئەم کارەیان کردووە لە مێژوودا لە ئەوروپا، بەڵام لای ئێمە بۆ ئێمە بەجێماوە، واتە حکومەتی ئێمە لە لایەکەوە ئەبێ دەسەڵات و دەستوور دابمەزرێنێ، لەلایەکیشەوە دەبێ بەشــدارییەکی بەرچاو بکات لە چۆنیەتی ئازادکردنی عەقڵ، لەچۆنیەتی مەلەســە رۆشــنگەرییەکان، لەچۆنییەتی بەمەدەنیکردنی کۆمەڵ، ئێمە دەسەڵاتێکی سیاسی و مەدەنیمان هەیە.

*** کەواتە بەشـــداریکردن لە حکومەت، کاریگەری زیاتری دەبوو لە بەمەدەنیکردنی خەڵك لەو بابەتانەی کە ئێستا باستکرد؟**

- حکومـــەت گرنگە بۆ ئـــەو کارە، بەڵام گرنگـــی دەرەوەی حکومەتیش لەکاری وەزارەتەکان کەمتر نییە..

*** کاك بەختیار هەندێ جار باس لەوە دەکرێ دەڵێن کاك مەلا بەختیار ئەگەر بێت و با بڵێین سەرکردایەتی یەکێتی سکرتێرەکەی نەمێنێ کە مام جەلالە کە ئێستا سەرۆك کۆمـــاری عێراقە، با بڵێین بەپێی تەمەن و بەپێی ئەوەی بەتایبەت تۆ گەنجتری لەو، حەتمەن ئەگەر بەپێی یاســـای ژیان بێ، تۆ تەمەنـــت دوای ئەو هەر دەمێنێ، لەناو یەکێتی رەنگە تەنگەتاو بکرێی، واتە بەو پێکهاتەیەی سەرکردایەتی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، مەلا بەختیار جێگەی بە زەحمەت بۆ دەکرێتەوە..**

- وەڵڵا ئەمە خەمڵ لێدانە. (بەپێکەنینەوە)

*** بـــەڵام بەپێی ئەو واقیعەی کەئێســـتا هەیە، رەنگە ئەگـــەر ئەو نەمێنێ، ئەمە روویدا..**

- وەڵڵا ئەمە خەمڵ لێدانە، بێگومان هەموو رووداوێك قســـەی خۆی هەیە، هەموو پێشـــبینییەك دەبێ بچینە ناوی، ئینجا تۆ بتوانی هەموو لایەنەکانیت بۆ دەردەکەوێ. حوکمی لەســـەر بکرێ، ئەوەندەی من بزانم ئەگەر من بمەوێ سیاسەت بکەم و درێژە بە سیاســـەت بدەم لەبووتی مام جەلال، یاخوانەخواستە لەدوای مەرگی مام جەلال، کە هیوادارم کە تەمەنێکی زۆر درێژی هەبێ، ئەگەر من بمەوێ سیاسەت بکەم، بێگومان ئێستاش ئەتوانم سیاسەت بکەم و ئەوساش ئەتوانم سیاسەت بکەم..

*** ئەتوانـــی، بەڵام وەکو پێگەت لە (م.س)ی یەکێتی با بڵێن زۆرجار هەیە دەبینین کەسێکی زۆر بەتوانایە، بەڵام کە تەنگەتاوی دەکەن، دەبینی هەرچەندە بەتوانایی، ئەو بوارەت بۆ نارەخسێ وەك ئەوەی کە لە فرسەتێکی تر بۆت رەخساوە؟**

- من پێم وانییە من خۆشم ئەوەندە کەم توانابم لەو ئایندەیە تێنەگەم، (بەپێکەنینەوە) ئەمە یەك. دووەم ئەگەر بشمەوێ سیاسەت بکەم، لەو ئایندەیەش ئەتوانم سیاسەتی خۆم بکەم. ســـێهەمیش ئەگەر دونیای سیاسەت وای لێهات، هیچ مەیدانێکت بۆ نەمێنێ هەنگاوی تێدا هەڵبهێنی و لەگۆشەیەکت بگوشن، نایکەم. خۆ چییە سیاسەت ئەگەر نەیکەی چی دەبێ. خۆ ئێستا شاخ نییە کاکە یان سیاسەت یا مردن. ئێستا سیاسەت هەیە، رۆژنامە هەیە، گۆڤار هەیە، بازرگانی هەیە، ژیان لەدەرەوەی کوردستان هەیەو

ژیان لە بەغدا هەیە، کۆمەڵێك شــت لەژیان هاتۆتە پێشەوە کە تۆ ئەتوانی سیاسیش نەبی و بەقەدەر سیاسیەکیش خزمەت بە میللەتەکەت بکەی..

*** بەڵام ئەوانەی لەناو سیاســەت زۆر قاڵبوونەتەوە، وەکو نەخۆشــیەکی لێهاتووەو ناتوانن وازی لێبهێنن؟**

- مەرج نییە، ئێســتا ئەوە چەندین ئەندامی مەکتەبی سیاســی و ســەرکردایەتی یەکێتی دانیشتوون و نەخۆشیەکەشیان نەگرتووە..

*** باشە ئێستا باسی رۆژنامەو ئەو شتانەت کرد، راستە رۆژنامەی چاودێر بەرێزت دەری دەکەی؟**

- بەڵێ، راستی چی، ئەوەنیە نووسراوە لەسەری سەرنووسەرەکەیم..

*** ئەی راســتە لەناو یەکێتی هەر جەمسەرێك رۆژنامەیەك بۆ خۆی دەردەکاو دەڵێن هاوڵاتی کاتی خۆی هی کاك نۆشــیروان بووە، ئاســۆ هی بەرهەم ساڵحە، چاودێر هــی تۆیە، ئێســتا ئاوێنە هی کاك نۆشــیروانەو وازی لە هاوڵاتی هێناوە.. باشــە بۆچی سەرکردایەتی یەکێتی هەر یەکەو بۆ خۆی رۆژنامەیەك دەردەکا، مەبەست لەوە چییە؟**

- من ئەو زانیاریانەی تۆم نییە، من ئەو زانیاریانەی تۆم نییە..

*** بە زیادەوە هەتە..**

- ها..؟!

*** بە زیادەوە هەتە. (هەردووکمان پێکەنین)**

- ئەمە رەئی خۆتە، بەراســتی من ئــەو زانیاریانەی تۆم نییە، کە هەر یەکێ لەو رۆژنامانە یەکێك لەوبەرێزانە لە پشتیەوە بێ..

*** ئێستا ئاوێنە کاك نەوشیروان با بڵێین پشتگیری دەکا، ئاسۆش ئەوە دیارە بەرهەم ساڵحە؟**

- کاکە، تۆ گوێ لەمنیــش بگرە، کە دەڵێم ئەو زانیاریانەم نییە، مومکینە هەموو مەســئولێك لە مەســئولەکانیی یەکێتی و پارتیش و هەموو هێزەکان جۆرێك مامەڵە لەگــەڵ دونیای رۆژنامەو تەلەفزیۆن و ئەوانە بکەن کە پێیان باش بێ، ئەوە کەناڵێك بــێ، ئــەوە کەناڵێك بێ لەو کەناڵانەی کــە بتوانن هەندێك لــە پەیامەکانی خۆیان بگەیەنن، مومکینە ئەوە لەدونیای سیاســەتدا پاساوی هەیە، لە حکومەتەکان هەیە، لە حیزبەکاندا هەیە.

بەڵام بەراســتی من ئەو زانیاریانەی تۆم نییە کەهەر یەکێك لەو رۆژنامانە بەپێی نەخشەی یەکێك لە مەسئولەکان دەرچووبن. لە حەقیقەتدا، بڕوات هەبێ ئەو زانیاریەم نییە، ئەبەد نیمە بەس چاودێر کێ دەریدەکا؟ من دەریدەکەم، بەڵێ ئێمە دەریدەکەین لە مەکتەبی رێکخراوەکان و فیکرەکەی هی منە، پرۆژەکەی من دامڕشتووە..

*** هێڵی رۆژنامەکەش هەر تۆ دایدەڕێژی؟**

- هێڵی رۆژنامەکەش من دامڕشــتووە، پرسیشــم بە مەکتەبی سیاسی و جەنابی مام جەلالیش نەکردووە کە دەرم کردووە، یازدەهەمین ژمارەی بووە، کە یەکەمین جار مام جەلال دیتی..

*** مەکتەبی سیاسی هەڵوێستیان نەبوو، کە تۆ رۆژنامەیەك دەردەکەی کە تۆ چیت زیاترە لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و مەسەلەی شتی لەو بابەتە؟**

- تا ئێســتا رەفزی دەرچوونی رۆژنامەکەیان نەکردووە، بەڵام لە هەندێ هەواڵ و دەنگوباســدا، جاری وا هەیە گفتوگۆ لە مەکتەبی سیاســییەوە دێتە پێشەوە لەسەر هەواڵەکان و ئەوانە، منیش رەئی خۆم ئەڵێم..

*** باشــە کاك بەختیار، زۆرجار دەڵێن بۆ نموونە کاك بەختیار دەچێتە خانەقین و گوتاری سیاســی دەدا، دەچێتە حاجیاوا رانیە، گوتــاری هەیە، بەڵام بۆ هەولێرو دهۆك و ئەو ناوچانە لەخوار کۆیەوە زۆر کەم ســەردانی دەکات و گوتاریشــی هەر نییــە، واتە ئەو گوتارانەی کە لەو ناوچانە زۆرجار داوتە لە شــوێنەکانی خوارترەوە روونەداوە، یا ئەگەر رووشی دابێ، لەوانەیە زۆر دەگمەن بووبێ؟**

- یەکەم، مەســەلەی هەولێرو ســەرووتری بۆ ســەرەوەو بۆ بادینان و ئەوانە بڕوا، دەبێ بیبەســتیتەوە بە رووداوە سیاسییەکان و، دوو حکومەتی و، ئەو حەساسیەت و گرفتانەی کە هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا من لە دهۆك لەو ماوەیە کە پارساڵ سەردانی دهۆکمــان کردووە، دوو کۆڕم بەســتووە، لە هەولێر پێنــج رۆژ لەمەوبەر کۆڕێکمان هەبووە..

*** کۆڕی داخراو بوونە؟**

- نا نا، کــۆڕی داخراو نەبووە، کۆڕی رێکخــراوە دیموکراتییەکان بووە، لەکاتی هەڵبژاردنی دەســتووردا لە هۆڵی میدیا کۆڕێکی فراوانی ئاشکرا بوو بۆ خەڵکەکە لەسەر تەلەفزیۆن بەردەوام قسەم دەکرد، لە چوار مانگی رابردوو لەناو کۆیە دوو کۆڕم هەبووە، لەرانیە بە بەردەوامی هەمە..

*** لەو شوێنانە هەتبووە..؟**

- بەڵام ناوچەی هەولێرو دهۆك لەراستیدا پەیوەندیی بە بارودۆخی سیاسییەوە هەیە، هیچ پەیوەندی بەناوچەگەریەتییەوە نییە..

*** باشـــە کاك بەختیار تۆ وەك کەســێکی مارکســی، هەرچەندە ئێســتا ئەوانەی مارکسیشـــن، واتە بە حیزبە مارکسیەکانیشـــەوە ئەوە یان روویداوە، بەڵام سەبارەت بە کــە جەنابت لەرووی فیکریـــەوە، زۆر ئیدعای مارکســیەت و بڕوابوون بە میتۆدی مارکســیەت (نەك ئایدیۆلۆژکەی) بابڵێین خۆت گرێــداوە، کەچی دەڵێن لەو چەند ساڵەی دوایی کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت، کاك مەلا بەختیار توانی سامانێکی زۆر کۆبکاتەوە، نازانم ئەوە تا چەند راستە؟**

- ئامارت پێیە..؟

*** ناوەڵڵا..**

- قسە مەکە، (پێکەنی) بەڵگەت پێیە؟

*** بەڵام دووکەڵیش بەبێ ئاگر نابێ؟**

**- بەڵگەت پێیە..**

* ئاخر بەڵگە زەحمەتە، من چۆن بزانم تۆ رێك چیت هەیەو چیت نییە؟

- دەباشـــە، دەبێ ئەو مەسەلانە بەبێ بەڵگە قســـەی لەسەر نەکرێ، ئەمە یەك..، دووەم ئایا منماڵم هەیە، خانووم هەیە، ســـامانم هەیە، بەڵێ هەمە، من وەکو یەکێك لە بەرپرســـەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردســـتان ئەرزم وەرگرتووەو یارمەتیان داوم و خانووم کردووە..

*** ئەوە زۆر سروشتییە. ئەوە..**

- ئەمە زۆر سروشـــتییە، مووچەم باشـــە، مووچەی ئەندامی مەکتەبی سیاســـیم هەیە، مووچەیەکی زۆر باشە، مووچەی مانگێکم بەشی دوو مانگم ئەکا، یارمەتی، یارمەتی زیاتر لە خەڵکی تریش ئەدەم لەم مووچەیە، واتە بەڵێ ژیانی ئێمە روونە کە لە ژیانی خەڵکی تر باشترە و ئیمکانیاتێك بۆ ئێمە دابین ئەکرێ، بۆ خەڵکی تر دابین ناکرێ، ئەوە روونە..

*** بەڵام تەســـوڕ ناكـــەی هەموو ئەوانەی بەتایبەتی لەو دوو حیزبە دەســـەڵاتدارە ئەوانەی كە دەبنە خاوەن سەرمایەیەك، لە ڕێگای مووچەوە نییە، چونكە مووچە ئەگەر هەر مانگێك بەشی چوار مانگیش بكا، ئەوەندە دەوڵەمەند نابێ؟**

- ئێ ڕاستە ئەوە، من بەش بەحاڵی خۆم خاوەن سەرمایەنیم، حەزدەكەم بزانی و لەڕێگەی تۆشەوە بۆ یەكەمین جارە رایدەگەیەنم هەر كەسێك لەم كوردستانە بچووكترین بازرگانی، بچووكترین شەریكاتی لەگەڵ من هەبێ، بێ منەت بێ، با ڕایبگەیەنێ..

*** باشـــە كاك بەختیار لەم دواییە جۆرێك لە مەســـەلەی چاكســـازی و پاكسازی لەنێو یەكێتی نیشـــتمانی ســـەریهەڵدا، ڕۆژنامەی چاودێریش دەروازەیەك بوو بۆ شت بڵاوكردنەوەی، لەگەڵ چەند ڕۆژنامەیەكی تریش، هەندێك بۆچوون هەبوو وەكو شەماڵ عەبدولوەفاو ئازاد جوندیانی و چەند كەســـانێكی تریش ئەیانووت یەكێتی پێویستی بە پرۆژە نییە، ئێمە بەخۆمان كێشـــەیەكی ئەوتۆمان نییە، ئـــەو پرۆژەو پرۆژەكارییە بۆ لەناوبردنـــی یەكێتییە، تۆ لەســـەر ئەوە، دوای ئەوە، لەبەر ئـــەوەی بەڕێزتان ئەندامێك بووی لەو چواركەســـەی كە پرۆژەیەكتان نووسی بوو بۆ مەكتەبی سیاسی و، دواتریش ئەندامانی مەكتەبی سیاســـی، هەر یەكە پرۆژەیەكی نووســـیبوو، فوئاد مەعســـوم و نەوشـــیروان و چەند كەســـێكی دیكەش هەر یەكە بۆ خۆی چەند شتێكی دەنووسی، دواتریش دەقێك بڵاوكرایەوە بەناوی دەقی پەســـندكراوی پرۆژەی ئەو چاكســـازییە، تۆ پێت وایە ئەو هەموو بۆچوونانەی كە لەو ڕۆژنامانە بڵاوەكرانەوە، واتا پێویست دەكات یەكێتـــی بەو هەموو غەربەلە جارێكـــی دی غەربەلەیەكی ئـــەو بۆچوونانە بكات و نوێكردنەوەیەكی پێویست بكات؟**

- وەڵڵاهی من پێموایە وەكو پرەنســـیپ یەكێتی پرۆژەی گۆڕانكاری پێویستە، بەڵام ئایـــا ئەم فرە پرۆژەیە پێویســـت بوو، من پێم وایە هەندێكی پێویســـت نەبوو، یەكێتی ئەیتوانـــی تۆزێك وردتر ئەم كارە ڕابپەڕێنێ و لە ســـنوورێكی دیاریكراوی پێویســـتی گەشـــەكردنی یەكێتیدا مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی پرۆژە بكات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئـــەو لیبرالیەتەی لەناو یەكێتیدا هەیە، عادەتەن دەبێ خەڵك چاوەڕێ بكا، لەكاتی ئەم جۆرە ململانێیەو، كاتێ قســـە لەسەر شتێكی هەستیاری وەكو گەندەڵی و بیروكراتیەت و هەندێك لە پێشـــێلكارییەكانی دێتە پێشەوە، دەبێ چاوەڕێ بكەی، كە لەحیزبێكا كە لیبرالیەتی زیاترە لە حیزبێكی دیكە دەبێ چاوەڕێش بكەی ئەم جۆرە شـــتانە ڕووبدا لە ناوی و دەبێ قبووڵی بكەی..

*** ئەوەی جێگای سەرســوڕمان بوو باســی لێوەدەکرێ ئەوانــەی کە لە هەرەمی حیزبەکەنە، ئەوانە خۆیان پرۆژە پێشــنیار دەکەن، دە باشە بە تەسەوری تۆ ئەدی کێ بەرپرسە لەو ئەوانەی رابردوو، کە هەموو ئەو خەلەلانەی کە هەبوو؟**

- لەبــەر ئــەوەی یەکێتی حیزبێکی بەهێــزە، (٨) مەکتەبی هەیــە، (١٥ ـ ١٦) مەڵبەندی هەیە، سەدان کۆبوونەوەو کۆمیتەو رێکخراو ئۆرگانی تری هەیە، حکومەتی هەیە، وەزارەتی هەبوو، دامودەزگای هەبوو، ئابووری هەبوو، بازاڕی هەبوو، ســەدان کۆمپانیا لە ســنووری دەسەڵاتەکەیدا هەبوو، لەبەر ئەوە تۆ لە هەرەمی دەسەڵاتیشدا بیت تۆ ناتوانی وەك (ساحر) کۆنترۆڵی ئەو شتانە بکەی، ئەو کاتەی کە رووبەڕووی دیاردەیەکی ناواو پڕ کێشە ئەبیتەوە، بێگومان ئەوەی لە هەرەمی دەسەڵاتیشایە، ئەبێ رێگایەك بدۆزیتەوە بۆ چۆنیەتی دەرخســتنی بیروڕای خۆی و پێشنیارکردنی رێگا چارەسەری خۆی.

*** بەڵام لەدواییدا ئەو پرۆژەو پرۆژەکارییانە هیچ ئەنجامێکی لێ کەوتەوە؟**

- بەڵێ ئەنجامەکەی وابوو کە هەموو پرۆژەکان یەکخراون، ئێستا جەنابی مام جەلال گەڕاوەتەوە (١٠)رۆژ لێرە ئەبێ بۆ ئەوەی ئەو خاڵانەی کە لەسەری رێکەوتووین وەکو پرۆژەی چاکســازی دوا بڕیاری لە ســەر بدرێ و ئیتر ئیش بکرێ لە ئۆرگانەکان و خەباتی بۆ بکرێ.

*** هەر لەنێو ئەو پرۆژانە باس لەوە دەکرا تا حیزب چاکســازی و پاکســازی تێدا نەکرێ، ناتواندرێ چاکسازی و پاکسازی بگوازینەوە ناو حکومەت؟**

- مــن ئەم بیروڕایەم لەمەکتەبی سیاســیش قبووڵ نەکرد، من پێم وایە چاککردنی حیزب و حکومەت، حکومەت و حیزب، دوو مەسەلەی پێکەوە بەستراوی بەیەکەوە کار بۆ کراوە، من پێموانیە ئەمانە لەیەك جیابکرێنەوە..

*** باشــە بۆچوونێکی کاك کۆســرەت هەر لە دیمانەیەك بوو، یا لێدوانێك بوو، وتی من لەگەڵ ئەوەدام ئەوەی تەمەنی لە (٥٠) پەنجا ساڵ زیاترە با واز لەسەرکردایەتی یەکێتی بێنێ، بەخۆشــمەوە. تۆ تا چەنــد لەگەڵ ئەوەدای، چونکە مرۆڤ لە پەنجا ساڵیدا تۆزێك لەڕووی عەقڵانییەوە، لەڕووی ئەزموون و ئەخشەکێشان...هتد موتەکامل دەبێ؟**

- لەناو ئەو کێشــەو بێشانەی کە لەناو یەکێتی و دەرەوەی یەکێتی، ئەو ململانێیەی کە هەیە، ئەم جۆرە پێشنیارانە خەیاڵێکی پاکە، بەڵام جێبەجێکردنی زۆر قورسە.

*** مـــەلا بەختیار دوور لەو قســـە تەقلیدیانەی کە دەکرێـــت گوایە ئەو ڕێککەوتنە ســـتراتیژیەی نێوان پارتی و یەکێتی هەوڵدانێکە بۆ نەهێشـــتنی هەر کەموکورتییەك، یاخود زیاتر پاراستنی بەرژەوەندی هەردوو حزبە، لە کاتێکدا دەکرا پێش ئەوەی شەڕی ناوخۆ بکرێت ئەو ڕێککەوتنە بکرابوایە، ئەو گرفتانەش دروســـت نەبوونایە کە ئێســـتا بەدوای چارەسەریدا دەگەڕێن.**

- وەڵاهی هەردوو ئەو مەسەلەیە و مەسەلەی تریش هەیە، یەکەم: گیروگرفت هەیە ئەگەر چارەسەریان نەکەین قەبەتر دەبێت و مەترسی زیاتر پەیدادەبێت و ڕەنگە کەلەبەر و قڵیشـــی زیاتر بخەنە نێوانمانەوە، بۆیە دەبێ کارێك بکەین بۆ داڕشتنی بنەمایەکی سیاســـی ئەوتۆ کە بتوانیـــن کەموکورتیەکان بە ڕێکوپێکی چارەســـەر بکەین. دووەم بـــۆ بەرژەوەندی من پێموانییە حزب نییە لە دنیادا، دەســـەڵاتی هەبێت و بەرژەوەندی نەخوێنێتەوە، نەیپارێزێ، زیادیشی نەکات، ئەوە سروشتی هەموو دەسەڵاتێکە لە دنیادا، دەســـەڵاتی یۆتۆپیایی لە دنیادا نەهەبووە و نەدەشـــبێ، هەموو ئەو تیۆرییانەی کە لەســـەریۆتۆپیا دانران واقیع ڕەفزی کـــردن. زۆر زۆر ئاساییشـــە یەکێتی و پارتیش بەرژەوەندییەکانیان پەرەپێبدەن، بیپارێزن، ڕێککەوتنی لەگەڵ بکەن، ڕێککەوتنی تریشی لەســـەر بکەن، هیچ بە دووری مەزانە، دوای ئەو ڕێککەوتنە، ڕێککەوتنی ئابووریش بخەینە نێوان خۆمانەوە.

*** مەبەستت لە ڕێککەوتنی ئابووری چییە؟**

مەلا بەختیار: دەڵێم بە دووری مەزانە، ڕێککەوتنێك لە ســـەر مەسەلە ئابوورییەکان بکەین، شتێکی زۆر زۆر سروشتییە لە ژیاندا، چونکە ئێمە ئێستا دوو حزبی دەسەڵاتدارین، دەســـەڵات مانای چی؟ مانای دەسەڵاتی تەنفیزی، دەسەڵاتی تەشریعی، دەسەڵاتی قەزائی، ئابووری.

*** باشە هەندێك جار لە ڕۆژنامەکان زیاتر....**

- ئیجازەم بدە من وەڵامت بدەمەوە،پێویستە پاراستنی بەرژەوەندی شتێکی نامۆ نەبێت بەلای خوێنەر و تاکی ئێمەوە، بەرژەوەندی ئەگەر لە رابردوو لەسەر شتی زۆر بچووك، لەســـەر کار و کاســـبی زۆر بچووك بووە، لەمەودوا دەبێ بزانین بەرژەوەندی لەســـەر ئاســـتی دەسەڵاتە، لەسەر ئاستی حکومەتە، لەســـەر ئاستی کۆمپانیای جۆراوجۆرە، لەسەر ئاســـتی پەیوەندییە ئابوورییەکانی عێراق، ئیقلیم، دەرەوەو بانقەکانە، لەبەر ئەوە بەرژەوەندییەکان زیادیان کردووە و پەلوپۆی گەورەتر و قەبەتری هاویشتووە، بێگومان ئەم

ئیشـــانەش زەمانی قانوونی و زەمانی سیاسی و، زەمانی ئیداری زەمانی بەقووەتتری دەوێ.

خاڵی سێیەم، زۆر گرنگە بزانرێ، ئەویش ئەوەیە ئەم رێککەوتنە پێموایە بنەمایەکی تازەیە، دەستەبەریەکی تازەیشە بۆ ئەگەری ئەگەرە مەترسیدارەکانی لەمەودواش ئەگەر بێتە پێشـــەوە، خۆ ئێمە لە خەم نەرەخساوین جارێ. ئێمە لە دەوڵەتانی ئیقلیمی هیشتا مەترســیمان لەسەرە، لە ناوەخۆی عێراق مەترسیمان لەسەرە، مەسەلەی هەموارکردنی دەستوور، مەسەلەی بودجەی کوردستان، مەســـەلەی ماددەی ١٤٠ شەڕی تائیفی، شەڕی ئەهلی، ئەو موئامەراتانەی لە قاهیرە کران، ئەوانەی لە پشت پەردەوە دەکرێن، ئەوانە هەمووی پێویســـت بەوە دەکات،ئێمە کارێکی ئەوتۆ بکەین، ســـەرەڕای ئەوەی هاوپەیمانی کوردســـتانیمان هەیە، حکومەتی هاوبەشمان هەیە. پەرلەمانی هاوبەشمان هەیە، دوو قۆڵیش هەتا دەتوانین کەلێنەکانمان کەمبکەین.

*** بەڵام پێشتریش ئەو مەترسیانە هەر هەبوون و کەچی هیچیشتان نەکرد؟!**

- راســـتە ئەو مەترســـیانە هەبوون، بەڵام ئەزموونەکانی ئێمە، ئەزموونی تر دێنێتە پێشـــەوە، فکری تر دێنێتە پێشـــەوە، بۆ ئێمە لێکدانەوەی تر دێتە پێشـــەوە، فکری تر دێتە پێشـــەوە بۆ ئێمە تەجروبە هەبوو، بەڵام کێ تەســـەوری دەکرد دوای چوار ساڵ یەکتر هاڕین لە عێراقدا، تازە شیعە و سونە زیاتر لە یەکتری دوور دەکەونەوە، پێویستە تۆ ئەمانە بخوێنیتەوە، کێ تەســـەوری دەکرد لە قاهیرە ئەم هەموو هێزانە بڕۆن بەرە-جەبهە- تەوقیع بکەن بە هاوکاری چەندین مخابەراتی ناوچەکە، کێ تەسەوری دەکرد، کۆماری ئیســـلامی ئێران لەگەڵ ئەو هەموو دەوڵەتە عەرەبیانە لە یەکتری وردە وردە دوور بکەونەوە، ئەمانە هەموو شتی تازەن رووبەڕوومان بوونەتەوە.

*** هەندێکجار لە هەندێ رۆژنامە شـــتێکی لەم جۆرە باسدەکرێت کە دوور نییە ئەوە هەنگاوێکی جددی بێت بۆ ئەوەی هەردوو حزب ببنە یەك، تەســـەور دەکەی شتی وا لە ئارادابێت؟**

- وەکو قسە ئەم قسانە دەمێکە هەیە. ئەم قسانە ساڵەهایە هەیە.

*** لەبەر ئەوەی ئێستا نەهجی هەردووحزب وەکو یەکە؟**

- ئیجازە بدە با وەڵامی بەشـــی یەکەمی پرسیارەکەت بدەمەوە. ساڵەهایە ئەو قسانە هەیە، ئەم گفتوگۆیەش لە نێوان ئەشخاســـیش هەبووە، بـــەڵام ئایا ئەم دوو حزبە، لە کۆنگرە، لە کۆنفراس، لەســـەر ئاستی سەرکردایەتی لەسەر ئاستی مەکتەبی سیاسی،

قسەیان لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە؟ بەشەکەی خۆمان (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) تا ئێستا دوور و نزیك قسەمان لەسەر ئەو مەسەلەیە بۆ یەکخستنی هەردوو حزبەکە نەکردووە.

سەبارەت بەوەی کە ئایا یەك نەهج هەیە، لێرەدا بێگومان وانییە، کاکە ئێمە ئێستا حزبێکین، سۆشیالیست دیموکرات، حزبێکین جیاوازی ئایدۆلۆژیمان هەیە، جیاوازی فەلسەفیمان هەیە، جیاوازی مومارەساتمان هەیە.

*** لە پراکتیکدا یەك پراکتیکتان هەیە.**

مەلا بەختیار: ئێمە لە چوارچێوەیەکی ستراتیژی سیاسی، ئیداریدا لە یەك دەچین، ئیمە پابەندین بەم ستراتیژە سیاسییە، ئیدارییە، کە ئەم قۆناغە پیادا تێدەپەرێ، ئەم ستراتیژیە پراکتیکەی زۆر جیاواز نییە تەنیا ئەوەیە کە کارمان ئەدای جوانتری هەیە، جوانتر بۆ شتەکان دەچن، خزمەتگوزاری زیاتر پێشکەش دەکەین، زیاتر لە نێو حزبەکانمان ئازادی و دیموکراسی دابین دەکەین.

*** لەسەر خزمەتگوزاریش قسەمان هەیە دواتر باسی دەکەین،کە لە هەولێر باشتر بەرێوە چووە،بەڵام با بپرسین دوای ئەو گۆرانکارییەی کەلە نێو مەڵبەند و کارگێرەکان (لەنێو یەکێتی) دروست بوو هەڵبژاردن کرا، بەتایبەتی لە هەولێر ئەوەی تەسەور دەکرێت ئەوەی سەیر دەکرێت، دوای ئەوەی کارگێرەکانی ئێوە گۆرانیان بەسەردا هات، بەتایبەتی لە بەرپرسی مەڵبەندەوە، هەست دەکەیت یەکێتی لە هەولێر بەرەوکزبوون چووە، نازانم بەرێزت وەکو کارگێری مەکتەبی سیاسی ئەمە چۆن لێکدەدیتەوە؟**

- لە راستیدا من بەش بە حاڵی خۆم کاتی خۆشی لەسەر ئەو پرۆژەی بۆ هەڵبژاردن گەڵاڵە کرا لە مەکتەبی سیاسی رای جیاوازم هەبوو، پێم باش نەبوو.

*** پێت باش نەبوو هەڵبژاردن بکرێت؟**

-ئەو پرۆژەیەم پێ باش نەبوو بەمشێوەیە هەڵبژاردن بکرێت، هەڵبژاردنم پێ باشە، بەڵام لەسەر بنەمایەکی حزبی تر و باشتر. مەترسیم هەبوو لە جێبەجێکردنیدا، لە کێشەکانی،لە گیروگرفتەکانی، لەو بارودۆخەی کە ئێمە تیایدا دەژین، لە رۆژنامەی چاودێریشدا من سەروتارێکم نووسی کە وتم دەبێ ئەمە دوابخرێت و دەبێ ئیشی باشتری بۆ بکرێت، من پێموانییە ئەم پرۆژەیە سەرەرای ئەوەی جێبەجێمان کرد، توانیبێتی وەرچەرخانی دیموکراتی وەرچەرخانی مەعریفی، وەرچەرخانی حزبی باشتر لە ژیانی حزبی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا هێنابێتە دی. ئەگەر کێشەکانیش

والێکبدەینەوە کە یەکێتی نیشـــتمانی قودرەتێکی بەقووەتـــی هەیە دەتوانێت زاڵ بێت بەسەریاندا، ئەمە راستە، بەڵام.

*** کاك مەلا بەختیار ئێســـتا دەزگای زانیاری و پاراستن زۆر باسیان لێوە دەکرێت، کەهەردووکیان مادام لەمەودوا دەبێت بەرەسمی بخرێنە سەر حکومەت، ناکرێت دەزگایەکی ئاواتەنهابۆ حزبێك کار بکات،پرســیار ئەوەیە ئایا ئەو کاتە پێویستە یەکبگرنەوە، ببنە یەك دەزگا بۆ پاراستنی ئەمنی قەومی، یاخود هەر ناوێکی دی هەبێت،ئایا ئەو کاتە دەزگای زانیاری تێکەڵ بە دەزگای پاراستن دەبێتەوە؟**

- تۆ قسە لەسەر تێکەڵبوونەوە مەکە قسە لەسەر یەکگرتن بکە. ئایا ئەم دوو دەزگایە یەکدەگرنەوە، تێکەڵ مانای ئەوەیە شتێکی بچووك بچێتە نێو شتێکی گەورەی موهیم، پێویســـتە ئەو بابەتانە بەمشـــێوەیە لەگەڵ ئێمە تەرح نەکرێت، ئێمە وای تەرح ناکەین لەگەڵ پارتیدا، بەراســـتی دەزگاکانمان، قودرەتمان، هەموو ئیمکانیاتمان، تەســـەور ناکەین ئەوە نەجاحەت بێنێ تێکەڵاوی کەین، وا باشـــە لەســـەر بنەمایەکی پتەوی لە یەکتر تێگەیشتن،هاوسەنگ، هاوئاهەنگ، ئێمە یەکیان پێبگرێنەوە، ئەم دوو دەزگایە هەلومەرجەکە پێگەیشـــتووە یەکیان پێبگرینەوە من پێموایە هەلومەرجەکە پێگەیشتووە، رەنگە ماوەیەك بخایەنێ تا بنج و بنەوانەکەی لێکبدەینەوە.

*** ئەو کۆنفرانســـەی ١٢٠- تا ١٥٠ کادیری یەکێتی کەگوایا لە ئەدای سیاســـی یەکێتی و سەرکردایەتی رازی نین دەیانەوێت کۆنفرانسێك ببەستن، ئەو تێبینی و سەرنج و رەخنانەی هەیانە باس بکەن، هەروەها باس لەوە دەکرا کە هەندێك ئەندامی مەکتەبی سیاســـی یەکێتی بەشداری دەکەن، ئایا بەشـــداربوونی ئەو ئەندام مەکتەبی سیاسیانە پێشنیار کراوە، لە خودی مەکتەبی سیاسییەوە؟یان بەشداریکردنیان چۆنە؟**

- وەڵڵا پێش ئەوەی وەڵامت بدەمەوە، لە پرســـیارەکەی پێشووت باسی شتێکت کرد حەزم کرد روونکردنەوەیەکی لەســـەر بدەم، ئەویـــش ئەوەیە ئەمنی قەومی بەکارهێنرا، من پێموایە ئەوەی پێی دەڵێن ئاسایشی نەتەوەیی، وەکو سەردەمی جەنگی سارد، ئەو چەمکە باوی نەماوە. ئستا لە کوردستانی عێراق.

*** بەڵام ئەم چەمکە لە ئەمەریکاش هەیە.**

- ئیجازەم بدە. ئێســـتا لە کوردستان ئەو مەترســـییەی لە سەردەمی جەنگی سارد لەسەر ئەمنی قەومی هەبوو ئێستا نەماوە. ئەوەی کە پێی دەوترا ئاسایشی نەتەوەیی بەتایبەتی لەســـەردەمی جەنگی ســـارد زۆر بایەخیان پێدەدا، سەبەبەکەی ئەوە بوو لە

جیهان دوو جەمسەری گەورە هەبوو، ئایدۆلۆژیای جیاواز هەبوو لە دنیادا، فەلسەفەی جیاوازی زۆر توند هەبوو لە دنیادا.

*** پێتوانییە ئێستاش ئەم جیاوازییانە بە جۆرێکی تر دووبارە دەبنەوە؟؟**

- ئیجازە بدە. ئەم دوو ئایدۆلۆژی و فەلسەفە جیاوازە تێکەڵاو بە ..رۆ سیستەمی ئابووری و قودرەتمەندبوون لە دنیادا، لەبەر ئەوە ئەو چەمکانەی کۆن لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی قسەی لەسەردەکرا تێکەڵاو بە ئایدۆلۆژیای تازە و ململانێی فەلسەفەی تازەبوون لە سەردەمی جەنگی سارددا برەوی مابوو، بەڵام ئێستا لە ئەوروپا ئەو مەوزوعانە بە دیدێکی نوێتر سەیریان دەکرێت کە من بەش بەحاڵی خۆم پێموایێ بەشێوەیەك لە شێوەکان لەلای ئێمەش ئەوە راستە. ئێستا لە ئەوروپا ئەگەر کارەبا نەبێت ئەمنی نەتەوەیی دەکەوێتە مەترسییەوە.

*** ئەمنی قەومی خۆی ئەمنی دەوڵەتە.**

- ئەگەر ئاو نەبێت ئەمنی قەومی دەکەوێتە خەتەرەوە، ئەگەر خواردن نەبێت ئەمنی قەومی دەکەوتە خەتەرەوە، ئێستا ئەمنی خۆراك –غزاء- هەیە، ئەمنی تەندروستی هەیە، ئەمانە بۆ رای گشتی لە ئەوروپا و ئەمەریکادا مەسەلەی گرنگن، من لە تۆ دەپرسم لە بەرپرسانی هەردوو حزب و هەمو حزبەکان دەپرسم بە ویژدانت ئەوەندەی خەڵك لەسەر کارەبا لێمان بەگلەییە، لەسەر مەسەلە نەتەوەیەکان لێمان بە گلەییە.خەڵك ئەوەندەی لەسەر مەسەلەی ئاو لێمان بە گلەییە لەسەر مەسەلە نەتەوەییەکان لێمان بەگلەیین؟. لەسەر ماددەی ١٤٠ دەڵێن هەموو شتێك دەکەین، بەڵام خەڵك کە گەرمای دەبێت نارەزایەکی توند دەردەبڕێت، ئەمنی سیاسی، نەتەوەیی ئێستا بۆ یەکێتی و پارتی، تێکەڵاو بە خەدەماتی نەتەوەیی بووە.

ئێمە ناتوانین ئێستا بە سۆزی نەتەوایەتی پەتی، خەڵك گۆش بکەین بڵێین تۆ لە دەوری ئەم دوو حزبە بمێنەوە لەبەر ئەوەی داکۆکی لە زمانەکەت دەکات، داکۆکی لە کولتوورەکەت دەکات،داکۆکی لە کەلەپوورەکەت دەکات، ئێستا خەڵك خەدەماتە بنچینەیەکانی لە دەسەڵاتی تۆ دەوێت، ژیانی لە تۆ دەوێت، مەسەلەی نەتەوەیی بەتەنها تێری ناکا، ئێستا منداڵێك دەیەوێت بە جوانترین شێوە بچێتە مەکتەب، خوێندنگای زۆر جوان بێت، زانکۆی دەبێت زۆر جوان بێت، ئێستا وردو درشتی ئەم کۆمەڵگایەی ئێمە تێکەڵاو بە ئاسایشی نەتەوەیی بووە.ئینجا با پرسیاری ئەو کۆنفرانسەش بدەمەوە

ئەوانە کۆمەڵێك هەڤاڵی دڵسۆز لە کەرکووك راوێژیان لە نێو خۆیان کردبوو، بۆ

ئەوەی بەرچاوروونیەکی باشـــتر بدرێ بە ســـەرکردایەتی سیاسی هەردوولا، نەك هەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان، راوێژیان لەگەڵ هەموو مەکتەبی سیاسی کرد، لەگەڵ منیـــش راوێژیان کرد، وتیان ئێمە فکرەیەکی وامان هەیە، من هەندێك بیروڕام پێگوتن هەمووشیان قبوڵکرد، دەیانویست کۆنگرەی گەورە بکەن، شتی گەورە بکەن. وەلحاسل گەیشتنە ئەوەی پرۆژەیەك بنووسن.

*** کۆنفرانسەکە نەکرا؟**

کۆنفرانســـەکە تا ئێســـتا دوابڕیاری لەســـەر نەدراوە، لە دوا بڕیاڕدا گەیشتوونەتە ئەوەی پرۆژەیەك بنووسن بیروڕای خۆیان بخەنە بەرچاو، دواتر بیدەنە رای گشتی، لە راستیدا خراپ نییە خۆ ئەگەر ئێمە، لە باتی ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە کە ئێستا نیمانە، وەکو پێویســـت ئەو شتانەمان بۆ دیراسە بکات، کادیرەکانمان پەرۆشی ئەو کارەن، ئەمە یاخی بوون نییە لە سەرکردایەتی،بەپێچەوانەوە ئەمە پەرۆشییە بۆ ئەوەی سەرکردایەتی ئەو مەبادئە ستراتیژیەی کە هەیەتی باشتر وردی کاتەوە، لە کاروبارەکانی.

*** لەم دواییە بەڕێزان مام جەلال و کاك مەســـعودبارزانی سەرۆکی کوردستان، کاك نەوشیروانیان بینی، هەندێك دەڵێن بۆ ئەوە بووە ئەگەر پۆستی کاك نێچیرڤان تەواو بێت ئەوا ئەو پۆســـتەکە وەربگرێت، هەندێکیش دەڵێن داوایان لێکردووە دەوری خێر ببینێت، دەکرێت جەنابتان باس لەو وردە کاریانە بکەن کە باشتر ئاگادارن؟**

- بەشەکەی مام جەلال ئەوەی من لێی دەزانم دوور و نزیك قسە لەسەر ئەو مەوزوعە نەکراوە.

*** بەڵام لەماوەیەکی کورتدا چەند جارێك مام جەلالی بینی؟**

- جەنابی مام جەلال و کاك نەوشیروان دوو کەسن ئێستا هاوڕێتیان لە نیو سەدە نزیك دەکەوێتەوە، نە جەنابی مام جەلال دەتوانێ دەســـتبەرداری نیو سەدە لە خۆشەویستی و مێژووی هاوبەشـــی خەبات بێت، نە بەڕێز کاك نەوشیروان دەتوانێت دەستبەرداری ئەو مێژووە بێ و دەستبەرداری کەسایەتی مام جەلال بێت، لەبەر ئەمە ئەگەر بیروبۆچوونی جیاواز لە نێو یەکێتی نیشـــتمانی لە بەینی هەردووکیان لەسەر هەندێك پرسی ئیداری دروســـت ببێت خۆ پرســـی ئایدۆلۆژی لە بەینیان نییە، من پێموایێ بۆ هەردووکیان جێگای شـــانازییە پەیوەندییەکی شیاو لە نێوەخۆیان بپارێزن و ئەمە نموونەیەکی تازەیە لە ژیانی سیاسی کەسایەتییە گەورەکانی مێژوودا، خۆشتان دەزانن مام جەلال پیاوێکی زۆر دڵ فراوانـــە زۆریش بەوەفایە بۆ هاوڕێکانی خۆی بۆ پێشـــمەرگەکان بۆ هەموو

کادیرێك و بۆ هەموو کەسێك، لەم دانیشتنانە ئەوەندەی من بیزانم خۆ بڕیار بوو منیش تیایـــدا بم لـــە دەعوەتەکە کە من ئەم ڕۆژە کۆبوونەوەی تـــرم هەبوو، نەمتوانی بچمە دەعوەتەکە، ئەوندەی من بیزانم و پێموایە هەمووی دەزانم، دووروونزیك ئەو قـــسانە باس نەکراوە. کە جەنابت باسی دەکەی.

*** هیچ ئومێدێکی گەڕانەوەیان نییە؟**

- تا ئێستا لەم بارەیەوە کاك نەوشیروان هیچ بڕیارێکی تازەی نەداوە.

*** داواشی لێنەکراوە؟**

- نەمبیستووە داواشی لێکرابێت.

*** باشـــە لەم حاڵەتەدا،کە کۆنگرەی یەکێتی نزیکبۆتەوەو ڕەنگە بۆ ســـەری ساڵ ئەگەر ببەسترێت، ئەگەر باڵی ریفۆرم لە کۆنگرە نەبێت ئەوا باڵی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســـتان لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە تەواوی چك دەکات، واتا وشك دەکات و نامێنێ.**

- وەڵڵا هەر خۆی نەماوە، تا نەمێنێ.

*** ئەو کەســـانەی خۆیان بە چەپ دەزانن،تا ڕادەیەك ئایدۆلۆژیاییەکی کۆمەڵەیان تێدایە، ئێســـتاش ئەوانە هەر درێژبووەوەی کۆمەڵـــەی ڕەنجدەرانن، چونکە یەکێتیش بـــە ڕێگای ئەو کۆمەڵەیە بووە ئەو یەکێتییە نیشـــتمانیەی کە ئێســـتا هەیە، کادیرە ناوەندییەکانی ئێستایشی زۆربەی زۆریان هی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بووە.**

- ئەوەندەی من بیزانم ئاسەواری ئایدۆلۆژیای کۆمەڵە لە تەربیەتی کادیرە ئەساسەکانی مـــاوە، بەڵام لە حەقیقەتدا لە ڕێبازی یەکێتی نیشـــتمانی و لە کارپێکردنی یەکێتی نیشـــتمانی من نایبینم، خەیاڵی کۆکردنەوەی پاشماوەکانی ئایدۆلۆژیای کۆمەڵە لە نێو یەکێتی نیشتمانی لە مێشکی کەسێکدا نییە، هەموو کەسێکیش دەزانێت کەسێکی وەکو کاك نەوشیروان ئێستا هەڵوێستێکی جیاوازیشی هەبێت. ئەو بەرپرسیاری یەکەمی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەیە لە مێژووی کۆمەڵە، خۆ مام جەلال نەیوتووە هەڵبوەشێننەوە، ئەو تەحەمولی ئەو هەڵوەشانەوەی کردووە.

*** ڕەنگە مام جەلال پێی گوتبێ، بەڵام ئەو جێبەجێی کرد.**

- باوەڕ ناکەم، زرووفە سیاسییەکە لەو کاتەدا وا تەقدیر کراوە، وا باشە لە سەردەمی ئەنفال و کیمیاباران و دەربەدەریدا، وا باشبووە مەنتقی یەکگرتن زاڵبێت بەسەر خیتابی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

*** مام جـــەلال دوای ئەوەی نەخۆشـــکەوت دوو جێگری بۆخۆی دانا، پێشـــتر یـــەك جێگری هەبوو، ئایـــا ئەو دوو جێگرە گرفتی زیاتر دروســـت ناکات، ئەگەر تەنیـــا جێگرێکی هەبووایە باشـــتر نەبوو بۆ راپەراندنـــی کارەکان،بەتایبەت کە مام جـــەلال زۆربەی کاتەکانی لە بەغدایە؟ ئایا بە تەمان لە کۆنگرەش هەردوو جێگری بمێنێ؟**

- هەر شـــتێك لەســـەر کۆنگرە بلێم هەر پێشـــنیار دەبێت، لەبەر ئەوەی کۆنگرە کۆبوونەوەیە و دەسەلات لە دەستی کۆنگرە دایە، من هیچ شتێك لەمبارەیەوە نازانم، سەبارەت بە جێگرەکانی مام جەلال لە کۆنگرە چی دەخرێتە بەرباس، لیژنەیەك هەیە ئێســـتا ئامادەکاری بۆ هەموو مەســـەلەکانی یەکێتی دەکات، بە گەرمی خەریکن پەیڕەو و پرۆگرام، فیکری یەکێتی، سیاســـەتی یەکێتی تاوتوێی دەکەن و پرۆژەی خۆیان ئامادە دەکەن.

*** لە دیمانەی هەندێك لە ســـەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی یەکێتی باس لەوە دەکەن لە کۆنگرە (١٥) ئەندامی نوێ دەخەنە نێو ســـەرکردایەتی (١٥) کەســـیش خانەنشین دەکرێن، ئایا بەراستی شتێکی واتان هەیە؟**

- وەڵـــلا ئەوەندەی مـــن بزانم بەبێگومان، لـــە کۆنگرە هەندێك لـــە ئەندامانی ســـەرکردایەتی ئاڵوگۆڕ دەبن، بە حوکمی ئەوەی کادیرێکـــی باش لە نێو یەکێتی نیشتمانی پێگەیشتوون، هەمووشیان ئاماتجیان هەیە پێشبکەون لە نێو یەکێتی و لە ژیانی حزبی خۆیاندا، هەروەها هەندێك لە سەرکردەکانی یەکێتی نەیانتوانیووە، وەکو سەرکردە شـــتێکی گەورەتر، لە دوای دەرچوونیان لە دووەمین کۆنگرە پێشکەش بە یەکێتی نیشـــتمانی بکەن پێشکەش بەحکومەتی کوردستان بکەن، من تەسەورم وایە هەندێکیان دەگۆڕێن و کادیری تازە دێنە پێشـــەوە، پۆلێك لە ژنانی تێکۆشەری ناو یەکێتی نیشـــتمانیش خۆیان ئامادە دەکـــەن تا متمانە وەربگرن، لە گۆنگرە، هەم لە سەرکردایەتی و هەم ئەگەر بکرێت لە مەکتەبی سیاسیش شوێنی شیاویان هەبێت.

*** کەواتە لەلایەن خۆتانەوە هەندێك کەستان دەست نیشانکردووە بیانگۆڕن؟**

- من بەش بەحاڵی خۆم کەســـم لەبەرچاوم نییە. قسەشـــمان لەسەر ناوی کەس نەکردووە بۆ گۆڕین، بەڵام کۆنگرە گۆڕانکاری زۆری تێدا دەکرێت.

*** لەبەر ئەوەی مام جەلال لە ناکاو تووشـــی نەخۆشـــی بوو، مەکتەبی سیاســـی یەکێتی و تەواوی کادیرانی یەکێتی تووشـــی شۆك بوون، چونکە شتەکە زۆر کتوپڕ بوو، بیرتان لەوە نەکردۆتەوە بەتایبەتی تەمەنەکەی مام جەلال بتەوێت و نەتەوێت بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشیەکی دیکە نەبێتەوە، کەموعەرەزە تووش بێتەوە،ئایاکەسانی وا دێننەپێشەوە تا رۆڵی سکرتێری یەکێتی وەربگرن؟**

- ئەو مەوزوعانە وەکو عەرەب دەڵێن (صعب الرأی) ناشکرێت ئێمە ئێستا سکرتێرێکی زیندوومان هەیە، شـــوکر بۆ خوا ئێستا تەندروستی باشە، ئێستا دانیشین نە لەگەڵ خۆی نە لەنێوان خۆمان، قسە لەسەر ئەوە بکەین ئەگەر وەفاتی کرد کێ لە شوێنی ئەو دابنێین.

لە نێو ســـەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردســـتان و مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە کادیری زۆر بە ئەزموونی تێدایە، پێگەیشتوون و تەسەورشم وایە ئەگەر هەر کاتێك پێویست بکات بۆ هەر پۆستێك لە پۆستەکان دەشێ کۆنگرەیەك بۆ ئەم کارە ببەسترێت بۆ ئەو کارە و چی پێویستە بڕیاری لەم بارەیەوە بدرێت. بەڵام ئێستا ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە تۆ قسە لەسەر ئەو مەوزوعە بکەیت.

*** بەتایبەتی لەبەر ئەوەی مام جەلال لە بەغدایە و ســـەرقاڵە بە کێشـــەی سونە و شیعە و بەراستی ئەوەندە ناپڕژێتە سەر کوردستان؟**

- راســـتە مام جەلال لە بەغدایە بەڵام ســـەردانی کوردستانیش دەکات و ئێستاش ئامرازەکانـــی پەیوەندی بە دەقیقـــە دەتوانرێت پەیوەندی بکەیـــن، دوای ئەوە ئێمە ئۆرگانەکانمان ئیشی خۆیان دەکەن، هیچ جۆرە دابڕانێك نییە بڵێین ترسێکمان هەبێت نەتوانین ئێمە تەوجیهات وەربگرین، ئێمە وەکو یەکێتی نیشـــتمانی فێربووین، زۆرجار ئێمە بەرپرســـی گەورەمان لێ دابڕاوە ئێمە خۆمان ئیشـــی خۆمان کردووە، شەهید شـــەهاب ماوەیەکی زۆر لە کۆمەڵە دابڕا، چووە ســـوریا، چووە لوبنان، کۆمەڵە لێرە کاری خـــۆی هەر دەکرد، مـــام جەلال ماوەیەکی زۆر لە دەرەوەی وڵات بوو ئێمە لێرە ئیشی خۆمان دەکرد، ئێستاش چووە بۆ بەغدا، یەکێتی نیشتمانی ئەزموونی هەیە و کاری خۆمان دەکەین.

*** بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی لە نێوان یەکێتی و پارتیدا هەیە کە سەرۆکی حکومەت بە نۆرە بێت چەند مانگێکی دیکە یاخود ساڵی نوێ خولی ڕێژدار نێچیرڤان بارزانی تەواو دەبێت، ئێوە تا ئێستا کەستان دەست نیشان نەکردووە بۆ؟**

- پەلەمان چییە؟ ئێستا مانگی (٨)ە،چوار مانگی ماوە. ئیشی چوار سەعاتە.

*** لەبەر ئەوەی ئیشەکە ئیشی چوار سەعات نییە، بە دانیشتنێك تەواو نابێت.**

- بۆچی؟

*** لەبەرئــەوەی ڕەنگە ئەومەســـەلەیە بە بە بڕیارێکی فەوقی ســـەرنەگرێت، وەکو لە هەڵبژاردنەکانیش بینیمان.ئێوەی ســـەرکردایەتی یەکێتی چەند جەمســـەرێکن، کە لەیەکتری جیاوازن، هەڵبژاردنی مەڵبەندەکان باشـــترین نموونە بوو کە ناچار کرا مام جەلال لە بەغدا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی؟**

- ئەسڵەن مەسەلەی دانانی سەرۆکی حکومەت پێویستی بە هەڵبژاردن و ڕاپرسی نییە، ئەوە بڕیارێکە تەنیا مەکتەبی سیاسی دەتوانێ بیدات.

*** مام جەلال یان مەکتەبی سیاسی؟**

- مەکتەبی سیاسی. مام جەلال لە دانانی ئەم جۆرە کەسانە، هەتا لە دانانی عومەر فەتاحیش، مام جەلال لەســـەر هەموو مورەشـــەحەکانی نووسی بۆ هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاســـی پێش مانگێك بەر لە دەستنیشانکردن، نوسیبووی تکایە لەسەر ئەم مورەشـــەحانە ڕای خۆتانم پێبدەن. مام جەلال پێش ئەوەی کاك عومەر فەتاح دابنێت، نامەی بۆ ئێمە نووسی تا ڕای خۆمان لەسەر مورەشەحەکان بدەین، من دڵنیاتان دەکەم کە ڕەنگە مام جەلال خۆی لە کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاســـی دانەنیشـــێت بڵێ کێ دانەنێن یان دابنێن بۆ ســـەرۆکایەتی حکومـــەت، هەموو ئەندامانی پەرلەمانی عێراق و کوردســـتان یەك کەســـیان مام جەلال دای نەناوە، بۆ ئاگاداریتان، یەك دانەشی مام جەلال دانی نەناوە، بەڵکو مەکتەبی سیاسی داینا‌وە، هەر هەمووی مەکتەبی سیاسی داینا‌وە، لە مەکتەبی سیاســـیش کاك نەوشیروان و کاك حەمە تۆفیق و کاك د. کەمال فوئاد دایان نا.

*** ڕاستە، جاری وا هەیە دەڵێ ڕاتان وەردەگرم بەڵام شەرتە بە گوێیان بکات؟**

- من ئەوەندەیئەزموونم هەیە لەگەڵیدا. عادەتەن ئەو ڕایانەی کە وەریدەگرێت زۆرینە دەنگ بە کێ بدات ئەویش دەیدات بەو، زۆر جاریش شت خراوەتە دەنگدانەوە مام جەلال دۆڕاوە، لەگەڵ مەکتەبی سیاسی. ئێستا ئەم جارە لە دانانی وەزیرەکانی ئەم جارە، مام

جەلال هەندێکی قبوڵ نەبوو دەنگیشـــی بە هەندێك نەدا، بەڵام زۆرینە دەنگی پێدرا، هەیە ئێستاش وەزیرە، بردیانەوە.

*** کاك مەلا بەختیار ئێســـتا جەنابت کارگێڕی مەکتەبی سیاســیت، دوو پۆســت بۆگۆڕانکاری نزیك بۆتەوە یەکێکیان ســـەرۆکی حکومەتەو دووەمیشـــیان کۆنگرەی یەکێتییە، کە جێگری ســـکرتێری گشـــتی دادەنرێ، بە تەمای بۆ هیچ کام لەو دوو پۆستە خۆت کاندید بکەی؟**

- نەخێر بە تەمانیم بۆ هیچیان خۆم کاندید بکەم.

*** داواشت لێبکەن نایکەیت؟**

- داوا جیایـــە، خـــۆم جیام، من خۆم بـــە تەمای هیچیان نیم، تۆ پرســـیارەکە لە خۆم دەکەیـــت، ئەگەر دەتەوێت بزانی خەڵکی دیکە رایان چییە بچۆ لەوان بپرســـە، (بەپێکەنینەوە).

*** کاك مەلا بەختیار توانایەکی فیکری باشی هەیە، بەڵام توانا فیکرییەکانی زیاتر ئەو مێژووەیە کە ئەوی هێناوە بۆ ئەمڕۆ، بۆیە دەمانەوێ بزانین ئایا ئێســـتاش خۆی بە چەپ دەزانێ؟**

- ئێستا من خۆم بە ئاکار، بە فیکر، خۆم بە چەپ دەزانم، بەڵام پێموایە چەمکی چەپ و مەوقیعی چەپ لەم ســـەردەمەدا جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ ســـەردەمی جەنگی ســـارددا، دڵنیاشـــم لە دنیا نە یەك چەپ، نە یەك راست هەیە، من خۆم بە چەپی چەندین راست دەزانم لە کوردستاندا، ئێستا چەپێکی واقیعیم، چەپێکی خەیاڵی و نەزەری نیم.

*** ئیبراهیم جەعفەری لە ماوەی رابردوو هاتە کوردســـتان و پێشـــوازیی و رێزێکی زۆری لێنراوە، بەڵام کە گەڕایەوە داوای ئەوەی کرد کە سەرۆك کۆماری دەبێ بدرێتە عەرەبی سونە، بۆ ئەوەی هاوسەنگییەك دروست بێت لە نێوان هەموو لایەنەکان،ئایا لە کوردستان ئەوەی خستبووە روو؟**

- نەخێر.

*** لێرە هیچ رەزامەندییەك پەسندیەك نەبوو؟**

- نەخێر، هەرگیز.

*** دوای ئەوەی ئەو قسانەی کرد ئێوە رەخنەتان لێنەگرت؟**

- من نەمبیستووە، لە کوێ ئەم قسانەی کردووە؟

*** لە هەموو ڕاگەیاندن باس کرا.**

- بەناوی ئەوەوە بڵاوکرایەوە؟

*** بەڵێ بەناوی ئیبراهیم جەعفەری.**

- نەخێر گوتیان گوایە جەعفەری شتێکی وای لە خەیاڵە. یان لە لێدوانێکی ڕەسمی بەناوی خۆیەوە، قسەی کردووە؟

*** نەخێر بەڵام وەکو هەواڵ بڵاوکرایەوە.**

- وەکو هەواڵ بڵاوکرایەوە، بەڵام وەکو پرۆژەیەکی نووسراوێکی ئەو، نەبوو.

*** بەڵام ئەویش ئەوهەواڵەی بە درۆ نەخستەوە؟**

-من بــڕوا ناکەم بەڕێــز جەعفەری لەم دۆخەی ئێـــستای عێــراق تێنەگات کە کەســـایەتییەکی وەکو مام جەلال چەند زەرووڕە، بۆ ئەوەی ببێ بە پردی هاوبەشـــی هەموو لایەك.

*** خۆی زەرووڕەت شتێکە و بەرژەوەندی شتێکی ترە.**

- خۆ ئەویش زۆر پێی لەســـەر بەرژەوەندی داگرت و تێگەیشــت کە بەرژەوەندی لە شتەکانی دیکە دانابڕێت.

*** ئێستا ئەمەریکا هەژموونی بەسەر کوردستان و عێراقەوە هەیە، هەروەها هەژموونی بەگشـــتی بەســـەر دونیاوە هەیە، بەڵام لە بەغدا ئێســـتا لەلایەك دەیەوێت مالیکی ســـەرکەوتووتر بێت و هاریکاری دەکات، کەچی لەلایەکی ترەوە هاریکاری عەللاوی دەکا، لە کاتێکدا عەللاوی دەیەوێت حکومەتی مالیکی بڕووخێنێت چاودێران و خەڵك ئەوە لێکدەدەنەوە کە ئەمەریکا نایەوێت ســـەقامگیری لە عێراقدا هەبێت، بۆیە ئەگینا بۆچی دوو هێزی نەیار کۆدەکاتەوە و یارمەتی هەردووکیان دەدات؟**

- ئەوەی ئێمە زانیومانە، عەللاوی لەلایەن دەوڵەتە عەرەبییەکان پشـــتیوانی دەکرێ، ئێســـتا ئەمەریکا پشـــتیوانی ناکات، ئەو کۆنگرەی لە قاهیرە بەسترا ئەمەریکا دوور نزیك پێی باش نەبووە.

*** بـــەڵام ئەمەریکا ماوەیەك عەللاوی کردە ســـەرۆك وەزیـــران، ئەگینا عەللاوی نەدەگەیشتە ئەو قۆناغە.**

- بەڵێ ئەوە قۆناغێکی دیکە بوو، ئێســـتا قۆناغێکی دیکەیە. ئەوە قۆناغی پێش دەستوور بوو، سەقامگیرنەبوونی هێزەکان بوو، قۆناغێکی زۆر زۆر ناسك بوو بەراستی، ئەوە تێپەڕی.

*** دوای ئەو وەزعەی کە ئێستا لە عێراق هەیە، هیچ ئومێدێکی چارەسەری سیاسی نییە لە عێراقدا، ئەگەر کورد داوای جیابوونەوە بکات، یان داوای جۆرێك لە سەربەخۆیی بکات ئەمەریکا پێت وایە هەڵوێستی چۆن دەبێت؟**

- یەکەم: ئومێدی چارەسەر هەیە، بەڵام ئەو هێزەی ئەو تەوژمەی کە ئەو ئومێدە بەدی بێنێ هێشتا زۆر بەهێز نییە.

دووەم، ئایا ئەمەریکا لەگەڵ ئەوەیە پرۆژەی دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ کوردستان ئێستا بێتەدی، ئەوەندەی ئێمە بیستوومانە نەخێر.

*** پێتوانییە ئەمە لەم روانگەیەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەوە (١٦) ساڵە کوردستان ئازادیەکی باش ئازادە، بەڵام دیبلۆماسیەتی کوردی لاواز بووەو نەیتوانیوە لە هەموو کەناڵە جیاجیاکان دەرگایەك بکاتەوە، دیبلۆماسیەتی خۆی بەهێزتر بکات، بۆیە تا ئێستا نەمانتوانییوە نە رای وڵاتانی ئیقلیمی، نە رای وڵاتانی دنیا بۆ خۆمان رابکێشین کە لەگەڵ سەربەخۆیی ئێمەدابن، بەتایبەتی ئەمەریکا کە ئێمە هاوکاریشیان دەکەین؟**

- من پێموانییە ئەمە پەیوەندی بە دیبلۆماسیەتی کوردییەوە هەبێت، بەپێچەوانەوە دیبلۆماسیەتی کوردی گەیشتە سەر ئەوەی بۆ دوو سەرۆکی کورد فەرشی سوور لە زۆربەی کۆشکەکانی دونیادا رادەخرێت، وە ئەجندای سەرۆکەکانی کورد ئەنجدایەکی سیاسی دەوڵەمەندە ئێستا کە سەردانی ئەوروپا دەکەن، بۆ خۆشتان دەبینن کە یەکێتی ئەوروپا و ئەمەریکا، وڵاتە گەورەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا هەر هەمووی بایەخێکی زۆر بە سەرکردایەتی کورد دەدەن، ئەم مەوزوعە ئەوەندەی پەیوەندی بە ململانێی ناوچەکە و کێشەکانی دەوڵەتانی ئیقلیمی، مەسەلەی دەوڵەتانی عەرەب یهەیە، ئەوەندە پەیوەندی بە قودرەتی ئێمەوە نییە، چونکە ئێستا هەموو دنیا شاهیدی ئەوەن ئێمە قودرەتی خۆ ئیدارەکردنی خۆمان سەلماندووە، شاهیدی بۆ ئەوە دەدەن و دەشزانن ئەم قودرەتە، قودرەتی دەوڵەتێکی سەربەخۆشە.

*** مەبەستم ئەوەیە ئێستا ئەمەریکا لە عێراق سەری لێ تێکچووە نازانێت چۆن چارەسەری دۆخەکە بکات.**

- بەعەکسەوە عێراق سەری لە ئەمەریکا تێکداوە (بە پێکەنینەوە).

*** باشــه تۆش هەســت ناکەی ئەمەریکا بەرامبەر بە کورد زۆر بە خاوی هەنگاو دەنێت؟**

- ئەمەریکا هەموو شــتەکان بەیەك دەبەســتێتەوە تەنیا مەســەلەی کورد بە تەنیا نابینێ. ئەمەریکا سیاسەت، بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان، کێشەو گرفتەکانی دەوڵەتانــی عەرەبی و ئێران، ئێران و تورکیا، پرســی تورکیــا و دەوڵەتانی ئیقلیمی، کوردستانی تورکیا، ئەمانە هەمووی دەخاتە بەرچاو، عادەتەن سیاسەتی ئەمەریکاهەر وابووە، سیاســەتی ئەمەریکا ئەوە نییە خۆی پرۆژە بێنێ بڵێ برۆ میللەتان جێبەجێ بکەن. هەمیشــە ئەمەریــکا لە دوای پرۆژەکانەوەیە. کــە میللەتێك خۆی پرۆژەیەك تەقدیم دەکات و سوور دەبێت لەسەر پرۆژەکەی، ئینجا ئەمەریکا دێتە نێو کێشەکە و بە پێچەوانەی جارانی یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی دەوروبەری کە هەمیشە خۆیان پرۆژەیان هەبــوو بۆ خەباتی هەندێك لە گەلان لەو ململانێیەی کە لەگەڵ ئەمەریکا هەیانبوو، یەکسەر لایەنگری ئەوەبوون ئەو وڵاتانە رزگار بن ببن بە دەوڵەت ئەنجوومەنی ئاسایش یەکێتی سۆڤیەت دیفاعی لەو دەوڵەتانە دەکرد کە بەرژەوەندییە ستراتیژیەکەی لەگەڵیان بوو، ئەمەریکا هەتا بزانە لە ئەوروپای رۆژهەڵات چەند وڵات دروست بوو، ئەمەریکا لە ســەرەتاوە نەیووت مافتانە ببن بە دەوڵەت، بە پێچەوانەوە لەگەڵ هەندێکیان ناکۆك بوو، بەڵام کاتێك سوو بوون لەسەر شتەکانیان، ئەمەریکا گوتی حەقی خۆیانە دوایشی کەوت.

*** بەڵام ئەوروپای رۆژهەڵات جیاوازییەکی تێدابوو، ئەوروپا تەدەخولی دەکرد.**

- بــەڵام لە ســەرەتاوە تەدەخولی نەکرد. دوای ئەوەی گــەرم بوو ئینجا تەدەخولی کرد.

*** بابێینە سەر حزبە ئیسلامییەکان: هەندێکجار کاك مەلا بەختیار لە بەرامبەر حزبە ئیسلامییەکان هەڵوێستی توندی هەیە، هەندێك لە حزبە ئیسلامییەکان وای لێکدەنەوە کە ئەمە سیاســەتی یەکێتی نیشــتمانی نییە، کاك مەلا بەختیار خۆی شەخســی هەڵوێستی توندە لە بەرامبەریان، ئایا ئەو تەسەورات و تاوڕادیەك تێبینی و هەندێکجار رەخنانە، لە بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی کوردستاندا فیعلەن ئەمە رای خۆتە یاخود ئەمە سیاسەتی یەکێتییە؟**

- با من موناقەشە لەسەر توند بکەم، من لە تۆ دەپرسم توند مانای چییە؟ من پیاوێکم خۆم بە دیموکرات دەزانم، خۆم بە عەلمانی دەزانم، بە ئەرکی خۆم دەزانم کە خزمەت بە

رۆشنگەری،خزمەت بە قۆناغی جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت بکەم، هەموو ئەم چەمکانە لەلایەن هەموو هێزە ئیسلامییەکان قبوڵ نییە، هەر چۆن قسە لەسەر ئەمە دەکەیت دەڵێن توندە، سەرخستنی ئەم پرۆژەیە لە قۆناغی مۆدێرنەتەدا لە ئەوروپاش ململانێی توندی تێکەوت یاخود تێینەکەت؟، هێزێکی ئیسلامی،یا هێزێکی مەسیحی، یا جولەکە، هەیە بەرنامەی ستراتیژی هێزە دیموکراتەکان قبوڵ بکات، بەخوا شتی وانییە، لەبەر ئەوەی وشەی توندی لێدەرکە، ئێمە دوو دنیای جیاوازی فیکری فەلسەفەین، بێگومان من ئەو بە کۆنەپەرست دەزانم،ئەویش من بە توند دەزانێ و پێیوایە من دژی دینم ئیلحادم، جۆرەها تۆمەتم بۆ دروست دەکات، کە لە مێژوودا هەر وابووە، نەك هەر ئێستا (٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر مێژوو هەر وابووە، ئەسڵەن ڤاتیکان و پاپا و تا سەردەمی مۆسۆلینی داکۆکیان لەم ئیتیجاهە مێژووەی خۆیان دەکرد، هەتا لەگەڵ مۆسۆلینیش بوون، ئەمە مەوزوعێکە ئەمە دوو پەیامی ناکۆکی مێژووییە، ئەمە سەبارەت بەمە، من لە تۆ دەپرسم، جارێکی تر لە هەموو کەسێکی رووناکبیر دەپرسم، ئەگەر ئێمە خەبات بۆ ئەم چەمکە مۆدێرنانە، رۆشنگەرییانە، مەدەنیانە دیموکراسیانە لە وڵاتی ئێمە جێبەجێبێت و زۆرترین پانتایی بۆ پەیدا دەکەین، هێزەکانی تری نامۆدێرن، نا عیلمانی، نا دیموکراتی لە شەرمان دەوەستن؟، بستێکمان بە قەرز دەدەنێ؟ رەحممان پێدەکەن بۆ ئەوەی خەڵاتمان کەن لەو بارەیەوە؟ نەخێر. نابێت وا سەری بکەین، ئێمە دوو ستراتیژی ناکۆکین ئەوان خەبات بۆ ستراتیژی خۆیان دەکەن ئێمەش خەبات بۆ ستراتیژی خۆمان دەکەین. ئێمە دەبێت لەوان زیاتر گەرم و گورتر بین لەبەر ئەوەی ئەوان ١٤٠٠ ساڵ باکگراوندیان هەیە، ١٤٠٠ ساڵ تۆی ئەو بیروڕا و ئەندێشە، مەزهەب و شەرع و ئەوانە چێنراوە بۆ ئەوان ئێمە تازە بە تازە زەوی دەکێڵین، هێشتا ئێمە چاوەڕێ بکەین. چاوەڕێی گۆدۆ بکەین، ئەمە لەلایەك. سەبارەت بەمە ئەمە رەئی خۆمە یاخود هی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، لە نێو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا هەموو ئۆرگانەکانی یەکێتی خەریکی دیموکراتی و خەریکی عیلمانیەتن، رەنگە من لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە دەرکەوتبین زاتی زیاتری هەڵوێستی دەربڕینمان هەبووە تا ئێستا. ئەوانیش دەیانەوێت بەمجۆرە قسانە، خەڵك سارد کەنەوە، کە کاریگەری ئاراستەکانی عیلمانیەتی ئێستا، خەڵك دوور دەخەنەوە بەم قسانە، لەبەر ئەوە نابێت بەم قسانە دەست خەڕۆبین دەبێ سووربین لەسەر ئەم قسانە، من لە تۆ دەپرسم یەکێتی نیشتمانی چەند جار لیژنەی تەحقیقی بۆ من داناوە، محاسەبەم بکات لەسەر ئەم بیروباوەڕانەی، کە تەرحی دەکەم، هیچ جار.

*** باشه كەواتە تۆ بڕوات بەوە هەیە ئیسلامی سیاسی میانڕەو توندڕەو هەیە یاخود هەموویان لە یەك چوارچێوەی گشتی دان؟**

- یەك نەهجن،بەڵام مەنهەجی جیاوازیان هەیە.

مەنهەجەكەیان مەعلومە چییە، نەهجەكەشـــیان جیاوازی تێدایە، لەبەر ئەوە بەش بە حاڵی خۆم وەكو شـــتە دوورەكان باوەڕ ناكەم لە ئیسلام نەرم و توند هەبێت، بەڵام وەكو شتە ئاینییەكان وەكو قۆناغەكە بەڵێ لە نێوان هێزە ئیسلامگەراكان نەرمڕەوی تێدایە، توندڕەویشـــی تێدایە. لە دوائەنجام لە كوێ یەكدەگرنـــەوە بێگومان لە یەك نەتیجە یەك دەگرنەوە ئەویش ســـەپاندنی حكومەتی خوایە، حكومەتی تێكســـتە پیرۆزەكانە، حكومەتی شـــەرعە كە قابیلی قبوڵی موناقەشـــەكردن نییە. من لە تۆ دەپرســـم لە جوندلئیسلام و ئەنسار ئیســـلام تاوانبارتر هەبوو، بۆچی هەموو ڕۆژێك پێشمەرگەی ئێمەیان شـــەهید دەكرد كەچی هەموو هێزە ئیسلامییەكانی دیكە بە ئارەزووی خۆیان بە نێو ئەواندا دەهاتن و دەڕۆیشـــتن هیچ موشكیلەشیان نەبوو، بۆ؟ لەبەر ئەوەی ئەم هێزانە ئامانجی ستراتیژیان یەكە.

*** زۆر جار لە ڕۆژنامەی چاودێر هەوڵی لێكترازانی ریزەكانی حزبە سیاسییەكان بە گشـــتی دەدرێت، وەكو لە هەواڵ و ڕاپۆرتە هەواڵەكان پێداگیری لەسەر شتێك دەكات كە رەنگە بۆ زروفی ئەمڕۆ زۆر پێویست نەكات،**

- كوا؟

*** بۆنموونە، زۆرجار لەســـەر وەزارەتی ڕۆشـــنبیری كۆمەڵێك شـــتتان بڵاوكردەوە، نموونەی تریش زۆر هەن، هەست ناكەیت هەندێكیان زێدەڕۆیی تێدایە، یاخود پێویست ناكات تا ئەو رادەیە شتیان لەسەر بنووسرێت؟**

- من خۆم لە برایانی مەســـئولی پارتیم بیســـتووە بەم نزیكانەش بیستوومەتەوە كە دەڵێن چاودێر ڕۆژنامەیەكی ســـەنگینە. هەموو هەواڵەكان وەكـــو یەك بڵاودەكاتەوە، جیاوازیش ناكات لە نێوان ئەملاو ئەولا ئەمە یەكەم، دووەم، هەواڵێك دەســـت دەستەی كارا دەكەوێـــت وەكو خۆی تەعامولی لەگەڵ دەكات هیچ جیاوازییەك لە ناوچەكانی جارانی یەكێتی و ناوچەكانی پارتی و وەزیرەكانی پارتی و وەزیرەكانی یەكێتی ناكات و ئەمە تەوجیهی سەرەكی من بووە بۆ چاودێر، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر سەیری چاودێر بكەیـــت، لەبەر ئەوەی ئێمە خۆمان لـــەم ناوچانەین زۆرترین هەواڵەكانی ئەم ناوچانە، رەخنەكانی ئەم ناوچانە، بڵاودەكەینەوە.

*** باشــە کاک مەلا بەختیار کێشەیەکت لەگەڵ محەمەدی حاجی قادر هەبوو، من خۆم خوێندوومەتەوە کە مەلا بەختیار ئامادە دەبێت. دوای ماوەیەک محەمەدی حاجی قادر لە هەولێر کۆبوونەوەیەکی ڕۆژنامەگەری بەست و گوتی مەلا بەختیار ئامادەی دادگا نابێت کێشەکان گەیشتوونەتە داداگا؟**

- دەمەوێــت بڵێم دڵنیاتان دەکەم نازانم ناوی ئەو پیاوە بە تەواوی چییە؟محەمەدی کوێ؟

*** محەمەدی حاجی قادر.**

- محەمەدی حاجی قادرە، مەلاقادرە ئێستا بێتە ئەو ژوورە نازانم کێیە، ڕەنگە سێ کەس بێنە ژوورەوە، نەزانم کامیان محەمەدییی کێ؟ حاجی قادرە، هەواڵێك لە چاودێر لەلایەن دەســـتەی کارا بڵاوکراوەتەوە، من ئاگاداریش نەبوومە حەز دەکەم بزانیت، من ئەمە یەکەم جارە ئەم قسانە دەکەم بۆ ئەوەی شتەکانت لەلا ڕوونبێتەوە، من ئاگاداری هەواڵەکە نەبوومە، من بە حوکمی ئەوەی سەرنووســـەرم ئـــەو برادەرە هەقی خۆیەتی شـــکایەت لە سەرنووسەر بکات ئەگەر شـــکایەتەکە منی گرتۆتەوە، بەڵام هەواڵەکە منی نەگرتۆتەوە، من لە کاتی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە هەر لە ســـلێمانی نەبووم، بە هـــەر حاڵ، من گوتم هەر کاتێك دادوەر بڕیـــار بدات ئامادە دەبم، بەڵام دوای ئەوەی پارێزەرەکەی مـــن کەوتە نێو مەوزوعەکان و ڕێککەوتنەکانی نێوان یەکێتی و پارتی و دادی ئێمە و ئەوانی لێکدایەوە،، ئەو جۆرە شـــکایەتانە بە حوکمی ئەو مەوقیعەی کە ئێمە هەمانە ئاســـاییە نەقڵبکریت بۆ دادگای ســـلێمانی، پارێزەرەکەم چوو بۆ هەولێر داوایەکی وەهای داواکردن، بەڕێز دادوەری قەزیەکە گوتبووی پێویست ناکات، نەقڵی بکەین، نابێت نەقڵ بکەین ئەم قســـەیەی گەیشتووە لای بەڕێز وەزیری داد، وەزیری داد گوتبووی نەخێر ڕێککەوتن هەیە، دەبێت ئەم قەزیە بۆ ســـلێمانی نەقڵ بکرێتەوە، ئەم ٢٤ی مانگە بۆم دانراوە بچم بۆ دادگا ئەگەر من لێرە بووم ١٠٠٪ دەچمە دادگا، لێرەش نەبم پارێزەرەکەم بەبێگومان دوای دەخات تا دەگەڕێمەوە.

*** باشە کاک مەلا بەختیار دیارە جەنابت لە خانەقین ڕۆڵێکت بینیووە، ئەوەی تێبینی دەکرێــت خەڵـــك ڕازین لێت، بەڵام دەڵێن لەبەر ئەوەی بـــەو بەڕێوبەرانە مەلا بەختیار داینـاون، ناتوانن بڕیار بدەن تا پرسیار بە تۆ نەکەن؟**

- وەڵاهـــی من گلەیی ئەوەم هەیە، کە پرس بە من ناکەن، ئەمجارەیان کە چوومەوە خانەقیـــن بۆ ماوەی چوار پێنج ڕۆژ لە خانەقین و دەوروبەری بووم، کۆبوونەوەیەکم بە

دائیرەکانیش کرد، چوار لیژنەی تەحقیقیشـــمان دروســـت کرد، بۆ ئەوەی تەحقیق لەو دائیرانە بکەن بۆ ئەوەی لەبەرچی ئەدائیان باش تر نەبووە.

من بەش بە حاڵی خۆم، شتێك کە پەیوەندی بە خانەقین و بەغداوە هەبێت، پەیوەندی بە خانەقین و دەوروبەری هەبێت، مومکینە راوێژ بە من دەکەن. بەڵام خۆ بڕیارەکانی رۆژانـــە کـــە دەیان بڕیار لە خانەقیـــن دەدرێن من ئەو کاتەم نییە تـــا بۆ ئەم هەموو بڕیارانە پرســـیارم پێبکەن، خۆشیان ئێستا تەجروبەیان پەیدا کردووە، سەرکەوتووبوون لە کارەکانیدا.

*** باشـــە ئەدی ناوچەکانی سەعدیە و، مەندەلی، جەلەولا، خەڵکەکەی ئەوێ دەڵێن دەســـەڵاتی کوردی دەســـتی لە ئێمە شوشـــتووە، هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە ئێمەش بەشـــێکین لە کوردستان، وەکو خانەقین، ئەو شـــوێنانەی کە بایەختان پێداوە، ئەوانتان فەرامۆشکردووە.**

- من ئەم قســـەیە رەتدەکەمەوە، سەرەڕای ئەوەی کە هەمووتان دەزانن، کە کێشە لە جەلەولا زۆرە کێشـــە لە ســـەعدیە، لە مەندەلی زۆرە، باشترین بەڵگە ئەوەیە کە ئێستا هێزی پێشـــمەرگە لە ســـەعدیە لە نەفتخانە لە جەلەولا بە ئاسایشـــەوە بە پۆلیسەوە ناوچەکەیان کۆنترۆڵ کردووە، تیرۆریســـتەکانیان تەفروتونا کردووە، ئەگەر ئێمە هیچ پەیوەندیمان بە جەلەولا و ســـەعدیە نەبێت بۆچی دەچینە ناوجەرگەی تیرۆریســـتان، سەدان پێشمەرگەش دەبەین بۆ ئەم شوێنانە، بۆچی دەیبەین، ئەمە خاڵێك، خاڵی دووەم، لە مەندەلی و نەفتخانە جەلەولا ئەوەندەی پێمان کرابێت خزمەتمان پێشـــکەش کردوون لە تەعینات، لە پۆلیس لە ئاســـایش لە دابینکردنی پێداویســـتییەکانیان، لە سەیارە، لە خوێندنگاکان، لە جادە و بان، زۆر شـــتمان پێشـــکەش کردوون لە بواری کشتوکاڵی بەڵام خۆتان دەزانن، ئەو خزمەتەی پێشکەشی ئەو ناوچانە دەکرێت لە داهاتی جارانی ســـلێمانییە، خۆ ئێمە هیچ داهاتێکی زیادمان نییە، بودجەیەکی جیاوازمان نییە، بۆ کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردســـتان، بە حەقیقەت بە سوپاســـەوە ئێمە داهاتی ئیدارەی جارانی سلێمانی بۆیان دەبڕێنین.

هەموویان هاوکاریمان دەکەن، مەمنونیانین، نە خەڵکی کەرکوك و نەخەڵکی خانەقین هیچ داهاتێکیان بۆ ســـەر حکومەتی جاران و ســـلێمانی جـــاران نییە، هەرچییەکیان بۆکرابێت، کارمان کەمکردووە کارمان زۆر کردووە ئەم قســـەیە لابەن، هەرچیەکمان بۆ کردوون لە خەدەماتی ئێرە دامانبڕیوە دامانە بەوان.

*** باســـی خزمەتگوزاریمان کرد، ئەوەی تەســـور دەکرا دەیانگووت هەموو شوێنێك پێویستە وەکو سلێمانی لێبێت، ئاوەدانی و کاری خزمەتگوزاری زۆری تێداکراوە، بەڵام دوای ئەوەی حکومـــەت یەکتری گرتەوە، کارەکان هاتنە بەرچاوان دیاربوون پرۆژەکان زۆر بە سستی لە سلێمانی بەڕێوە چوونەوکەس خۆزگە بە سلێمانی ناخوازێت، تەنانەت لە ســـلێمانی خەرجی تێچوونەکەش تێدا بزربووە، بۆچی لە سلێمانی ئیش بەمشێوەیە دەکرێت؟**

- بەراســـتی باپێـــت بڵێم لە ســـلێمانی کۆمەڵێك هەڵە کرابوو ئێســـتا ئێمە باجەکەی دەدەین، نەك هەر لە ســـەردەمی حکومەتەکەی کاك عومەر فەتاح بەڵکو لە ســـەردەمی حکومەتەکانی تریش، نەخشەی زانستی ورد نەبوو، کۆمپانیاکان قودرەتی جێبەجێکردنی پرۆژەکانیان نەبـــوو. ئەو کۆمپانیا بێگانانەی چ هی ئێران، چ هی تورکیا بنجوبنەوانی گرێبەســـتەکانیان لەگەڵی یەکلانەکرابۆوە، قابیلیەتی جێبەجێکردنی ئەو کۆمپانیانە وەکو پێویست دیراســـە نەکرابوو، موراحاتی سیاسی زاڵکرا بەســـەر نەخشە زانستییەکەی کە دەبوو ئەنجامیبدەن، ئەوە ماوەیەك پێمانەوە دیار نەبوو، وردە وردە دەرکەوت کە ئەمە هەڵە بـــووە، ئەوە ماوەیەکە خەریکین باجی هەڵەکان دەدەینەوە، ئەوە ماوەیەکە خۆتان دەبینن لەو کۆمپانیانە دەپێچرێتەوە، کۆمپانیا خراونەتە گیروگاز، هەروەها ســـەردانی مەسئولین بۆ پرۆژەکان ئێستا دەستی پێکردووە، زۆر بە گەرمی، ئینزار کراون لە ماوەی دیاری کراوی خۆیـــان دەبێت کارەکانـــی خۆیان تەواو بکەن، هەندێك لـــەو کۆمپانیایانە هەقیان هەبووە هەقەکانیان پێدراوە، تووشـــی زەرەربوون هەقەکانیان پێدراوە، ئەوە جادەی سلێمانی-دوکان بە گەرمی ئیشـــی تێدادەکرێت، هەروەها جادەی سلێمانی-عەربەت، عەربەت بەرەو سەید ســـادق خەریکە ئیستیلامی کەین، ئەمە جگە لەوەی لێرە پرۆژەیەکی زۆر جێبەجێنەکراوە راستە ئێستا بە خۆشـــحاڵییەوە گۆڕانکارییەکی باش لە هەولێرەوە دەبینین ئەمە مانای دڵخۆشـــییە، هێشـــتا هەولێر ئەزمەی زۆر گەورەی هەیە. یەکێك لـــە ئەزمە گەورەکان ئەزمەی ئاوەڕۆیە، شاری ســـلێمانی بچووکترین ئەزمەی ئاوەڕۆی نییە، شاری هەولێر لـــە ٨ ملیار تا ١٢ ملیـــار دۆلار بودجەی دەوێت بۆ ئەوەی ئـــاوەڕۆی هەموو هەولێر جێبەجێبکات.

*** ئاخر هەولێرئێستا لە سلێمانی زۆر گەورەترە.**

- باشە بۆیە بودجەی زیاتری دەوێتن بنەمایەکی گرنگی هەر شارێك دەبێت ماستەرپلانی بۆ دانرێت، بەبێ ئەوەی ژێرخانەکەی ئاوەڕۆکەی چارەســـەر بکەین، باقیەکەی دەبێ بە

بارێکی قورس.

*** هەست ناکەن ئەم لێپێچینەوە زۆر درەنگ وەخت بووە؟**

- بەڵـــێ، لـــەم بارەیەوە درەنگ بووە، دەکـــرا پارەپێرار ئەم لێپێچینـــەوە بکرابوایە، لە حەقیقەتدا دەرکەوت درەنگ خستنی کار، کار پەك دەخات

*** دەکرێ هەندێ کەست لێ بپرسم، رەئیت لەسەریان بدەی؟**

- بەسەر چاو..

*** رات بەرامبەر ســـالار، سالار عەزیز، جاران دۆستی خۆت بووە، بزانین ئێستا رەئیت لەسەری چۆنە وەکو خۆی، وەکو سالار؟**

- کاك ســـالار تێکۆشـــەرێکی ماندووی ئەم شۆڕشـــەیە، پێم وابـــێ ئەیتوانی لەمە سەرکەوتووتر بێ لەسیاسەت

*** بەڵام نەبوو؟**

- ئەوە وەڵامەکەم بوو..

*** پشـــکۆ نەجمەدیـــن؟ بەتایبەتی بـــەو دواییەی کە ئـــەو وتارانە لە ســـایتەکان بڵاودەکاتەوە؟**

- ئەقڵێکـــی پـــاك و قەڵەمێکی پـــاراوی هەیە، بەڵام ئەزموونە سیاســـییەکەی هی مەسئولەتی گەورە نەبوو..

*** حاجی مەمۆ؟ جیا لەوەی کە برادەرایەتی و برایی..**

- پیاوێکی ماندووە، رەوشـــتێکی کۆمەڵایەتی بەرزی هەیە، بەڵام زۆرجار ئیحساسی خۆی تێکەڵاو بە سیاسیەت و بە مەسئولیەت دەکات..

*** ئێ خۆی هەر سەرکردایەتی بوو، واتا چۆن ئیحساسی خۆی تێکەڵاو بە سیاسەت ئەکات؟**

- پێت ئەڵێم..

*** کاك نەوشیروان؟**

- کاك نۆشیروان یەکێکە لە پاکترین قەڵەمە کوردەکان وەکو توانا.

*** قەڵەم؟!!**

- یەکێکیشـــە لە سیاسەتمەدارە ماندووەکان و رۆژگارێکی زۆر سەخت و ناخۆشی لەم شەڕو شۆڕشە بردۆتەسەر، بەڵام پێموایە ئەویش وەکو هەمووومان دەبێ بە تەواوی سیستەمی بیرکردنەوەو مامەڵەی خۆی و چۆنییەتی سەرکردایەتیکردنی خۆیدا بچێتەوە..

*** قادر عەزیز؟**

-بەراستی پیاوێکی ماندووە..

*** ئەوانە هەموویان ماندوونە؟**

-ئیجازە بدە، پیاوێکی ماندووەو پیاوێکی بە ئەزموونە، بەڵام پێم وانیە ماندووبوون و ئەزموونەکەی بەشـــێوەیەکی پێویستی ئەوتۆ سوودی لێ وەرگرتبێ کە ئێستا ئاست و ئاراستەیەکی بەرزتری هەبێ لەرووی کارا.

*** فەرمیدون عەبدولقادر؟**

-کاك فەرمیدون یەکێکە لە کەسە بەتواناکان، بەڵام بەداخەوە چارەنووسی وای لێهات کە لە سیاسەت دوور بکەوێتەوە.

*** چارەنووسەکە، خۆی دروستکەری ئەم چارەنووسە نەبوو؟**

-من پێم وانییە هیچ کەســێك، نەك هەر ئەو، هیچ کەســێك چارەنووسی بەچاك یا بەخراپ بشــکێتەوە بە وازهێنان یا بە بەردەوامی تێکۆشـــان بشکێتەوە خۆی بەشێکی گرنگی مەسئولیەتەکەی هەڵنەگرێ..

قادر عەزیز کەسایەتییەکی سیاسی نیشتمانی دیارە لە کوردستاندا، هەمیشە هەوڵی داوە لە ژیانی سیاسی خۆیدا، هەژموونی خۆی، هێزی خۆی هەبێت و دەهەنبەر ئەوانی دیکە دەوروبەری خۆی نیشانی بدات، لەناو حزبی سۆشیالیست نەیدەتوانی ئەم هەژموون و هێزە بەرامبەر هەندێك لە سەرکردایەتییەکان بەکاربێنێ و لە بنەڕەتیشدا حزبی سۆسیالیست حزبێکی پەرتەوازە بوو، بەڵام ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر کە کاك قادر عەزیز دروستی کرد لە شاخ، بەرهەمێکی ئەوتۆی لێ دەرنەچوو کە چاوەڕوانی دەکرد، چونکە رێبازی ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێڕ، وەك لینین بە وردی باسی دەکات، قۆناخێکی تێکۆشانە، پێش گەیشتن بە سۆشیالیزم.

قادر عەزیز لەبەر ئەوەی گوتاربێژ (خەتیب)ێکی زۆر سەرکەوتوو نەبووە، رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە نەتوانین بە جەماوەری بوونی، چونکە زۆرجار بەهۆی گوتاربێژی سەرکەوتووەوە، دەتوانی زۆرترین کەسی لە جەماوەر، ئامادە بکەی، بۆمەبەستێکی دیاریکراو، زۆرن لەو سەرکردانەی توانیویانە لە ژیانیاندا سوود لە گوتارە سەرکەوتووەکانیان وەربگرن، هەر لە هیتلەرەوە تا دەگاتە مام جەلال و تەنانەت مەلا بەختیار و زۆری دیکە.

قادر عەزیز لەماڵێکی متەوازعدا دەژی، لە کاتی پرسیارکردنیشدا، دەتوانی تورەی بکەی، هەندێ جار کە لە وەڵامی پرسیارەکاندا قسەش دەکات، دواتر هەست بە پەشیمانبوونەوە دەکات، ئەم دیمانەیە رەنگە هەندێك حەقیقەتی کاك قادر عەزیزمان نیشان بدات، ئەگەر بە وردی سەرنجی لێ بگریت.

***کەی بووی بە پێشمەرگە؟**

- قوربان من لەساڵی ١٩٧٤ پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بووم، بەڵام بەهۆی هەرەسهێنانی شۆڕشەکە ماوەی پێشمەرگایەتییەکەم کەم بوو من ئەوکاتە لە قەسرێ بووم، لەسەر دەورەی سەواریخ بووم، سەواریخی ملیۆتکە هەبوو، سادریان پێدەگوت، دژی دەبابە بوو. دەورەی ئەو سەواریخانەمان لە قەسرێ لە یەکێ لە سەربازگەکانی ئێرانی کرد.

*** دوای نسکۆی شۆڕش، کەی پەیوەندیت کردەوە؟**

- دوای ئەوە، ماوەیەك چووینە ئێران، ئێمە هەرماڵیشمان لەمەهاباد بوو، دوای ئێرانی سەردەمی شا بڕیاریدا چی پەناهەندەی کوردی عێراقە بیانگوازنەوە شارە دوورەکانی ئێران، ئەوکاتە بیرمان کردەوە ئەگەر ئێمە بچینە ئەو شوێنانە جارێکی دیکە دەستمان بە عێراق ڕاناگا. لەڕاستیشدا ئێمە بەرنامەی شۆڕشکردنمان هەبوو، ژمارەیەکی زۆریش بووین.

***ئەو بەرنامەیە کەی هەتانبوو؟**

- دوای هەرەسی شۆڕش زۆربەی ئەو کادیرانەی ئامادەی قبوڵکردنی هەرەسهێنانەکە نەبوون و زیاتر لەبیری بەرگریکردن و شۆڕشکردن بوون، هەرزوو کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی چەند کۆبوونەوەیەك بکرێ تا بزانرێ چی بکرێ. ئەوانە ژمارەیەکی زۆر بوون، بۆ نموونە من، عەلی عەسکەری، د.خالید، شەهید علی هەژار، د. مەحمود، کاردۆ گەلاڵی، شەهید سەعدی و مەلا ناسح بوون، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەکادیران، لە ئورمیەو لە مەهاباد و چەندین کۆبوونەوە کرا کە چی بکرێ باشە، هەموو لەو رایەدابوون کە ئەو هەرەسهێنانە بەفاکتەرێکی دەرەکی بووە، ئەوە هەرەسهێنانی بەرگریکردنی خەڵکی کوردستان نییە، چونکە تا چەوساندنەوەو زوڵم و زۆری هەبێ، ئەو بەرگریکردنە هەر بەردەوام دەبێ. لەبەر ئەوەی ئێمە دەبێ سەر لەنوێ بیر لە دروستکردنەوەی مقاوەمەت بکەینەوە، بەڵام ئەمجارە لەبەر ئەوەی شەڕی بەرەیی لەتوانادا نییە، دەبێ هەوڵ بدەین شێوازی شەڕی پارتیزانی بگرینە بەر. بۆیە ئەو کەسانەی کە لە کۆبوونەوەکە بوون وتیان کاکە دوو ڕێگامان لەپێشە، ئەوەی بە نیازی شۆڕشکردنە دەتوانێ بگەڕێتەوە عێراق، ئەوەی نیازی شۆڕشکردنیشی نییە دەتوانێ یا بچێ بۆ ئەورووپا، یا بۆ خۆی ئێران دەیگوازێتەوە بۆ شارەکانی دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان. واتە ئێمە ئەو کۆمەڵە کەسە بە نیازی شۆڕشکردن گەڕاینەوە عێراق، ئەو کاتە من قسەم لەگەڵ برادەران کرد، گوتم کاکە ئەگەر بۆ شۆڕشکردن نەبێ ناگەڕێمەوە عێراق، چونکە من سەڵتم، بۆخۆم دەچم لە ئەورووپا دادەنیشم،یان کارێکی دیکە دەکەم.

***کە گەڕانەوە بێگومان نەفی کران..**

- کە گەڕاینەوە ئەو کاتە ڕژێمی عێراق لە لێبووردنە گشتییەکەشی پاشگەز ببووەوە، وەجبەی دووەمی ئەوانەی عائدونیان پێدەگوتن هەمووی ڕەوانەی باشووری عێراق کرد، ئێمە ژمارەیەکی زۆر بووین چووین بۆ دیوانیە، لەبەغداش شـــەهید ســـاڵح یوســـفی و ژمارەیەکی دیکە لەبیری ئەوەبووین ڕێکخراوێکی سیاسی دروست بکەین.

*** کێ داهێنەری ئەوبیرۆکەیە بوو؟**

- ئەو فکرەیە سالح یوسفی لەسەرووی هەموویان بوو، ئەوانی دی شەهیدان د.خالید، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی، عەلی عەســـکەری، عومەر دەبابە، تاهیری عەلی والی و ڕەســـول مەمەند کە ئەو کاتە لە بەغدا لە کۆلیژی یاســـا دەیخوێند، ئەو ژمارە کادرو سەرکردانە لەبیری دروستکردنی ڕێکخراوێکی تازە بوون. بەراستی ڕێکخراوێك کە ناومان لێنابوو هێزی ســـێیەم لە کوردستان، واتە دووربێ لە هەیمەنەی هەردوو باڵەکەی پارتی کە ئەوکاتە پێیاندەگوتن جەلالی و مەلایی دوایی بوون بە یەکێتی و پارتی. ســـەرەنجام گەیشتینە ئەوەی بزووتنەوەی سوسیالیستی کوردستان دروست بکەین.

***ئەو ناوە کێ پێشنیاری کرد؟**

-من لەو کۆبوونەوانە بەشداریم نەکردووە.

*** نەشتزانی لەسەر پێشنیاری کێ بوو؟**

-نا، بەڵام دەزانم ئەو ناوە لەو کۆبوونەوانە بڕیاری لێدرا. خۆی فکرەی دروســـتکردنی بزووتنـــەوەی سۆسیالیســـت هەر لەدوای تێکچوونی شۆڕشـــی ئەیلـــول هەبوو، بەڵام ئیعلانکردنەکەی دواکەوت و کەوتە ســـەرەتای ساڵی ١٩٧٦. من لە شوباتی ١٩٧٦ کە ئەوکاتە لە بەغدا بووم، ئەندامی بزووتنەوە بووم.

*** کە چوویتە شاخ، پلەت بووە چی؟**

-ئەو کاتە یەکێتی نیشـــتمانی لە دیمەشق دروســـتبوو، پەیوەندیکرا لەنێوان یەکێتی و بزوتنەوە، بەرەحمەت بێ کاك عومەر دەبابە ڕەوانەی لای مام جەلال کرا. لەوێ تەنسیقێك کرا کە بەو مانایە ئێوە وەرنە شـــاخ و ئێمەش لە شاخین. چەك و ئیمکانیاتێکی زۆریش پەیداکـــراوە. وەرن بە یەکـــەوە خەباتی چەکداری دەکەین. ئەوەبوو بەپێی ئەو تەنســـیقە بزووتنەوە (باڵی عەســـکەری بزووتنەوە، نەك هەموو بزووتنـــەوە) بڕیاریدا ئەو کادیرانە بچنە شـــاخ کە دەتوانن کاری پێشـــمەرگانە بکەن، بەشێکی سەرکردایەتی بزووتنەوە لە ناوەوە بمێننەوە، ئەوانەی کە مانەوە ســـالح یوسفی، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی، شێخ

محەمەد شـــاکەلی و کۆمەڵێکی دیکە بوون. ئەوانەی کە هاتن بۆ شـــاخ کران بە دوو وەجبە، وەجبەی ئێمە عومەر دەبابە، د. خالید، ســـەید کاکە، شـــەهید سەعدی، من و شەهید یاسین قادر بووین. ئێمە لە هەولێرەوە هاتین بۆ قەندیل بە یەك رۆژ لە ١٩٦٧/٨/٨ هاتینە دەرێ، وەجبەکەی دی شـــەهیدان عەلی عەسکەری، تاهیر عەلی والی و حەمە غەفور و کۆمەڵێك کادیرو سەرکردەی دیکە، ئەوانە لە سلێمانیەوە پەیوەندیان کرد.

*** کە چوویە دەرەوە پلەت بوو بەچی؟**

- من ســـەرەتا پێشمەرگە بووم تا لقی هەولێر لەســـاڵی ١٩٧٧ دروست بوو، ئەوکاتە بوومە ئەندامی لق، دوای شـــەڕی دەشتێ کە ئەوکاتە شـــەهید سەعدی فەرماندەی هەرێمی ٨ بوو، من ماوەیەك بووم بە فەرمانددەی هەرێمی هەشت.

***بەو ئیعتبارەی برازای سەعدی گچکە بوویت؟**

- نەوەڵڵا پەیوەندی بەوە نەبوو.

*** ئەی چۆن لە ئەندامی لقەوە یەکسەر بوویتە فەرماندەی هەرێمی هەشت؟**

-ئاخـــر ئامـــر هەرێم و ئەندامی لق زۆر لێك دوور نەبوون. ئەوکاتە ســـەید کاکە لای ســـەرکردایەتی کاتی پارتی گیرابوو، کەســـێکی ئەوتۆ نەبوو لەلای ئێمە، بۆیە منیان دەستنیشـــان کـــرد، من ماوەیەکی کەم ئامـــر هەرێم بووم، دوایی من لە کۆنفرانســـی بزووتنەوەی سۆسیالیســـتی کوردستان کە لە نەورۆزی ســـاڵی ١٩٨٧ لە نۆکان کرا،٣ کەس بوونە ئەندامی یەدەگی سەرکردایەتی، من ئەندامی یەدەگی یەکەم بووم، ئەحمەد فەقێ رەش و محەمەد فەتحوڵڵا کە هەردووکیان شەهید بوونە، یەدەگی دووەم مەسیرەی هەکاری کە عەلی عەســـکەری و د. خالیدو ئەوانە تێیدا شەهید بوون، ئیتر ئێمە بووین بە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە.

*** بەپێی قسەکانی سەید کاکە، ئەو رۆژەی سەعدی گچکە شەهید بوو، تۆ دەورێکی ئیجابیت نەبووە، پێشـــمەرگەتان تەســـلیم بە حکومەت کرد، لەبەر ئەوەی تۆ شارەزای رێگاکە بووی و بریندارەکان شارەزانەبوونە.**

- من لەکوێ شارەزابووم. لەژیانمدا یەکەم جارم بوو ئەوێ ببینم، بەشەویش بینیم.

*** دەتزانی رەبایەی حکومەت لەپێش ئێوە هەیە؟**

- نەخێر. کۆبوونەوەی سەرکردایەتی هەبوو، ئەوکاتە بەس شەهید سەعدی سەرکرایەتی بـــوو، نامەیەکی مـــام جەلال هات کە ئێمە بگەینە ناوچەی نـــۆکان و زەڵێ، ئێمە ئەو هێزە بەناوچەی چیای کۆسرەت دا چووین لەناوی دوکان پەڕینەوە چووین بۆ ئاسۆس،

شەوەکەی لە گوندەکانی ئەو ناوەبووین، بۆ بەیانیەکەی دەمانویست بڕۆین بۆ مەنتیقەی هەڵشــۆیێ. تومەز دوژمـــن موتابەعەی ئەو هێزەی کــردووە، زۆریش لە ئێمە داخ لە دڵ بوون، چونکە ئێمە زەربەی زۆرمان لە رژێم دابوو، دەیانویســـت فورســـەتێکیان بۆ هەڵکەوێ و تۆڵەمان لێ بکەنەوە، یەکێ لەو کێشـــانەی ئێمە لەو شـــەڕەدا هەمانبوو، ئەوەبوو نەشارەزابووین، یەك کەسمان شارەزای ئەوێ نەبووین، وەك ئەوەی بە هەلیکۆپتەر بتبەن لەوڵاتێك داتبەزێنن کە ئەســـڵەن نەزانێ کوێیە، تەنها ئاگری قەڵادزەمان دەدیت، دەمانزانی ئەوە شاری قەڵادزێیە. شـــوێنەکە لە رۆژهەڵاتی قەڵادزێ بووە، دەوریشیان گرتیـــن، کەمین هەبوو، ئەوەبوو لەو شـــەڕە زەرەرمان کرد. کە ئێمە تێکەوتین، ناوچەکە هەمووی دەغڵ بوو، شـــاخ نەبوو، ئاســـۆس لە پشـــتمان بوو، ئێمە لەبەرامبەر گوندی دەشـــتێ بووین، شەهید ســـەعدی کۆیکردینەوە موحازەرەیەکی بۆ داین، ئێمە ٤٥ کەس بووین، چل کەســـمان چەکدار بووین، ٢ کەس هەرئەوشەوە پەیوەندیان پێوە کردبووین، لە ســـەیدەکانی گۆمەشینێ بوون، چەکمان نەبوو بیاندەینێ. شەهید سەعدی گوتی کاکە ئەو شەڕە خۆمان هەڵمان نەبژاردووە، بەپێی یاسای پارتیزانی هەر شەڕێك خۆت کات و شـــوێنی هەڵنەبژێری تۆ زەرەر دەکەی. کات و شوێنی ئەو شەڕە دوژمن هەڵیبژاردووە. کە هێزێکی زۆری هێناوەتە ناوچەکەو شاخەکانی گرتووە. ئێستا ئێمە کەوتووینەتە داوی دوژمن، بەڵام ئێمە ئەو پێشـــمەرگانەین کە گوتوومانە یان کوردستان یان نەمان. لەبەر ئەوە بەرگری دەکەین تا شەهید دەبین. ئێمە لەو ماوەیە زەرەری زۆرمان لە دوژمن داوەو پێشمەرگەشین و ئەوە شەڕەو هێزەکە زۆر نابەرابەرە، لەوانەیە لەو شەڕە زۆر زەرەر بکەین و لەوانەشـــە کەسیشمان دەرنەچین. جا بەڕاســـتیش وا بوو نزیکەی ١٤ شەهیدمان دا، لەگەڵ ئەو کەســـانەش کە دوای ئیعدامکران، شەڕەکە دەستپێکرد، جەبهە کە دابەشکرا من لەلایەکی جەبهەکە بووم، لەگەڵ هەندێك پێشمەرگەی دیکە شەڕ گەرم بوو، ئەوان بە هەلیکۆپتەر و هێزێکی زۆر دەوری ئێمەیان دا.

*** راستە دەڵێن لەو شەڕەدا تەقەت نەکرد؟**

- من لەهەمووان زیاتر مقاوەمەم کرد.

*** ئەی ئەوەی سەید کاکە باسی دەکا؟**

- ســـەید کاکە لە شـــەڕەکە رایکرد. ئەو گردەی کە ناوی گردەچێوە موسەیتەر بوو لەســـەر بەرەی شەڕ، ئەو گردە بەسەید کاکە سپێردرابوو، سەید کاکە ئەو گردەی بەرداو مقاوەمەی نەکرد، شـــەهید ســـەعدی لە گرتنەوەی گردەکە شـــەهید بـــوو، ئەو گردە

گیرایەوەش، یەکێ لەوانەی کە ئێستا ماوەو لەگەڵ شەهید سەعدی بوو، بەکر حەمەیە، کە ئێستا لای پارتی ئامر لیوایە، گوتی گردەکەشمان گرتەوە، بەڵام یەك لەسەربازە بریندارەکان سەلیەکی تەقاندو شەهید سەعدی شەهید کرد، ئەوکاتە سەعات ٥ر٣ی عەسر بوو تەبعەن شەڕەکە ١٩٧٨/٣/٨ بوو، دەبوایە ئێمە سێ سەعاتی دیکە شەڕ بکەین، ئەو گردەش کە موسەیتەر بوو دوای شەهیدکردنی سەعدی حکومەت گرتییەوە، بریندارمان زۆر بوون، ئەو بریندارانەی سەید کاکە باسی کردووە بەلای ئێمە دانەهاتووە، بەپێچەوانەوە بیستمان دەستیان رادەوەشاند تەسلیم ببن، دیاربوو فیشەکیان پێ نەمابوو، ئێمە لەلایەکی جەبهەکە بووین، قۆڵی ئێمە ٤ کەس بووین، من، رەشید گەزنەیی، شەهید ئەحمەد ئامۆزای جەمال کوردە کە دوایی شەهید بوو، لەگەڵ سەید حوسێن گۆمەشینی ئەویش برنۆی پێبوو. من و ئەو چەند پێشمەرگەیە بووین. کە سەعدی شەهید بوو و گردەکە گیرا، مەترسی زۆر بوو، سەید کاکە یەکسەر دەو ئاوو دەوئاو لێیدا لەگەڵ یەك پێشمەرگەش بەناوی کەریمە سوور.

*** ئەو دەڵێ من بەناو قوەتەکەدا رۆیشتم؟ بەڵام قادر عەزیز خۆی دزییەوەو رۆیشت.**

- جا ئەو چ دەڵێ، من ئاوات پێ دەڵێم، تۆ رای من وەردەگری. بەرەی شەڕەکەی بەجێهشتبوو، شەڕەکەی بۆ ئێمە مایەوە، پاش ئەوە ئەحمەد شەهید بوو، ئاخیری سەید حوسێنیش لە ئێمە دابڕا، ئەوەی کە مایەوە سەعات ٨ ی شەو بە یەکەوە دەربازبووین، من و رەشید گەزنەیی و جەمال کوردە بووین، کە ئێستا هەردووکیان لەهەولێر ماون. رەشید ئێستا فەرماندەیەکی پارتیەو جەمال کوردەش بێلایەنە، کە لەشەڕەکەش بریندار بوو، تۆ دەتوانی بۆ زانینی حەقیقەتی شەڕەکەی لە ٣ کەس بپرسی، جەمال کوردە، بەکر حەمە، رەشید گەزنەیی کە هەر سێکیان لەشەڕەکەدا دەوری قارەمانانەیان هەبوو، زۆر ئازابوون ئەوکات چەواشەکارییەکانی سەید کاکە دەردەکەوێ.

*** واتا بەپێی قسەکانی تۆ بێ، سەعدی گچکە لەنێوچەوانی سەید کاکە شەهید بوو؟**

- نیوچەوان نەبوو، ئەوە شەڕبوو.

*** بەڵام ئەگەر گردەکەی بەجێنەهێشتبا، ئەو شەهید نەدەبوو.**

- بەڵێ ئەوە رای هەمووانە، تۆ دەتوانی بۆ ئەو شەڕە لەکاك نەوشیروان و مەلا بەختیار و مام جەلال بپرسی، کاك حاجی حاجی برایم باشترین سەرچاوەیە، دەتوانی

لێی بپرســـی، بزانی هەقیقەتی ئەو شەڕە چۆن بووەو ئەمەش بزانە یەکێ لە هۆیەکانی شەهید بوونی سەعدی گچکە ئەوەبوو کە سەید کاکە گردەکەی چۆڵ کردبوو. من پێت دەڵێم ســـەید کاکە لە شەڕەکە رایکرد. تۆش وەکو رۆژنامەنووسێك دەتوانی بچی پرسیار بکەی لەو کەســـانەی ماون، بەڵام سەید کاکە بۆ شاردنەوەی ئەو کردەیەی خۆی پەنا بۆ ئەو قسانە دەبات.

*** چ لە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکانی سەید کاکەداو چ لەو دیمانەیەی کە لەگەڵماندا کردووە هەستدەکەین پەیوەندییەکی ناتەبیعی لەنێوانتاندا هەیە، دروستبوونی ئەو پەیوەندییە لە ئینشقاقەکەوە دەستی پێکرد، یان پێشتر؟**

- پێشـــتر. ســـەید کاکە خۆی یەکێك بوو زۆر نزیك بوو لە ئێمە، بە ئیعتبار خەڵکی مەنتیقەیین و ناســـیاوین، بەڵام لەسەر ئسلوبی ئیشکردن، من هەمیشە دژی سەید کاکە بووم. راستە سەید کاکە کابرایەکی ماندوو بوو، پێشمەرگەو تێکۆشەر بوو، بەڵام کابرایەکی عەشایەر بوو. بەشێوازێکی زۆر عەشایەری کاری دەکرد، ئەو کەسانەی کە لەناوچەکاندا کاری خراپیان دەکرد، بەتایبەتی فەرماندە عەســـکەرییەکان ئێمە موحاسەبەمان دەکردن، ســـەید کاکە ژێر بەژێری پارەی لێوەردەگرتن و چاوی لێدەپۆشین هەمیشە شەڕی من لەگەڵ سەید کاکە ئەوەبوو کە کابرایەکی عەشایەری بوو.

*** ئەو دەڵێ سەرکردایەتی حیزبی سوسیالیست یارمەتی ئێمەی نەداوە، بۆیە هێزەکان لەهەر شوێنێك بوونایە ناچاربوون بچن دەواجنانە کۆبکەنەوە؟**

- دەواجنانە کۆکردنەوە بەشێوەیەکی رێك و پێك ئاسایی بوو، بەڵام ئەی راوە رووتەکە چی بوو، بەشێکی زۆریان راوە رووتیان دەکرد، کە سەید کاکەش پێی ئاگاداربوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانەی راورووتیان دەکرد هەر یەکەیان مانگانە ١٠٠ دیناریان بۆ ســـەید کاکە دەنارد چاوی لێدەپۆشین.

*** ئەی بۆ سەرکردایەتی حیزب ئەو وەزعەی رانەدەگرت؟**

- ئەوان چاویان لەسەید کاکە دەپۆشی، من لەگەڵی توند بووم.

*** بەڵام سەید کاکە دەڵێ بۆیە نەیاندەتوانی من موحاسەبە بکەن، چونکە سۆسیالیست هەمووی من بووم، دەڵێ من لەناو سۆسیالیسیت دەرچوویام کەسیان نەدەما.**

- نەخێر. ئەوە کاکە حەمەش وا باس دەکا. ئاخر حزبێکی وابوو بۆیە هیچ نەبوو

*** بـــەڵام رەنگـــە راســـتییەکی تێدابـــێ، چونکە ئێـــوە وەکو ئەفەنـــدی بوون لە سەرکردایەتی.**

- کێ ئەفەندی بوو!؟ ئەو هەموو شـــەڕو کێشـــانەی لە دەشتی هەولێر هەبوون سەید کاکە نەدەوێرا بێت، من دەهاتم. خۆ شۆڕشـــی ئەو جارە هەمووی ئەفەندییەکانی شـــاخ کردییان.

*** ســـالح یوسفی کەســـێکی ئیشـــتراکی نەبوو، واتا بڕوای بە مارکسییەت نەبوو، کەچی ئێوە ئەوتان کردە سکرتێری حیزبی سۆسیالیست، ئێوە لە گۆڤارەکەتان دا باستان لە سۆسیالیســـتی زانستی و لینین و مارکسیەت دەکرد، کەچی سالح یوسفی نەك هەر بڕوای بەوانە نەبوو، بەڵکو بڕوای بە گۆڕینی رژێمی سەدامیش نەبوو، بەڵکو دەیویست چاکسازی لە رژێمی بەعسدا بکرێ.**

- خـــۆی ئەوکات مارکســـییەت و سۆســـیالیزم لەدنیادا برەوی هەبـــوو ئەوەی کە سۆسیالیستیش نەبوو، دژیشی نەبوو. سالح یوسفی کەسێکی دیموکراتخوازبوو، ئاشتیخواز بوو، بێگومان راســـتدەکەی کابرایەکی سۆسیالیست نەبوو، بەڵام کە دەیدیت خەڵکەکەی زیاتر بڕوایان بە سۆسیالیســـتەو یان رێکخراوەکە رێکخراوێکی سۆسیالیستە دژی ئەوە نەبوو. لەبەر ئەوەی بەهەموو پێوەرێك وەکو کەســـایەتی، وەکو تەمەن و رۆشنبیری، ئەو لە هەموان شایســـتەتر بوو بۆ ســـکرتێری ئەو رێکخراوە، واتە هیچ کەسێك مونافیسی نەبوو لەناو بزووتنەوە.

*** بەڵام دوای سالح یوسفیش کەسێکتان دانا وەکو سەرۆك عەشیرەتێ وابوو-...**

- نا، ســـەرۆك عەشـــیرەت نەبوو، کاك رەسول ئەسالیبی عەشـــایەری هەبوو، بەڵام پیاوێکی تێکۆشـــەر بوو، خوێندەواربوو، باوەڕیشی بە سۆسیالیزم و ئیشتراکییەت هەبوو، وەك تۆ دەڵێی عەشایەر نەبوو، بەڵام پەیوەندی عەشایەری هەبوو.

*** رەسول مامەندیش مونافیسی نەبوو؟**

- نا، کەس مونافیســـی نەبوو، لەبەر ئەوەی بەهەموو پێوەرێك لەهەمووان شایســـتەتر بوو.

*** بزووتنەوەو یەکێتی شۆڕشـــگێڕان و کۆمەڵە سێ رێکخراوی ناو یەکێتی بوون. تۆ ئەوکات پەیوەندییت لەگەڵ یەکێتی چۆن بوو.**

- با بۆت روون بکەمەوە وەکو باســـمکرد بزووتنەوە لەناوخۆدا دوای شۆڕشی ئەیلول دروســـت ببوو، یەکێتی نیشتمانی لە دەرەوەی وڵات دروست ببوو، هەماهەنگی لەنێوان

ئــەو دوو ڕێکخراوە هەبوو کە بە یەکەوە ســەرکردایەتی خەباتی چەکداری بکەین، کە هاتینە شــاخ یەکێتی نیشــتمانی بەرنامەیەکی هەبوو بەناوی نیمچە بەرە، بەپێی ئەو بەرنامەیە لەهاوکاری نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوە، خەتی گشتیش لەناو یەکێتی نیشتمانی بەو ئاراســتە بــوو کە لە داهاتوویەکی نزیــك ئەو چوارچێوە نیمچــە بەرەییە ببێ بە بەرەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ئەو حزبانە وەکو بەرە هاوکاری یەکتر بکەن. بەڵام کاتــێ بینیمان یەکێتی نیشــتمانی بەپێچەوانەی ئەو بەرنامەیەی کە خۆی خســتییە ڕوو، ئاراســتەیەکی دیکەی وەرگرتــووە، وا ئیش دەکا بۆ ئــەوەی ببێ بە حزب، ئەو ڕێکخراوانــەش کە لەو نیمچە بەرەیەدان زوو یــا درەنگ ناچار دەبن خۆیان لەو حزبەدا بتوێننــەوە، بزووتنەوەش ئەو تەرحەی قبووڵ نەبوو، گوتمان ئەگەر یەکێتی دەبێ بەبەرە لەبەر ڕەچاوکردنی بارودۆخەکە هاوکار دەبین، بەڵام ناکرێ بزووتنەوە خۆی لەناو یەکێتیدا بتوێنێتەوە، چونکە بزووتنەوە ڕێکخراوێکی سیاســی جیاوازەو بیرکردنەوەشی لە یەکێتی جیاوازە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بزووتنەوە لە نیمچە بەرەی یەکێتی جیابووەوە.

*** دوایی لە نەورۆزی ١٩٧٩ ڕەســول مامەند جیا بووەو بارەگای ســەرکردایەتی لە گۆڕەشێر دانا.**

- کاك ڕەسول جیانەبووەوە، بزووتنەوە جیابووەوە بۆ ئاگاداریت!

*** ئایا پێشتر ڕاوێژی لەگەڵ ئێوە کردبوو کە لە یەکێتی جیا دەبێتەوە؟**

بەڵێ ئەو جیابوونەوەیە دوای مشتومڕێکی زیاتر لە دوو ساڵ هات، کە ئەگەر یەکێتی بەو ئاراستەیە بڕوات بزووتنەوە چیتر ناتوانێ لەناو ئەو نیمچە بەرەیەدا بمێنێتەوە، ئەوەبوو دواجار گەیشتینە ئەوەی کە بزووتنەوە خۆی لە یەکێتی جیابکاتەوە، کە لە ١٩٧٩/٣/٢١ بزووتنەوە بڕیاری جیابوونەوەی خۆی لەو نیمچە بەرەیەی یەکێتی نیشتمانی ڕاگەیاند. بۆ ئەمەش تووشــی کێشەو شــەڕ نەبین، چونکە بارەگاکەی ئێمە لە زەڵێ بوو، ئەوان لە توژەڵــەو نۆکان بــوون و تێکەڵاوبووین، بۆ ئەوەی تۆزێك لەبەریــەك بچینەدەرەوەو دوور بکەینەوەو حەساسییەت دروســت نەبێ، ئێمە پێمان باشبوو لەرووبارەکە بپەڕینەوەو بچیــن بۆ گۆڕەشــێر، بارەگاکانمان بردە ئەوێ، دوای ئەمەش کە ئەو هەڵوێســتەمان وەرگرت، جارێکی دیکە داوامان لە یەکێتی نیشتمانی کردەوە، گوتمان ئێمە لەبەر ئەوەی پێشــمەرگەمان بە یەکەوەو تێکەڵاوین، چار ناچارە دەبێ هــاوکاری یەکتربین، ئەگەر ئێمە نەمانتوانی لەچوارچێوەی ئەو نیمچەبەرەییەی یەکێتی نیشــتمانی ئەو هاوکارییە بکەین، بەڵام دەکرێ ئێمە جۆرێ لە هەماهەنگی یان بەرەیەکی نیشــتمانی لەنێوانماندا

دروســـت بێ، بەڵام سەرکردایەتی یەکێتی (ئەمەی رەتکردەوە)و گوتیان یان دەگەڕێنەوە ناو یەکێتی نیشتمانی، یان شـــەرتان دەکەین. ئەوەبوو شەڕو کێشەیەکی زۆر لەنێوانماندا دروستبوو.

***دەڵێـــن لەســـاڵی ١٩٧٩ نوێنەرێکتان هەبوو لـــە بزووتنەوە بۆ نـــاو کۆبوونەوەکانی یەکێتی؟**

ـــ نوێنەر نەبـــوو. تۆ ئەو زانیاریانـــەت زۆر دوور بە دوور وەرگرتـــووە. تەجروبەی نیمچەبەرەی یەکێتی نیشـــتمانی، تەرجروبەیەکی تازەبوو، سیغەی وا لەناوچەکە نەبوو، ســـەرکردایەتی ئەو بەرەیە پێکهاتبوو لە دوو نوێنەری بزووتنەوە، دوو نوێنەری کۆمەڵە، لەگەڵ مام جەلال وەکو سکرتێر. ســـەرەتا نوێنەری بزووتنەوە شەهید عەلی عەسکەری و شـــەهید رەســـول مامەند بوو، دوای ئەوەی عەلی عەسکەری شەهید بوو، کاک رەسول کێشـــەی زۆری لەگەڵ مام جەلال هەبوو. بۆ ئەوەی ئەو کێشانە کەم بینەوە، بزووتنەوە لەکۆبوونەوەیەك منی دەستنیشـــانکرد کە نوێنەری بزووتنەوە بم لە مەکتەبی سیاســـی یەکێتی، ئەوەبوو تا جیا بووینەوە من نوێنەری بزووتنەوە بووم.

*** دەڵێن نوێنەرایەتییەکەت کێشەی تێدابوو، هەمیشە لەو کۆبوونەوانە گرفتت دروست دەکرد بۆ بزووتنەوە.**

- بۆ بزووتنەوە!؟

*** بەڵێ؟ چونکە نەدەگونجای؟!**

ـ نا، لەگەڵ یەکێتی کێشەمان هەبوو، ئەوکات خۆت دەزانی گەنج بووین و زۆرشتمان بە تونـــدی وەردەگرت، توندڕەوییەکی زۆر هەبوو لە مەســـەلەکان، زمانی دایەلۆگ و لێکتێگەیشـــتن لەنێوانماندا لاواز بوو، زۆر جار مام جەلال باســـی ئەوە دەکا دەڵێ ئەگەر عەقلی ئێستامان هەبا، ئەو کێشانە نەدەبوو. بەراستی بیرکردنەوەکانی ئەوسا وابوو، کێشە زۆر بوو، بەتایبەتی زۆر جار لەنێوان من و مام جەلال وەکو سکرتێر کێشە روویدەدا، چونکە بەراستی غەدریان لێدەکردین و زۆرجار مام جەلال فەرق و جیاوازی دەکرد لەنێوان ئێمەو کۆمەڵە، منیش بەوە رازی نەدەبووم. ئەوە کێشەکان بوو، ئەگینا من قەت کێشەم دروست نەکردووە، پەیوەندییەکە خۆی پەیوەندییەکی ئاڵۆز بوو لەنێوان بزووتنەوەو یەکێتی، زۆرجار ئەو پەیوەندییە گرژی زۆری تێدەکەوت.

*** ئێوە کە یەکەمجار تووشـــی شـــەڕبوون لەگەڵ یەکێتی، کێ لە مەکتەبی سیاسی یەکێتی دژی شەڕەکە بوو؟**

ـ لەهەردوو لا خەڵك هەبوو دژی شـــەڕبوو، بەڵام سیاســـەتە رەسمییەکە ئەوەبوو کە شـــەڕ بوو لەنێوان ئێمەو ئەوان. بەراستیش ئەوان شـــەڕیان بە ئێمە دەفرۆشت، پێیانوابوو ئێمە ئینشـــقاقمان کردووەو زەرەرمان لێداون، نێ خۆ ئێمە یەکێتی نەبووین تا ئینشقاقمان کردبێ، ئێمە رێکخراوێکی سەربەخۆ بووین، پێمانوابوو ئەو نیمچە بەرەیە بە ئاراستەیەکی دیکەدا رۆیشت ئێمەش لێی جیابووینەوە، ئەوە هیچ تاوانی ئێمەی تێدانەبوو، بەڵام ئەوان وایان وەرنەگرت، بەتایبەتی مام جەلال پێیوابوو ئێمە زەرەرمان لە یەکێتیداوەو دەبێ شـــەڕ لە دژمان بکا، بەراستی شەڕەکان لەوێوە دروست بوون.

*** لەسەرکردایەتی ئێوەش خەڵکی واتان نەبوو، ئەوان ئیستفزاز بکات؟**

ـ بێگومان لەهەردوولا هەبوو، بەڵام بە گشتی سەرکردایەتی و کادیرەکانی بزووتنەوەو دوای ئەوە سۆسیالیســـتیش هیچ بڕوایان بە شەڕی براکوژی نەبوو، هەربۆیەش زۆرجار لە شەڕەکان ئێمە زەرەرمان دەکرد.

*** راستە لەنێوان دکتۆر مەحمود و رەسول مامەند هەمیشە گرفت هەبوو و وەکو دوو پارتی جیاوازکاریان دەکرد!**

ـــ نا. لەبەرئەوەی خۆی د. مەحمود لەرێکخراوێکـــی دیکە بوو، کە ئەو کاك قادر جەباری و کاك عەدنان موفتی و کاك شەمســـەدین موفتی و ئەو چەند کەسە لەدوای شۆڕشـــی ئەیلول لە دیمەشـــق رێکخراوێکیان دروســـتکردبوو بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان کۆمیتەی ئامادەکاری. ئێمە لەساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ ئەو کۆمیتەی ئامادەکردنە یەکمانگرت و حزبی سۆسیالیســـتی یەکگرتووی کوردســـتانمان دروستکرد، یەکگرتنەکە زۆر سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بۆچوونی جیاواز هەبوو، بەڵام (٩٨٪) ی حزبەکە بزووتنەوە بوو، بێگومان کاك رەسول بۆ سکرتێری هەڵدەبژێردرێ.

*** واتە ململانێیەکە لەنێوانیاندا هەبوو؟**

ـ من ناڵێم ململانێ، بۆچوونی سیاســـی جیاوازیـــان هەبوو. بۆ نموونە د. مەحمود لەهەموو کەس توندترو پەرۆشـــتر بوو بۆ ئەوەی ئێمە لەیەکێتـــی جیاببینەوە، بەڵام کە جیابوونەوەو هەڵوێســـتە کە وەرگیرا، ئەوکات رایەکی پێچەوانەی هەبوو، بەراستی ئەوە لەناو بزووتنەوەدا زۆر بەخراپ لەسەری شکایەوە، کە دیارە تەنها مەبەستت جیابوونەوەکە بوو، بەڵام ئەو لەژێر کاریگەری بەعســـییەکانی ســـوریا بوو، کە ئەوکات پەیوەندییەکی

توندوتۆڵ لەنێوان یەکێتی و بەعسیەکانی عێراقی لەسوریا هەبوو قیادەی قوتریان پێدەگوتن، لەژێر کاریگەری ئەوان هەڵوێستی گۆڕابوو، ئەمەش لەلایەن سەرکردایەتی و کادیرەکانی بزووتنەوە زۆر کاردانەوەی لەبەرامبەردا دروســـتبوو، واتە شتەکە لای د. مەحمود خۆی بوو، لای خەڵکانی دیکە نەبوو.

*** تۆ زیاتر دۆستی کامیان بووی؟**

ـ بێگومان من وەکو رێکخراو زیاتر لایەنگری کاک رەسوڵم دەکرد، د. مەحمود کەسێک بوو رێزم لێدەگرت، بەڵام ئەوکاتە عەقڵییەتی کارکردن، یان دەمارگیری وەکو ئێستا نەبوو، بێگومان من زیاتر لایەنگری رێکخراوەکەی خۆم بووم.

*** لەساڵانی هەشتاکان حزبی سۆسیالیست بنکەیەکی زۆر فراوانی هەبوو، لە هەندێك ناوچە، تەحەدای پارتی و یەکێتی دەکرد. خەڵکێکی یەکجار زۆری هەبوو، بەڵام هەستت دەکرد مونەزەم نییە، سەرباری ئەوەش هەر ئامر هەرێمێك یان هەر فەرماندەیەك بەمیزاجی خۆی هەڵســـوکەوتی دەکرد، ئێوە لەسەرکردایەتی بۆچی نەتانتوانی تەنزیمی ئەو حاڵەتە بکەن؟**

ـ خۆی لەناو بزوتنەوە کێشــەیەك هەبوو، ئەویش ئەوەبـــوو مەرکەزییەت لاوازبوو، لە شۆڕشـــی چەکداریش دەبێ دیســـپلینی زۆری تێدابێ، ئەوە لەناو ئێمە نەبوو، بەتایبەتی لەلایەك کاك رەســـول و مەکتەبی سیاسیەکە، ئەوە خاڵێکیان بوو، خاڵی ئەساسی ئەوەبوو ئێمـــە ئامادەنەبووین ئەوەی یەکێتی و پارتـــی دەیکا، ئێمە بیکەین، ئەوان لەگەڵ ئێران و سوریاو ئەملاو ئەولا هەڵسوکەتیان دەکرد، ئەوە بە نیسبەت ئێمە محرمات بوو.

*** بەڵام سۆسیالیست لەگەڵ ئێران هاوکاری دەکرد.**

ـ نا نا. بەس کاکە حەمە (مەبەستی محەمەدی حاجی مەحموودە) هاوکاری لەگەڵ ئێران دەکرد.

*** ئەی خاڵە حاجی؟**

ـــ خاڵە حاجـــی نوێنەربوو لە ئێران، بەڵام هیچ کەســـێك رازی نەبوو بە نوێنەرایەتی ئەو.

*** بەڵام ئەو دووانە هەردووکیان ئەندامی سەرکردایەتی بوون کە لەگەڵ ئێران بوون؟**

ـــ نـــا، لەگەڵ ئێران نەبوون، حەزدەکـــەم بزانی ئێمە زیاتر بیروبـــاوەڕو پاکی زەرەری لەئێمەدا، چونکە ئەوانی دی سیاســـەتیان دەکرد. من ئێســـتا پێت دەڵێم ئەوەی پارتی و یەکێتی کردیان، بزووتنەوەی سۆسیالیست بیکردبا، ئێستا لە کوردستان دەسەڵاتی دەبوو.

*** ئێران یارمەتی نەدەدان؟**

ـ نا، ئەرزاقی دەداینێ، بەڵام ئێران لە ئەساسەوە دژی ناوەکە بوو، دەیگوت دەبێ بچن لەگەڵ پاسدار شەڕ بکەن، ئێمەش دژی ئەوەبووین، یەکێتی و پارتی چیان نەکرد لەگەڵ پاسدار؟ تاکە شتێك کاکە حەمەی حاجی مەحمود بەبێ رازیبوونی سەرکردایەتی کردی ئەوەبوو کە چوو لەگەڵ لایەنەکانی دیکە بەشداری شەڕی هەڵەبجەی کرد کە سەرەنجام بەو کارەساتە گەیشت کە بوو.

*** بۆ ئیجرائاتتان وەرنەگرت؟**

ـ نەدەتوانرا. لەبەر ئەوەی ئەو کاتە شەڕی ناوخۆ هەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ یەکێتی، بــۆ نموونە کاکە حەمە بۆ لەنــاو بزوتنەوە جێگای بووەوە، بەهۆی ئەو بەلایانەی کە تۆ دەتویست لەگەڵ یەکێتی دروســتی بکەیت، چونکە ئەو لەناو یەکێتی سازیدابوو، بەڵام تۆ بۆ ئەوەی خۆت بەهێز بکەی، پێشــوازیت لێ دەکردو مەوقیعت دەدایێ، تا شــەڕی یەکێتی بکا..

*** بەڵام ئەوە سیاسەتێکی چەوتە..**

ـ چەوتبوو، بەڵام هەموو لایەنەکان پەیڕەویان دەکرد، ئێستاش پەیڕەوی دەکەن. ئێستاش لێرە ناوێرن یەکێك سزابدەن، لەبەر ئەوەی دەبێتە پارتی و لای پارتیش بەهەمان شێوە.

*** بــەڵام ئەو کات ســـەرکردایەتی حزبی شــیوعی دەیگوت جۆرێك لــە ئیتیفاق لە نێوانماندا هەبووە هەتا شــتێکی وام بیســتوو کە کاسێتی تۆمارکراویش هەیە کە وتووتە ئەگەر بە ساغڵمی دەربچین رەنگە لە ئایندە بێینە ناو ئێوە؟!**

-نا هیچ شــتی وەها نەبووە، ئێمە وەکو حیزبێکی شۆڕشــگێڕ لەرووی فیکرییەوە زۆر لە حیزبی شــیوعی نزیك بووین، هیچ کاتێك سۆسیالیست لەگەڵ شیوعی نزیك نەبوو، بەڵام شیوعی لەبەر ئەوەی ئیشی بە سۆسیالیست بوو، رەحمەتی خالد حاجی، بەرگەی ئێرانی بۆ دەکردن، هەندێ ئیش و کاریان لە رێی ئێرانەوە بۆ دەڕۆیی، بۆیە مەجبور بوون موراعاتی حیزبی سۆسیالیست بکەن، ئەگینا سۆسیالیست لەهەموو رووێکەوە لە حزبی شــیوعی دووربوو، ئەوەی کە وەکو رێکخراوێکی چەپ و مارکســی لە شیوعی نزیك بوو ئێمە بووین، بەڵام ئێمە رۆژێ لە رۆژان نە شــتێکی ژێر بەژێر لە نێوانماندا هەبووە، نەنیازی ئەوەمان هەبووە کە بببنە حیزبی شــیوعی، لەوانەیە ئێســتاش و کاتی خۆشی ئەگەر رێکخراوێکی حیزبی شــیوعی کوردستان ســەربەخۆ هەبووایە، ئەوان ئامادەبان ئەوەیــان کردبا، بۆ نموونە لە ١٩٨٨ مشــتومڕێکی زۆر هەبوو کــە ئێمە رامان وابوو

چەپەکان بە ئێمەش و ئاڵای شـــۆڕش و ڕێکخراوە کوردســـتانییەکەی حیزب شیوعیش ئامادە بووین حیزبێکی شـــیوعی کوردستان دروست بکەین. بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئێمە ئەوســـا و ئێستاش لەگەڵ ئەوەنەبووینە بەشێك بین لە حیزبێکی سەرتاسەری وەك حیزبی شـــیوعی عێراق، ئێمە دژی ئەو عێراقچێتیە بووین، پێمانوابوو کوردســـتان لەبەر ئەوەی نیشـــتمانە، حیزب لەســـەر بناغەی نیشتمان دروســـت دەکرێ، عێراق دەوڵەتی ئێمەیە، نیشـــتمانی ئێمە نییە، ئەزمونی ناوەندو لاباڵی ئەو ئەزموونە لە یەکێتی ســـۆڤیەت و وڵاتانی سۆسیالیســـتی فەشەلی هێنا، حیزبی شـــیوعی فەلەستین و حیزبی شیوعی ئوردن و ئەوانە فەشـــەلیان هێنا، ئەوکات و ئێستاش پێموایە پەیوەندییەکی خەباتگێڕانەو هەتا جۆرێك لەپەیوەندی ئومەمیانە لەنێوان حیزبی شـــیوعی کوردستان و حزبی شیوعی عێراقدا هەبێ، بەڵام ناکرێ حیزبی شـــیوعی کوردســـتان بەشێك بێ لە حزبی شیوعی عێراق، چونکە دوو وڵاتی جیاوازن، لەدوو قۆناغی جیاوازیشن، ئەوەی بۆ عێراق دەشێ، بۆ کوردستان ناشێ، لەبەر ئەوەی ئێمە ئێستاش وابیر دەکەینەوە، زۆر جاریش وایان بەئێمە گوت، جارێکیان کاك عزیز محەمەد هاتە لای من باســـیکرد، ئەوکاتەی کە کۆنگرەی دروستکردنی حیزبی شیوعی کوردستانیان دەکرد، شتێکی وای خستەڕوو، گوتمان ئێمە پێمانباشە بەهەردووکمان حیزبێکی شیوعی کوردستان دروستبکەین، بەڵام جیا لە حیزبی شیوعی عێراق. ئەوان بەوە رازینەبوون.

*** پێتوایە حیزبی شـــیوعی کوردســـتان ئێستاش بەشێك بێ لە حزبی شیوعی عێراق!**

-بەڵێ.

-تۆ زۆر بە گەشبینیەوە باسی جودابوونەوەی خۆت لەناو سۆسیالیست دەکەی و دەڵێی ئێمە کۆمەڵێ گەنج بووین و شۆڕشـــگێڕ بووین، بەڵام تێبینـــی دەکرێ، ئەو گەنجانە کۆمەڵە گەنجێکی دەشتی هەولێر بوون، نەك گەنجێکی یەکجار زۆر، ئێوە کە خەبات بۆ کوردستان دەکەن، بەو کۆمەڵە گەنجەی ناوچەیەك چۆن وەها گەشبین بوون!

-ئەساســـی ڕێکخراوەکانی ئێمە کادیرەکانی هەولێر بوون، بەڵام لەبادینانیش خەڵکمان هەبـــوو، لەســـلێمانی و کەرکوکیش هەمانبوو، لە ئەورووپاش هەمانبوو، بەڵام ئەساســـی خەڵکی ئێمە بەشی زۆری کادیرەکانی هەولێرو خەڵکی دەوروبەری هەولێرن. زۆر حزبیش وانە، ئێستا یەکێتی و پارتیش وانە.

*** بەڵام ئەوان لەناوچەکانی دیش خەڵکی زۆریان هەیە.**

-نێ قەیناکە، هەرکەس بە قەوارەی خۆی.

*** ئێســـتا بۆ نموونە حزبی شیوعی لەهەموو شوێنێك هەیە، پارتی لەهەموو شوێنێك هەیە.**
-ئەوجا سروشتی رێکخراوەکەی ئێمە ئاوابوو. سروشتییە.
*** تۆ وەك چەپێکی کوردســـتانی لەدوای راپەرین کە گروپی زۆر لەحزبی شـــیوعی جیابوونەوە، وەکو شیوعیە کوردستانیەکان و ئەوانی دی. بۆچی، نەتتوانی ئەوانە لەژێر چەتری خۆت کۆبکەیتەوەو وەك دەڵێن هێزی ســـێیەمتان دروستکردبا، ئەگەر سێیەمیش نەبا، چوارەم با. بۆچی؟**
-دوای راپەریـــن و بەتایبەتی دوای ئەوەی کە دەســـتەڵات کەوتە دەســـت یەکێتی و پارتی، ئەو شکســـتەی کە چەپ لەســـەر ئاستی دنیا، چ وەکو فکر، چ وەکو نیزامی ئیشـــتراکی دووچاری ببوو، واتە ئەو پاشەکشـــەی چەپ لەسەر ئاستی دنیاو نێوخۆدا کردبووی، ئەوکارەی تۆ باسیدەکەی ئاسان نەبوو، ئەمە یەکیان، دوو، ئێمە ئەزموونێکمان کرد لەگەڵ هەردوو باڵەکەی ئاڵای شـــۆڕش ســـەرکەوتوو نەبووین، واتە زۆربەی ئەو خەڵکەش کە خۆی بە چەپ و مارکســـی دەزانـــی، دەچووە لای دوو حیزبەکەی دی، نەدەهاتە لای من.
*** واتە مەسەلەکە فکر نەبوو.**
-وایە. ئەو شکســـتەی فکری چەپ و نیزامی ئیشـــتراکی دووچاری ببوو لەدونیا ئـــەو هەیمەنەو کاریگەرییەی جارانی نەما، بێگومان خەڵکێك هەر زوو لە کونی خۆی هەڵگەڕایـــەوە، پاکانـــەی بەوە دەکرد کـــە ئەو ماوەیەش کە چەپ و مارکســـی بوود. بێگومان زۆر کەس خۆی بە چەپ و مارکسی دەزانی لەبەر ئەوەی کاریگەری چەپ و مارکسی لەدنیادا وابوو، نە لەبەر ئەوەی خۆی قەناعەتی پێبوو.
*** هەستناکەی بێ خاوەنیش هۆیەکی دیکە بوو کە خەڵك بڕوای پێ نەبێ، ئەگینا لە ٩١-٩٢ خەڵکێك هەبوو هێشتا بڕوای بە مارکسیەت مابوو شۆڕشگێڕو گەرموگوڕیش بوون بەڵام ساحێبیشی نەبوو.**
- نا، بۆ نموونە زۆربەی کادیرەکانی حیزبی شیوعی کە رۆیشتن بوونە پارتی
*** بەڵام یەکەمجار نەبوونە پارتی.**
- ئەی بوون بەچی؟
*** بەناوی شیوعیە کوردستانییەکان مانەوە دواتر بوونە پارتی.**
- ئەوە بەشـــێکیان بوون، بەشێکیان بوونە یەکێتی، ئاڵای شۆڕشیش لەگەڵ ئێمە بوون

گەڕانـــەوە بۆ ناو یەکێتی. واتا ئەو بارودۆخەی من باســـی دەکەم، چەپ لەو پێگەیە بەهێزەنەبوو، ئەو کاریگەرییە بەهێزەی نەمابوو لەســـەر ئاستی دنیاو ناوەخۆ کە بتوانێ شتێك بکا لە کوردستان.

*** ئێوە لەگەڵ شـــیوعیە کوردســـتانییەکان یەکتان نەگرت، لەگەڵ ئاڵای شۆڕش یەکتانگرت، بەڵام ئاڵای شۆڕش بانگەشەی عێراقچێتی دەکرد.**

- نا عێراقچێتی نەبوو، ئەوەی ئێمە لەگەڵیان رێککەوتبووین عێراقچییەتی تێدانەبوو. ئێمە لە یەکەم کۆنگرەی یەکگرتن کە بەسترا کە هەردوو باڵەکەی ئاڵای شۆڕش لەگەڵ زەحمەتکێشـــان یەکیانگرت، دروشمی سەرەکی ئێمە سەربەخۆیی کوردستان بوو، کە ئەو دروشمەش دژ بە عێراقچیەتییە.

*** باپشوویەك بدەین لە سیاسەت و بێینە سەر مەسائیلی کۆمەڵایەتی تۆ بەو پێیەی ئینســـانێکی چەپی و باوەڕت بە سۆسیالیســـتی هەبوو، لەو مەجالەشەوە دەبێ ئازادی ئافرەت و یەکسانی جێگایەکی دیاری هەبێت، بەڵام کە ژنت هێنا، جیاوازییەکی زۆر لە تەمەنی هەردووکتاندا هەبیوو، دەشڵێن جۆرێك لە ژن بە ژنی تێدا بوو.**

- نا ژن بە ژنی نەبوو، من ژنم هێناو ئەو ئافرەتەی کە ئێســـتا هاوســـەری منە کە خزمی خۆمە، تاکە ئافرەت بوو ئامادەبوو بێت بۆ شاخ بۆ لای من، بۆ ئاگاداریت ئەو کاتە هیچ ئافرەتێك ئامادە نەبوو بێت بۆ شـــاخ. هەموو هاوسەرێکیش جیاوازی تەمەن لەنێوانیاندا هەیە.

*** رەنگە هی تۆ زۆرتر بێ؟**

- نا من نزیکەی ١٥ ساڵ لە خێزانەکەم گەورەترم

*** ئێ زۆرە.**

- نازانم. زۆر، کەم، ئەوە واقیعەکە بوو.

*** کە کێشـــەو شەڕ لەنێوان پارتی و یەکێتی دروســـتبوو، ئێوە چەند حزبێکی دیکە، نەتانتوانی بێ لایەنی خۆتان بپارێزن، دەگوترێ هەر لەساڵی ١٩٩٤ەوە کە شەڕەکەی تێدا دروستبوو، تۆ ئەگەر بەنهێنیش بێ، لە دژی پارتی کارت دەکرد، واتا زیاتر لایەنگیری یەکێتیت دەکرد، بۆ وەك هەندێك حیزبی دیکە نەتتوانی هاوسەنگییەك رابگری؟**

- حەز دەکەم بزانی ئێمە هیچ کاتێك تەرەف نەبووینە لە شـــەڕەکان، شەڕی ناوخۆمان بەشـــەڕێکی زیانبەخش و خۆکوژی زانیوە، شـــەڕێکە لەهەموو رووێکەوە زەرەرو زیانی زۆری بۆ ئایندەی کوردســـتان و ئەزموونەکەی هەبـــووە، لەبەر ئەوەی هیچ مەنتیقی

تێدانییە تۆ شتێك بەخراپ دابنێی و بەشداریشی تێدا بکەی. ئەو شەڕە شەڕبوو لەسەر دەســـتەڵات، کە ئێمە بەهیچ شـــێوەیەك تەرەف نەبووین، بەڵام کێشەکە ئەوەبوو تۆ هەر هەڵوێســـتێکت دەنواند، ئەگەر بە دڵی لایەنێك نەبووایە، وای دادەنا ئەوە لایەنگیرییە بۆ لایەکەی دیکەیە، ئێستاش هەروایە، تۆ ئێستا هەڵوێستێك بنوێنە، لایەکەی دیکە پێیوایە ئەوە بۆ لایەکـــەی دیکەیە، لەکاتێکدا ئەوە زۆر کاڵ بووەتەوە. ئێمە تا (١٣)ی ئاب لە شەڕەکە نەبووین، بە پێچەوانەوە زەحمەتکێشان لەگەڵ سەرجەم هەوڵەکانی ناوبژیکردن و چالاکییەکانی حزبەکان بوو بۆ راگرتنی شەڕەکە، دەورێکی موتەمەیزی هەبوو. وابزانم توانیمان شـــتی باش بکەین، هەندێکجار شەڕەکە رابگرین، دیلەکان بگۆڕینەوە، هێزەکان لەبەر یەك بیبەینە دەر، بۆ نموونـــە ئەو کاتەی هەولێر لەلایەن یەکێتییەوە کۆنترۆڵکرا، هەموو پارتی بە سەرکردایەتییەوە، ئێمەو شیوعی دەربازمان کردن.

*** رەنگە ئەوە پەیوەندی شەخسی و برادەرایەتی بێت.**

- نا هیچ ئەو پەیوەندییانە نەبوو. تۆ بۆ خواری دەکەیەوە!؟

*** بۆ نموونە بارزانی مەلا خالید خەڵکی ناوچەکەبوو.**

- بۆ هەموو لقی دوو تەنها بارزانی مەلا خالید بوو!؟

*** بەڵام زۆربەیان برادەرت بوون.**

- نا، تۆ کۆنە شیوعی، دەبێ خواری نەکەیەوە. بەڵام کە ٣١ی ئاب هات رژێم بوو بە تەرەفێك لەشـــەڕەکە بۆ ئێمە وەکو زەحمەتکێشان چ وەکو فکر چ وەکو بەرنامەو مەسەلە نەتەوەییەکە، لەتواناماندانەبوو بەبێلایەنی بمێنینەوە. خەڵکی دیکە هەڵوێستێکی دیکەی هەبوو خۆی ئازادبوو، ئەوکاتیش خەڵکێك پێی وابوو ئێمە لەبەر یەکێتی ئەو هەڵوێستەمان وەرگرتووە، من لە دەنگی گەلی کوردستان رادیۆی یەکێتی، گوتم ئەوەی لە ٣١ی ئاب کرا، ئەگەر یەکێتی و پارتیش بە یەکەوە کردبایان هەمان هەڵوێستمان دەبوو.

*** ئەوکاتی چیت دەکرد؟**

- نازانم چیمان دەکرد، لەوانەیە بۆخۆمان دەچووین بۆ قەندیل، بەڵام حەز دەکەم بزانی دژی دەوەستاین.

*** ئەگەر بەردەوام بای و لەگەڵ وەزعەکە بمابایەوە، وەکو حیزبی شیوعی و ئەوانی تر، باشترنەبوو لەوەی هەڵوێستێکی ناحەزانە وەربگری دەرفەتی گفتوگۆو حیوار نەمێنێ!**

- هەڵوێســـتەکە هیچ شەخســـی و ناحەزانە نەبوو، سیاسی بوو، دووحیزب بە یەکەوە لەسەر دەستەڵات و پاوانخوازی شەڕ دەکەن، کە رژێم بوو بە تەرەفی شەڕەکە، تۆ ناتوانی

بێ هەڵوێست بمێنیەوە، واتا هەر یەك لەو حیزبانە هەرچی کرد، تۆ ناتوانی بێدەنگ بی و پشتیوانی لێبکەی. خودی کاك مەسعود وای بە ئێمە گوت کە ئاشتبوونەوە، گوتی ئێمە شـــتێکمان کرد، مەبەســـتی ٣١ی ئاب بوو، دەشمانزانی ئێوە هەمووتان پێی رازی نابن، شتێکی ئاسایش بوو کە پێی رازی نەبووین، بەڵام ئاسایی نییە ئێمە هەتا هەتایە ناکۆك بین، وابزانم ئەو قسەیە مەفهومە.

*** بەم دواییە هەندێك کەســـی تێکۆشـــەرو پەرۆش بۆ حزبی زەحمەتکێشـــان لەئێوە جیابوونەوە، دەکرێ بزانین جەوهەری جیابوونەوەکەیان چی بوو؟**

- ئەوان لە کۆنگرە، جۆرێك لە دەستەبەندی و تەکەتولیان دروستکردبوو ئەوەیان بەلای خۆیانەوە بە قورس زانی بۆخۆیان، واتە ئامادەی خۆراستکردنەوە نەبوون، لەجیاتی ئەوە تووشی غەلەتێکی دیکەبوون.

*** نەتدەزانی ئەگەر زۆر پێیان لێبنێی، ئەنجامەکەی وادەبێ؟**

- پێمان لێنەنـــان، حەز دەکەم بزانی ئێمە موحاسەبەشـــمان نەکردن، بەڵام پێمانگوتن تەکەتولتان کرد.

*** بەڵام ئەوان دەیانگوت سکرتێری حزبی زەحمەتکێشان تاکڕەوانە بڕیار دەداو بۆ رای سەرکردایەتی ناگەڕێتەوە؟**

- ئێ ئـــەوەی جیا دەبێتەوە، دەبێ بیانوویەك بدۆزێتـــەوە، لەوانەیە تاکڕەویش هەبێ، حەز دەکەم بزانی ئەوەی مەســـئولی یەکەم بێ ئەگەر خۆشم بم، زۆرجار دیموکراتییانە هەڵسوکەوت ناکات. بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی کە تۆ هەڵوێستێکی وا وەربگری.

*** لە نەوەدەکان، لەســـەردەمی شـــەڕی ناوخۆو پێشتریش کە سەردانی مام جەلال یان کۆســـرەت دەکرد، زۆر جار بە تەنها دەچووی، واتا ئەندامانی ســـەرکردایەتیت لەگەڵ نەبوو، بۆچی؟**

- ئەو کۆبوونەوانە هەریەکەو ئوســـولی خۆی هەیە. ئەگـــەر کۆبوونەوەی حیزبەکان بێ، ئەگەر کۆبوونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاســـی بێت، ئـــەوە بێگومان تۆ بە تەنها ناچیت، بەڵام ئەگەر کۆبوونەوەیەك لەگەڵ شەخســـی مام جەلال یا کاك مەسعود بێت، بێگومـــان دەکرێ منیش بەتەنها بچم، ئەوە هیچ کاتێك کێشـــەی ئێمە نەبووە لە حزبی زەحمەتکێشان.

*** لەکاتی هێنانەوەی تەرمی بارزانیە ئەنفالکراوەکان وتارێکت خوێندەوە کە گۆڕانێکی زۆر بەسەر تێڕوانینەکانتدا هاتبوو لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا، کە زۆر بە بەرزییەوە باسی بارزانی ئەمرو کاک ئدریسی هەمیشە زیندووت کرد.**

- نـــا هیچ گۆڕانکاری نەبوو، پێشـــتریش وابووم، ئێســـتاش بـــڕوام وایە، بارزانی ســـەرکردەیەکی مەزن بوو، بە ئیجابیات و ســـلبیاتەوە، من زۆر جـــار گوتووم ئەگەر پارتـــی بارزانی بکاتە موڵکی خـــۆی بچووکی دەکاتەوە. بارزانـــی هی هەموومانە، بەتایبەتی شەهید بووە لەژیاندا نەماوە کاک ئیدریس لەژیاندا نەماوە، واتە مەعقول نییە لەرێورەســـمێك کە ئەو هەموو خەڵکە لەو عەشیرەتە ئەنفالکراوە، ئەو هەموو خانەوادەیە لەوێ وەســـتاون، تۆ ســـڵاو بنێری بۆ گیانی پاکی شەهیدان، سڵاو نەنێری بۆ گیانی بارزانی و کاک ئیدریس. شـــتی وەها هەیـــە!؟ هیچ گۆڕان لەمن نەبووە، بەپێچەوانەوە، ئەوکاتەی کە لەگەڵ پارتی ناکۆکیش بووینە، لە حزبی سۆسیالیســـتیش و ئێســـتاش بڕواناکەم هەڵوێســـتێکی سلبیمان لەبەرامبەر بارزانی هەبووبێت. هەڵسەنگاندنی خۆمان بەرامبەر بارزانی وەکو سەرکردەیەکی مێژوویی کورد بووە.

*** وەختێك باســـکرا کە ئێوە لەگەڵ حزبی سۆسیالیست یەکدەگرن محەمەدی حاجی مەحمود لە دیمانەیەك لەگەڵ هەرێم دەڵێ من ئامادەبووم واز لە سکرتێری بێنم و کاك قادر ببێتە سکرتێر بۆ ماوەی ٣ ساڵ، بەڵام کاك قادر پێیداگرت بۆ ٦ ساڵ!**

ـ ئەوە راست نییە، ئێمە لەسەر سکرتێری تێکمان نەداوە، جارێ ئەگەر ئێمەو حیزبی سۆسیالیست یەکبگرین، هەر من دەبمە سکرتێر، لەبەر ئەوەی ئەوکاتەی من لە مەکتەبی سیاســـیی یەکێتی و سۆسیالیســـت بووم، کاکە حەمە ئامر هەرێم بووە، یان ئیحتیاتی سەرکردایەتی بووە، زۆر بەراورد هەیە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوێکی تێکۆشەرە.

*** رەنگە ئەو جەماوەری زۆرتر هەبێ؟**

ـ بڕواناکەم..

*** بەپێی دەنگدانەکان..**

ـ نا، دەنگدانەکانی دواییت بینی، ئەگەر کەمیش بێ، بەڵام دەنگەکانی زەحمەتکێش و سۆسیالیست و شیوعیت بینی چۆن بوو. تۆ کۆنە شیوعیی خوارمەکەوە. دەنگەکانت بینی چۆن بوو. چونکە پێشـــتر پروپاگەندەی زۆر هەبوو، دوای ئەوەی کە زەحمەتکێش دوچاری وەزعێك بوو لەناوخۆی کە پێشتر باسمانکرد.

*** سۆسیالیستیش دوچاری ئەوەبوو لە کەرکوک هەرێمێک جیابۆوە؟**

ـ نەخێر، ئەوە دوای دەنگدانەکەبوو، ئێمە پێش هەڵبژاردن تووشــبووین، خەونی زۆر خــراپ بە زەحمەتکێشــانەوە دەبینرا، ئێمە ئەگەر موزایەقــە نەکرابایەن و بەتایبەتی لە ناوچەکانی پارتی، کە دواتر برایانی پارتی خۆیان دانیان بەوە نا کە فشــاریان خستۆتە ســەر ئێمە، کە لە ناوچەکانی ئەوان و لەزۆر شوێن دەنگمان سووتا، ئەگینا ئێمە بەبێ کێشە (٢ ـ ٣) کورسیمان هێنابوو.

*** واتە تەسەور دەکەن کە بەقەد حزبی شیوعی جەماوەرتان هەبێ؟**

ـــ نازانم بۆ ئەو بەراوردە بکرێ، من حەزدەکەم حزبی شــیوعی و خەڵکی دیکەش لەئێمە زیاتر جەماوەریان هەبێ، بەڵام وابزانم ئەو هەڵبژاردنە تێســتێك بوو بۆ ئەو چەند حزبە..

*** بۆچی لەگەڵ حیزبی سۆسیالیست نەگەیشتنەیەك؟**

ـ حەزدەکەم بزانی کە ئێمە هیچ کاتێك داوای یەکگرتنمان لەگەڵ حزبی سۆسیالیست نەکردووە، هەمیشە ئەوان داوایان کردووە، دیارە ئەوە شتێکی باشە، ئەگەر ئێمەش داوای بکەین، هیچ کاتێك ئێمە هۆکاری ســەرنەکەوتنی هەوڵەکان نەبووین، هەمیشــە ئەوان هەوڵەکانیان تێکداوە..

*** باشە بۆچی ئەوان داوای یەکگرتن دەکەن و هەوڵەکانیش تێکدەدەن؟**

ـــ ئەوان کاریان بەو یەکگرتنە هەبوو، ئەوان زۆربەی کاتەکان خەڵکی ناوخۆیان بەوە رادەگرت کە لەگەڵ زەحمەتکێشان یەکدەگرن، واتە زۆرجار بەداخەوە ئێمەیان وەك ریکلام بەکاردەهێنا. لە مەسەلەی ئەو یەکگرتنە زۆر راستگۆ نەبوون، بە تایبەتی دەوروبەرەکەی کاکە حەمە، هیچ پەیوەندیی بە مەسەلەی سکرتێرەوە نەبووە، هەمیشە ئەوان شتەکانیان چەواشەدەکرد، ئێمە پێمانوایە پەیوەندییەکی دۆستانەو برایانە لەنێوانماندا هەبێ، زۆرجار پرۆسەی یەکگرتن لە کوردستان ســەرکەوتوونەبووە، زۆرجار لەباتی شتی باش دروست بکــەی، تێکیدەدەی. لەبەر ئەوەی زۆر جیاوازی لەنێوان ئێمە و ئەوان هەیە. لەوانەیە لە یەکگرتنەکە سەرکەوتوو نەبین، دەکرێ دۆستی یەکدی بین.

*** واتا ئەگەر حزبێك هەبێ لەگەڵی یەکبگرن، ئامادەی واز لە سکرتێری بێنی؟**

ـ بەڵێ. ئەگەر حزبێکم بۆ ببینیەوە، بەڵام یەکگرتنێکی راســتەقینەو فیعلی بێت، دەتوانم ئەو قسەیەی ئێستا دەیکەم، پێم خورد کەیتەوە. ئێمە کاتی خۆی لەگەڵ پارتی گەل، یان لەگەڵ حزبی شــیوعیی کوردســتان ئەگەر یەکمان بگرتایە، من ســکرتێر

نەدەبووم. لە خواکورك لەگەڵ پارتی گەل زنجیرەیەك کۆبوونەوەکرا، ئەوە خۆشبەختانە هاورێ عەزیز لە ژیاندا ماوە، گوتی: باشە لەسەر (مشکلە المشاکل) چ دەکەن، گوتم (مشکلە المشاکل) چییە، گوتی لەسەر سکرتێری. گوتم وەڵلا کاك عەزیز ئێمە کێشەی سکرتێرمان نییە، چونکە ئێستاش سکرتێری لای ئێمە غائیبە. ئێستاش کاك عەزیز بەو قسەیە پێدەکەنێ، گوتی چۆن شاغرە؟ گوتم بەسەری تۆ ئێستاش ئێمە خۆمان بە سکرتێر نازانین، ئەگەر لەگەڵ پارتی گەل یەکبگرین، هیچ موناقەشەی تێدانییە کاك سامی سکرتێرە. هەروەها لەگەڵ حزبی شیوعیش یەکمانگرتبا، ئەوکات کاك کەریم سکرتێربوو، کەسمان مونافیسی نەبووین، رۆژێك لەرۆژانیش ئاواتەخوازم ئەو قسەیەی خۆم خورد بکەمەوە، بەڵام رێکناکەوێت. بۆ وا دەزانی سکرتێری لای ئێمە ئیمتیازاتە، لە حزبی زەحمەتکێشان سکرتێری هیچ جۆرە ئیمتیازاتێکی تێدا نییە، حەزدەکەم بزانی ئەو زەوابتانەی ناو حزبی زەحمەتکێشان هەیە، لەناو هیچ حزبی دیکە نییە، مومکینە لە حزبی شیوعیش هەیە. من خانەنشینی وەزیرییەکەم، کارگێری دارایی حزب وەریدەگرێ، (کەمێك پێکەنیم و کاك قادر وتی) باوەڕناکەی؟! ئێستا من لە حزبی زەحمەتکێشان مووچەم نییە، دوو داهاتم لەو حزبە هەیە: یەکیان (٧٦)ەکەیە. دووەم خانەنشینیم هەیە هی وەزیری. من لە حزبی زەحمەتکێشان نە مووچەم هەیە، نە نەسریەو نە هیچ شتێکم هەیە، بە پێچەوانەوە من (٦٥٠) هەزار دینار ئابوونەی مانگانە دەدەمە حزب، بۆ خۆت دەتوانی بپرسی، ئەو سکرتێرییە چ ئیمتیازێکی تێدایە بۆ من؟

*** بەڵام دەڵێن قادر عەزیز لەشاخ هیچی نەبوو، ئەی ئێستا ئەو وەزعە باشە لە چییەوە هات؟**

- بەراستی لە دوای رووخانی سەدامەوە، وەزعمان باش بوو، زۆر قسە لەملاولەولا دەکرێ، بێگومان ئەوانەی لەئێمە جیابوونەوە جۆرەها پروپاگەندەیان بۆ هەڵبەستین، بەڵام دەکرێ رۆژێك بە بەڵگە شتێك لەسەر ئێمە بگوترێ، باشە ئەگەر بگوترێ خۆ ئەو پروپاگەندانە لەبەرژەوەندیی منە، وەك مەسەلە قانونییەکەی کە گومان لەبەرژەوەندیی تۆمەتبارە، من لەو سلێمانییە وەکو پێشمەرگەیەکی (٧٦)، شەش سەد مەتر زەویم وەرگرتووە، خانووم تێدا دروست کردووە، کە هێشتا تەواو نەبووە، من لە مەکتەبی سیاسیی زەحمەتکێشان گوتوومە برادەران من خانووەکە کە ئاوا دروست دەکەم، گوتیان چۆن، گوتم ٨٨ ملیۆنم لە فەرقی بوودجەی وەزیری وەرگرتووە لەدوای رووخانی سەدام، ئەوکاتەی مووچەی وەزیری بەرابەری بەغدا کرا، حکومەت ئێستا گوێی لێمە (٣٠)

ملیۆن د. بەرهەم بۆی سـەرف کردم، داوای سولفەم کرد، گوتی نابیٚ، مەعقولە ئێمە سلفە بدەینە تۆ، ٢٥ هەزار دۆلاری دامیٚ، گوتی وەکو حکومەت هاوکاریت دەکەین، من هەموو مانگێکیش ٥ ملیۆن دینار پاشەکەوتم هەیە، ئێستا ٣ جۆرە داهاتم هەیە یەکیان تەقاعــودی وەزیرییە کە ٥ ملیۆن و نیوە، ملیۆن و نیوێك ئیکرامیەی پێشـــمەرگەی (١٩٧٦)م هەیـــە، ٢ ملیۆن و ١٠٠ هەزارم لە ئەنجوومەنی نیشـــتمانی عێراقی هەیە، بۆ ٦ حیمایەی خۆم. من ئێســـتا داهاتی مانگانەم ٩ ملیۆن دینارە، هەموو مانگێك ٢ ملیـــۆن دینار خەرج دەکەم، چونکە خانووەکەم بەکریٚ نییە، من مانگانە ٧ ملیۆن دینار پاشـــەکەوتم هەیە، ئەوە چوار ساڵە وایە، ئەگەر لەتاکە خانووێکیش زیاتر پێت شك دیٚ، دەتوانی بینووســـی. بەلام لەوانەیە بڵێن ئەو هەموو مەسئولە ملیۆنێرن، ئەی چۆن قادر عەزیز ملیۆنێر نییە، با شتێکت بۆ باس بکەم، لە وەزارەت بووم، دیعایەکیان لە دوومن کرد گوتیـــان زەویی بەناوی خۆی کردووە. یاریگایەکیش لەهەولێر هەیە داویەتییە برایەکەی خۆی. گوتم وەڵلا من نەمزانیوە. زەوییەکە بڵێی چۆن بیٚ باشە؟ کۆمەڵێك کۆنە کادیری شۆڕشـــی ئەیلول هاتنە لای من، یەك لەوانە حەســـەن عەلی بوو، قادر عەزیزێك هەیە لە هەولێر پیاوێکی زۆر تێکۆشـــەرو ماندووە، خاڵی هاوڕێیەکی ئێمەیە بەناوی هەردی مام عەلی کوتك خۆت کۆنە شـــیوعی دەیناســـی، کۆمەڵێکی دیکە بوون هاتنە لای مـــن، گوتیان زەویمان بدەیە، گوتم وەڵلا ئێوە هەمووتـــان دەوڵەمەندن، من زەوی تەنها دەدەمـــە یەك کەس، ئەوەش قادر عەزیزە، ئیٚ چبکەم ناوی قادر عەزیزە، ئەو دیعایەیان بۆ هەڵبەســـتام، گوتم کاکە وەڵلاییی من لە گوندەکەی خۆم کە ســـێبیرانە، بەســـەری ئێوە، بەگۆڕی شـــەهیدان، زەوییە کۆنەکەی خۆمانم وەرنەگرتەوە، لەبەر ئەوەی وەزیری کشتوکاڵ بووم. ئێستەش وەرمنەگرتۆتەوە، دەتوانی بچی پرسیار بکەی، گرێبەستێکی دیکە هاتە پێشم یەکێك خەڵکی باداوا بوو ئێستاش لەبیرمە حەسەن باداوەیی بوو، لەگەڵ کوڕی سابیر شێخ جامی کەناوی کۆسرەتە، گرێبەستەکەم ئیمزا کرد، وابزانم یاریگایەکە لـــە هەولێر، گوتیان ئـــەوە یاریگایەکی داوەتە برایەکی خۆی، لەبـــەر ئەوەی برایەکەم ناوی کۆســـرەتە، خۆت دەزانی باوکی من ناوی سابیرە، ئەویش کۆسرەت سابیرە. ئەوجا برادەرانی ئێمە گرەویان کردبوو گوتبوویان شـــەرت بیٚ ئەگەر ئەو کۆســـرەتە برای ئەو بیٚ، ئێمە وەکو سکرتێری حزب موحاسەبەی دەکەین. زۆر بەتوڕەییش مەکتەبی سیاسی هاتنە لای من، گوتیان تۆ لە وەزارەتی خەڵك قســـەی خراپ دەکا، گوتم کاکە جاریٚ هێواش بن، بزانم مەســـەلە چییە. من هیچم بە خۆم شك نابیٚ، دواتر ئێمە لە وەزارەتین

هەزار چاومان لەسەرە، یەکێتی و پارتی لەخوایان دەوێ شتێکی وا لەسەر من بدۆزنەوە، مــن ئەو هەموو قســە گەورانە دەکەم و ئەو هەموو رەخنەیــان لێدەگرم. گوتم برادەران هیــچ تورە مەبن، ئەوە کاك بەهمەن و کاك بەڵێن ماون، پێمگوتن قادر عەزیزەکە کێیەو کۆسرەت سابیریش برای من نییە، کوڕی سابیر شێخ جامیە. جا ئەگەر بەو قسانەدابچی جیایە، بەڵام من هیچ داهاتێکی دیکەم نەبووە. من لەزۆر قۆناغی مێژوویدا پەیوەندیم لەگەڵ مام جەلال باشــبووە، ئێستاش پەیوەندیمان باشە، خەڵکێك پێیوابوو دەستەڕاستی مام جەلالم، ئەوە خۆشبەختانە مام جەلال لەژیانداماوە، هیوادارم تەمەنی ٢٠٠ ساڵ بێ، لە غەیری یارمەتی بۆ زەحمەتکێشان، بارۆژێك داوای ١٠ دینارم لەمام جەلال کردبێ، لەهەر کەسێکی دیکە لەو کوردستانە من ئەو شتانەم نەبووە.

*** تۆ کە لە (١٩٧٤)ەوە پێشــمەرگە بووی و ئێســتا لەناوەندی بڕیارەوە بەشداری و پەراوێزکراوی، بیرت لــە ئایندەی خۆتان نەکردۆتەوە بەتەمای هەر بەو حزبە بچووکەوە بچییــە هەڵبژاردن، هیچ بیرت نەکردۆتەوە لەگەڵ حزبێکی گەورە یەکگرن، چونکە ئەو کاتــە زیاتر دەتوانی خزمەت بکــەی، چونکە لە حزبی بچووك ئەو ئیمکانییەتەت نییە بتوانی خزمەت بکەی؟**

ـ لەپێشــدا دەبێ بزانی حزب لە بچووکییەوە گــەورە دەبێ، هەموومان بە ئومێدەوە خەبات دەکەین، هەمووشــمان بڕوامان بەخۆمانــە، گەورەیی و بچووکیش پەیوەندیی بە تەمــەن و مێژووی ئەو حزبانەیە و دوای ڕاپەڕینیش بەشــێکی زۆر پەیوەندی بە پارەو ئیمکانییاتەوە هەیە کە ئێمە نییمانە. ئێمە تا ئێستاش گەمارۆیەکی ئابووریمان لەسەرەو وەك کوردەواری دەڵێ بخۆو بڕۆیە، واتا بودجەی ئێمە، بودجەی گەشەکردن نییە، تەنها بودجەی نان خواردنە، بەڵام دیســان دەیان حیزب لەمێــژوودا هەبووە کە بچووك بووەو دواتر گەورە بووە، جگە لەوەش ئێمە قەناعەتێکی جیاوازمان هەیەو، لەرێکخراوێکین کە لەگــەڵ قەناعەتی خۆمان بگونجێ ڕاســتە ئەگەر لەگەڵ دوو حیزبەکەی دیکە ئیش بکەین، بێگومان لەرووی ئیمتیازاتەوە زیاترمان دەســتدەکەوێ. زۆربەی ئەو کەسانەش کە دەبنە پارتی یان یەکێتی و سەنگەر دەگوازنەوە هەر بۆ ئەوەیە.

*** هەر ئیمتیازاتەکە نییە، بەڵکو زیاتر خزمەتی خەڵکیش دەکەی..**

ـ ئەوەیان نازانم، بەڵام ئێمە حزبێکین، بەشــبەحاڵی خۆمان خەڵکی بۆ سەربەخۆیی بۆ کوردایەتی و بەپاکی پەروەردە دەکەین، ئەوەندەی توانامان هەبێ، کردوومانە. ئێســتا زەحمەتکێشــان هەزاران ئەندام و کادیرو لایەنگری هەیە، خۆ هەر هیچ نەبێ توانیومانە

ئەوانە پەروەردە بکەین بەو بیرو باوەڕو قەناعەتەی کە هەمانە. من پێموایە ئەوەش یەکێکە لە خزمەتی کوردایەتی. خزمەتی خەڵکیش هەر ئەوە نییە تۆ لەگەڵ دوو حیزبەکە بیت. دوو حزبەکەش بەشـــی خۆیان خەڵکیان هەیە، با لە کوردســـتان فرە حزبی هەبێ. ئەو کاتـــەی دەتوانی خزمەت بکـــەی کە جێ پەنجەت لە دروســـتکردن بڕیارەکانی هەبێ شتێکی باشە، بەڵام ئەو فرەحزبییەی ئێستانا. مەسەلەی بەشدارنەبوون لە بڕیاردان، ئەوە پەیوەندیی بەو دوو حزبەوەیە، ئەوان نایەڵن حزبەکانی دی لەبڕیاری سیاسی بەشداربن.

*** بەڵام ئەگەر هێزێکی کاریگەر بێ، بەشدارییان پێدەکرێ.**

ـ نا. هیچ پەیوەندیی بەهێزی کاریگەر نییە، ئەگەر دیموکراســـی لەو وڵاتە هەبێ، ئەگەر بچووکترین حزب بێ، تۆ لە قەراری سیاســـی بەشـــداری دەکەی، ئێســـتا خۆ یەکگرتووی ئیســـلامی حزبێکی کەم نییە، ٩ کورسیی لە پەرلەمانی کوردستان هەیە، کەچی لە هیچ شـــتێك بەشـــداریی پێناکرێ، لەبەر ئەوەی ئەو دوو حیزبە باوەڕیان بە فرە حزبییەتی راســتەقینە بەبەشداریکردنی حزبە سیاسییەکان لە بڕیاردانەدا نییە، بەتەنیا بڕیاری سیاســـی دەردەکەن. مەسەلەکە گەورەیی و بچووکی نییە، کاتێ دیموکراسی و یاســـا لەو وڵاتە هەبوو، تاکێکیش لەبڕیاری سیاسی بەشداریی پێدەکرێ، بەڵام ئەگەر ئەو دوو حزبە، بەو شـــێوەیە کاربکەن حزبی زەحمەتکێشـــان ٢٠ کورسیشی لەپەرلەمان هەبێ، هەر پەراوێز دەکرێ. زۆر جار پروپاگەندەمان لەدژ دەکرێ، کە یەکێکە لەشەڕی ســـایکۆلۆژی و ململانێ، بەڵام ئێمە ئەو کۆمەڵـــە خەڵکەین کە قەناعەتێکی تایبەت بەخۆمان هەیە، کە مێژووەکەمان خەڵکێکی پاك و خاوێن هەڵوێســـتین لە کوردســـتان، هیـــچ رۆژێ لە رۆژان بیرمان لەوە نەکردۆتەوە لەگەڵ ئەو دوو حیزبە یەکبگرین، ئێمە بەدۆســـتی خۆمانیان دەزانین، ســـەردەمی ململانێ و دژایەتیکردن بەسەرچوو، ئێستا ســـەردەمی هاوکاری و برایەتییەو پێمانوایە ئەو دوو حیزبە کێشـــەی ژمارەیان هەبێ، ئێمەش زیادین و خەڵکی دیکەش بچنە ناویان، ئەو کێشانەی ئەوان هەر کۆتایی نایەت، کێشەی ئەوان لەسەر شێوەی ئیدارەکردنی وڵاتە، کە ئێستا بە بنبەست گەیشتووە.

*** قەت گوشارت نەخراوەتەسەر لەلایەن ئەو دوو حزبەوە کە بچنە ناویان؟**

ـــ نەخێـــر. لەوانەیە حەزیانکردبێ، یان لابەلا قســـەکرابێ، بەڵام بە رەســـمی داوام لێنەکراوە.

*** بەنیازنیت مەکتەبی سیاسیت بێنیتەوە هەولێر؟**

ـ بەپێـــی قانونی حزبەکانیش هەولێر مەرکەزی ســـەرەکی حزبەکانە، ئێمە بەهۆی

وەزعێکی تایبەت مەکتەبی سیاســـیمان هاتە سلێمانی. زوو یان درەنگ بێگومان دەبێ مەکتەبی سیاسی بگەڕێتەوە هەولێر، بەڵام کێشەی ئێمە ئەوەیە ئەو بنکەو بارەگایانەی کە هەمانبووە لە هەولێر، تا ئێســـتا وەرمـــان نەگرتۆتەوە بەتایبەتی بارەگای مەکتەبی سیاسی کە لەسەر خۆشیان تاپۆکردووە.

*** مەسرەفێکی زۆریان لێکرد؟**

ـ مەسرەفەکە لە خەزێنەی میللەتی کوردە، خۆ پارەی خۆیان نییە، لە کاتێکدا ئێمە عـــەقـــدی (٢٥) ساڵـــمـــانهـــبـــووە هیئەوبینایەیـــە،کەئەوانبەبێ گوێدانەئەو عەقدە، تاپۆی کردووە، کە ئەمە شـــتێکی نا یاســـاییە، ئێمـــە زوو یا درەنگ داوای ئەو بارەگایە دەکەینـــەوە، دەتوانین بەپێی قانون لەپارتی وەریبگرینەوە، ئەگەر ئێســـتا لەکوردستان قانون نایخوا، ئەوە شتێکی ترە.

*** رات بەرامبەر پێکهاتەی پەرلەمانی کوردستان چییە؟**

ـ ئەو پەرلەمانەی ئێســـتا هەیە، پەرلەمانێکی حزبییە، خاوەن ئیرادەی خۆی نییە. بەپێی بڕیاری حزب ئیش دەکات، بۆیە پێموایە تا ئەوهابێ، ناتوانێ لە کوردستان هیچ بکات.

*** بە تێڕوانینی تۆ، پێکهاتەی حکومەتی یەکگرتوو چۆن دەبێ؟**

ـ بەهەمان شـــێوە دەبـــێ. حکومەتێکی زیاتر (فیفتی ـ فیفتییە) لە کوردســـتان، بەشـــدارییەکی شـــکلی حزبەکان پێدەکرێ، کە ئێمە هەموو حزبەکان ناڕازین لەسەر ئەو شێوازە.

*** بۆچی شکلییە، کە وەزیر هەبێ؟**

ـ وەزیر جیایە. تۆ بەشـــداری لە دەســـەڵات، یان بەشـــداری لە کابینە. پاشـــان تۆ وەزارەتێکـــت دەدرێتێ، دەتوانی بە ئازادی هەڵســـوکەوت لـــەو وەزارەتە بکەیت؟!، یان وەزارەتێکـــت دەدرێتێ، وەزیر بەس کارمەندێکەو باقـــی خەڵکەکەی هی دوو حزبەکەن، تۆ ناتوانی لە پێســـتی خۆت بجوڵێیتەوەو هیچ کاریگەرییەکی نابێ. بۆیە ئێمە خۆمان وەزارەت بـــە ئیمتیاز نازانین، وەزارەت بە مەســـئولیەت دەزانیـــن، تەجروبەی (فیفتی ـ فیفتی) لەکوردســـتان خۆی فەشەلی هێنا، ئەوان لەجیاتی بێن دیراسەی ئەو تەجروبەیە بکەن و بەخۆیاندا بچنەوەو جارێکی دیکە پێکهاتەیەکی حکومەت دابمەزرێنن کە بتوانن کێشە سەرەکییەکانی خەڵکی کوردســـتان چارەسەر بکا، کەچی پێیانوایە ئەوە ئیمتیازە دەدەنـــە حزبەکان و زۆرجار ئیستفزازیشـــمان دەکەن لەو ئیمتیـــازە. ئێمە پێمانوایە ئەمە

شێوازێکی سەرکەوتوو نییە، بەڵام خۆیان مەسئولن لەو سیاسەتە. هەروەها ئێمە لەگەڵ ئەوەین بەشـــدارییەکی کاریگەرمان لەو حکومەتـــەدا هەبێ، رامان هەبێ و تەحەمولی سەرخســـتنی ئەرکی ئەو حکومەتە بکەین لە چارەسەرکردنی کێشەکان، چونکە یەکێتی و پارتی چ بە حکومەتی هاوبەش، چ بە حکومەتی جیا، ئەوە بۆ (١٥) ســـاڵ دەچێ نەیانتوانی کێشە سەرەکییەکانی خەڵکی کوردستان چارەسەر بکەن. ئێمە ئەگەر تێشیدا نەبیـــن، ئەو حکومەتە بە حکومەتـــی خۆمان دەزانین و هاوکاریـــی دەکەین، بەڵام با پێکهاتـــەی ئەو حکومەتە، نەك حزبەکان، خەڵکی دەرەوەی حزبەکانیشـــی تێدابێ. ئەو حزبایەتییە تەسکە زەرەری لەخۆشیان و میللەتەکەش داوە.

*** بەنیازن هیچ پۆستێك وەربگرن؟**

ـــ ئەوجارە پرس بە کەس نەکراوە، بەڵام کاتی خـــۆی گوتیان وەزیرێکی هەرێمیان بۆ ئێمە داناوە، ئێمەش بەوە رازی نەبووین، چونکە پێمانوابوو ئێمە شایســـتەی ئەوە نین وەزیری هەرێممان پێبدرێ، چونکە تا ئێســـتا ئێمە لە هەر ســـێ کابینە بەشداربووینە، وەزارەتی ئەساســـیمان وەرگرتووە، وەزارەتی کشـــتوکاڵ و ئاوەدانکردنەوەو رۆشنبیریمان وەرگرتووە، ئێســـتا لەجیاتی زیاتر بایەخ بە حزبەکان و رۆڵیان بدرێت، خێرە وەزارەتێکی هامشـــیمان دەدەنێ، لەگەڵ ئەوەش ئێمە رامان وابوو هەر بەشداری بکەین، بەو پێیەی ئەگەر رایەك، بۆچوونێك دەربڕین، هەر باشە. هەروەها حزبەکانیش رایان وایە و هیچیان بەو پۆستە رازی نین کە پێیان دراوە.

*** بەڵام هەڵوێستیشیان نییە؟**

ـــ نازانم. بەڵام لێی رازی نین. دەزانی دەبێ چۆن ســـەیری مەســـەلەکە بکرێ، تـــۆ حکومەت بۆکێ دروســـت دەکەی، بۆ ئەو میللەتە، بۆ ئـــەو حزبانەیە کە ئەوانیش نوێنەرایەتی بەشێك لەو میللەتە دەکەن. تۆ دەبێ هەوڵ بدەی ئەو خەڵکە یەکەم متمانەی بـــەو حکومەتـــە هەبێ کە ئەوە زۆر گرنگە، دووەم کە متمانەی هەبوو پشـــتگیری لە حکومەتەکە بکات. پشتگیری لە بڕیارەکانی حکومەتەکە بکات. ئەگەر ئەوە نەبوو خۆت زەرەر دەکەی، جا ئەگەر حزبێك بەنابەدڵی بەشـــداری کردو پێیوابێ بەشداریکردنەکەی زۆر هامشـــیەو ئەگـــەر متمانەی بە حکومەتەکە نەبوو و پشـــتگیری نەکرد، ئەوکاتە ئەوانیش ناتوانن لەکارەکەیان سەرکەوتوو بن.

دەبێ یەکێتی و پارتی شـــتێك بکەن، بەراســـتی خەڵکی کوردســـتان ئەو حکومەتە بـــە حکومەتی خۆیان بزانن. ئەوە کاتێك دەبێ کە خەڵکێك بەشـــدارییەکی کارایی لەو

حکومەتـــەدا هەبێ، چ نوێنـــەری ئەحزاب، چ خەڵکی بێلایـــەن. بۆ خەڵکی بێلایەن کەمە؟ خەڵکی بێلایەن لە قەواعیدی پارتی و یەکێتی و حزبەکانی دیکەش زۆرترە، بۆ بەشداریی پێنەکرێ. لەبەر ئەوە ئێمە ئەزموونێکی دوورو درێژمان هەیە، لەو ئەزموونەش سەرکەوتوونەبووین وەکو پێویست. کاتی ئەوە هاتووە چاوێك بەخۆماندا بخشێنینەوە، دیارە ئەو چاوخشـــاندنەوەیەش دەبێ یەکێتی و پارتی بیکەن. شـــێوازی حوکمڕانیی ئەوان بە تەواوی بە بنبەســـت گەیشتووە. ئەگەر ئەو شێوازی حوکمڕانییە نەگۆڕن میللەت زیاتر ناڕازی دەبێت. نابێ لە کوردستان دوو میللەت هەبێ، ئەوەی لەگەڵ پارتی و یەکێتی نەبێ هاووڵاتیی پلە دوو بێ و هەموو مافێکی بخورێ.

**• راستە خەڵك ناڕازییە، بەڵام دەبینی لە بچوکترین بۆنەدا دەیان هەزار کەس ئاڵای زەردو سەوز هەڵدەشەکێنن؟**

ـ ئەوە جیایە، دەتوانن خەڵکێکیش بۆ ئەو کارانە ئامادەبکەن. یان خەڵکێك لەبەرامبەر بەغدا پشـــتگیرییان دەکا، ئـــەوە بۆ ئەوان نییە، با پارتـــی و یەکێتی هەر یەکە بەجیا بەشـــداریی هەڵبژاردنی بکردایە، بزانە چەند دەنگیان دەهێنا، راستە دوو حزبی گەورەن، بەڵام ئەوەی بەغدا دەنگی کوردە لەبەرامبەر بەغدا، دەنگی حزبێك و دوو حزب نییە بە تەنها، خۆشـــیان ئەوە دەزانن، هەمووشمان ئەوە دەزانین لەبەر ئەوە دەبێ ئەوان نوێنەری خەڵکی کوردســـتان بن، نەك نوێنـــەری حزبەکان، یان ئیمتیاز لە کوردســـتان بەس بۆ حزبەکانی خۆیان بێ، یا خەڵکی بێلایەنیش پێیان بدرێ. لەعێراق دوای رووخانی سەدام (٥٠ ـ ٦٠) ســـەفارەت ئاوەدانکراونەتەوە، لەهەر سەفارەتێك وەك ئێمە بیستوومانە (٨) پشـــکی بۆ کورد هەیە، تا ئێستا یەك کورد پۆستێکی وەرنەگرتووە، لە غەیری پارتی و یەکێتی. بۆ؟ ئەو پۆستە بەناوی کورد دەدرێ، با دووکەسی بێلایەنیشی تێدابێ.

فاتح رەسول جگە لەوەی خەڵکی کۆیەیە، کەسایەتییەکی دیاری ناو بزاڤی حزبی شیوعی عێراق بووەو، ماوەیەکیش سکرتێری ڕێکخراوی هەرێمی کوردستان (کە لقی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق)بووە، بەتایبەت لەساڵانی تێکچوونیان لەگەڵ حزبی بەعس لە ساڵی ١٩٧٩، واتە کاتێك پەیوەندی نێوان حزبە کوردستانیەکان ئاڵۆزی تێدەکەوت، بەتایبەت یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ حزبی سۆشیالیست و پارتی و..هتد

هاوڕێ فاتح ئاگاداری نیازپاکی هەر لایەکە کە هەیبووە، بەڵام هەست دەکەی لەم دیمانەیەدا، نایەوێ هەموو شتێك بڵێ، بەڵکو دەیەوێ هەندێ شت لەسەر زاری ئەوەوە نەوترێ، تەنانەت لە نووسینی بیرەوەرییەکانیشی هەر وای کردووە، بۆیە کاتێك بە هەندێك پرسیار تووڕە دەبوو، حەزی دەکرد هەندێ زانیاری بدات، بەڵام یەکسەر خۆی لێدەکێشایەوە، لەم ڕوانگەیەوە هەستم کرد ئەوکاتەی کە سکرتێری هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعیش بووە، ڕۆڵێکی زۆر تەوافوقیانەی هەبووەو، بڕیاری یەکلاکەرەوەی نەبووە، تا وای لێهات ئەو حزبەش ڕوویەڕووی شەڕی ناوەخۆبووەو تێوەگلا، بەڕادەیەك گەورەترین زیانی لەخۆیدا، شەڕی پشت ئاشان نیشانەیەکی زەقی ئەو شەڕە کاولکارەی ناوخۆیە.

فاتح رەسول ڕووی لەهەندەران کردو، لەکاری حزبایەتی دوورکەوتەوە، بەڕادەیەك کە دەهاتەوە کوردستانیش ڕۆڵێکی کاراو بەرچاوی نەبوو، بەڵکو هەوڵی دەدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بپارێزێ و ئەویش لەدەست نەدات، لەم دیمانەیە نزیکەی یەك ساڵ و نیو (١٨)مانگ بەر لە ئیمڕۆ کراوە، کە هێشتا حەزی دەکرد دیمانەکەی خۆی ببینێ، زۆر بەداخەوە هێشتا لەڕووی تەندروستییەوە، هاتووچۆو سەفەری دەکردو باش بوو، بەڵام مردن تەنگی پێهەڵچنی و تا گیانی لێ سەند، بەڵام فاتح لە هەموو بارێکدا تێکۆشەر بوو، نیشتمانپەروەر بوو بەسەر بەرزی ژیا، خزمەتی زۆری میللەت و نیشتمانەکەی خۆی کرد، هەر بە پاکیش گیانی بە خاك سپارد.

*** باشە مامۆستا دەکرێ بزانین ڕێك ئینتمای سیاسیت بۆ ساڵی چەند دەگەڕێتەوە؟**

- ئینتمای سیاســیم بەبێ کەم و زیاد دەگەڕێتەوە بۆ شــوباتی ١٩٤٦، لە شوباتی ١٩٤٦ منیان بۆ ئەندامییەتی لە حیزبی شیوعی عێراقی پاشی چەند مانگێك ڕێك ئەتوانم بڵێم لە ناوەڕاســتی دەوروبەری حوزەیران وەرەقەی ئەندامییەتیم بۆ هات کاغەزێکی بچووك بوو بە خەتی ورد نووسرابوو بە ئیمزای فەهد، یەکەم ناوی نهێنیم لە حیزبی شیوعی عێراقی گەندوش بوو پرسیم لەو برادەرانەی ئەو ناوەیان بۆ من هەڵبژارد بوو دووکەس بوون هەردووکیشیان ئێستا لە ژیــان ماون وتم گەندوش یەعنی چی گوتیان یەعنــی دەرزی بێگومان لەوکاتەوە من بەردەوام بووم لە حیزبی شیوعی.

*** بۆچی ئیمزای فەهد بوو؟**

- یەکەم جار ئێمە کە یەکەم شانەی حیزبی شیوعی لە کۆیە دانرا پەیوەندی ڕاستەوخۆمان بە بەغداوە هەبوو، چونکە حیزبی شــیوعی ڕێکخســتنی شەبەکەی ڕایەڵی ڕێکخستنەکەی لە لیوای هەولێر تازە دەســتپێکرد بوو زۆری نەخایاند هەر لە کۆتایی ١٩٤٦ یەکەم لیژنەی مەحەلی لە هەولێر پێکهات پەیوەندی کۆیە یەکسەر بە هەولێر گرێدرا.

*** باشــە لە ســاڵی ١٩٤٦ کە بوویە شیوعی ئەی لە ســاڵی ١٩٤٧ بۆچی بە تۆمەتی بارزانییەکان گیرای، شتێکی لەم بابەتە هەبوو؟!**

- تەبعــەن پــاش ئەوەی کە زۆر بەداخەوە کۆمەڵەی کۆمــاری مهاباد لەلایەن ئەرتەش و ســوپای داگیرکەری ئێرانی بە ســەرۆکایەتی جەنەڕاڵ رازمارا هــان، مهاباد گیراو قازی محەمەد و دەوروبەری شەهیدکران، بارزانی مەلا مستەفای نەمر لەگەڵ پێنج سەد کەسێك شێرانە بەخۆڕاگری بەربەرەکانێی سێ حکومەتیان کرد عێراق و ئێران و تورکیا، تا توانیان لە ئاوی ئاراس بپەڕنەوە ئەو بارزانیانەو ئەو خێزان و شــتانەی کە مابوون لەگەڵ خوالێخۆشبوو شــێخ ئەحمەدی نەمر لە دیانا کەمپێکیان بۆ کراوە ناوی لێندرا کەمپی دیانا عەلی حیجازی کە ئەوکات بەڕێوەبەری پێویســتی گشــتی بوو سەرپەرشــتی ئەو کەمپــەی دەکرد، ئێمە یەکەم ڕێکخراوبووین زۆر چالاکانە کەوتینە ئیشــکردن، هەر ڕۆژە برووســکەیەکمان لێنەدا بۆ ڕۆژنامەکانی بەغدا"اگلق سراح البارزانین المحجوزین فی کمب دیانا، اگلق سراح شێخ أحمد البارزانــی" من ئەو وەختــە پۆلی دووی ناوەندی بووم نەختێك ئەتوانم بڵێم بزێو بووم، ڕۆژێك چەند جار لە بازاڕی قوتابیان وەڵڵا لە هەموو شــوێنێك زۆری نەخایاند لە کۆتایی نیسانی ١٩٤٧ عارف تاڵەبانی قایمقامی کۆیە بوو ڕۆژێك منیان گرت لەگەڵ چەند کەسێکی دی، یەکسەر ئێمەیان نارد بۆ هەولیر، لە هەولێریش ئێمەیان نارد بۆ سجنی موسڵ.

*** باشــە لە ساڵی ١٩٤٦ بووی بە ئەندام لە حیزبی شیوعی، ئەی ساڵی چەند بووی بە ئەندامی سەرکردایەتی واتە کۆمیتەی ناوەندی لە حیزبی شیوعی؟**

- ئەو پرسیارە چەند قۆناغێك دێنێتە پێش، من وەك بۆ جەنابتم باسکرد لە ١٩٤٧گیرام پــاش هەوڵوتەقەلایەکی زۆر بەر بووم، کە بەربووم چوومــەوە دەوامم کرد لە قوتابخانەو ناوەندیــم تەواوکرد هاتمە ئامادەیــی لە ئامادەیی ئەو وەخت شــەهید جەمال حەیدەری بەرپرســی هەولێر بوو یەك لەو کەســانە بووم کە لە ئیشکردن و لە پەیوەندی حیزبی نزیك بووم لەو، نێزیك بووم لە ئەو.

*** تۆ ساڵەکەم پێ بڵێ، بڵێ ساڵی ئەوەندە بووم بە سەرکردایەتی؟**

- ئاخر دەزانم ئێستا دێم، دوایی دیسان لە ١٩٤٩ لە سانەوی هەولێر دەرکرام.

*** لەسەر سیاسەت؟**

- لەســەر حیزبی شــیوعی، لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لە مەحکەمەی عورفیی عەسکەریی یەکەم کە ســەرۆکەکەی (عقید عبدالله تحسانی) بوو، زۆر بە قەرەقووشی ئێمەیــان حوکــم دا، کۆمەڵێك لە کەســایەتی ناوداری هەولێریشــمان لەگەڵ بوو، هی سلێمانییشــمان لەگەڵ بوو، وەکو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، کاك کەریم ئەحمەد، رەئوف مەعروف، خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژ لە هەولێر، فایق نادر براکەی عەونی یوسف، ئاری جەلیل وشیار بوو، ئێمە هەموو حوکمدراین و کۆمەڵێکی زۆر حوکم دران، کە بەربووم دیسان لە ســنوورو شتی وا بوومە ئەوکاتە بێگومان وەفدی حیزب ئەوەبوو ئیشوکاری مەنتیقەی کۆیە بە من راسپاردرا، لە ١٩٥٦ بوومە ئەندامی سەرکردایەتی رێکخراوی دوورخراوەکان لە بەدرە کە ١٣٠ شــیوعی بوون ئاســتێکی قیادی هەبوو، من بووم بە ئەندامێکی ئەو هەیئەتە، لە دوای ١٤ی تەمموز.

*** بە هەڵبژاردن بووی یان بە...؟**

- نا هەموو بە تەعین.

*** لە ١٩٥٦ کۆنفرانسەك بەسترا کە کۆنفرانسی دووەم بوو؟!**

- نەء، نەء، ئێمە لە سجن بووین، هەڵبەت لە پاش ئەوە ئەمن زۆر لە زیندان مامەوە، ٧ مانگ پێشی ١٤ی تەمموز بەربووم، لە ١٤ی تەممووز ئۆتۆماتیکیەن شەهید نافع یونس ســکرتێری لیژنەی مەحەلی لیوای هەولێر بوو، لە ٢٧ی تەممووزی ١٩٥٨ هاتە کۆیە. من ئەوکاتە سەڵت بووم، ژنم نەبوو، گوتی تۆ بویە کادری موحتەریف و لەم رۆژەوە نابێ هیچ ئیشــێ بکەی، من دوکانم هەبوو لەگەڵ برام و بابم و ئەوانە، گوتی دەبێ واز لە

هەموو شـــتێك بێنی بێگومان ئێمە ئەوەندە دڵســـۆز بووین بۆ ئایدیۆلۆژیاو بۆ بیرو بڕوا وامزانی جائیزەیەكی زۆر گەورەم وەرگرتووە، شەقەكم لە هەموو ئیش و شتەكان داو ملم لێنا بووم بە سەربازێكی حیزب و ئەندامی لیوای هەولێر.

*** مەحەلی بوو لیوا نەبوو؟**

- لیژنـــەی مەحەلی بوو، پاش چەند مانگێك لـــە بەغداوە بڕیاریان دا منیان حەپس كرد، هاتمە ئێرە(هەولێر) رێك لە ســـەرەتای ١٩٥٩ بوومە جێگری ســـكرتێری لیژنەی مەحەلی لیوا و بەرپرسی بزووتنەوەی جووتیارانی لیوای هەولێر. ئەوكات حیزبی شیوعی تارادەیەك زاڵبوو بەســـەر هەموو بزووتنەوەی فەلاحی لیوای هەولێر. هەڵبەت سكرتێری حیزب لە هەولێر ئەوكات شـــەهید ئەحمـــەد مەحمود حەلاق بوو، من ئەندامی مەكتەب بووم و لەگەڵ ئەمر عادل ســـەلیم، بەڵام ئیشـــوكاری بزووتنەوەی جوتیارانی لیواكە و ئەوانە هەمووی لە ئەستۆی من بوو، وەكو دەڵێ خۆشبەختانە زۆر لەو تێكۆشەرە فەلاحە ئازایانە ئێستا ماون، پێویست بەوە ناكا هەندە زۆرن كە ناویان بدەم.

*** بەڵـــێ ناویانم ناوێ، مەبەســـتم تەنهـــا ئەوەندە بوو رێك ســـاڵی چەند بووی بە سەركردایەتی؟**

- بـــا پێت بڵێم لە كۆتایـــی ١٩٦٠ ئاگاداریان كردمەوە كە بۆ هەرێمی كوردســـتان پاڵێوراوم.

*** مەكتەبی ئیقلیم؟**

- نەء، پاڵێـــورام بۆ ئەندامی لیژنەی هەرێمی كوردســـتان، ئەو وەختە ناوی (لجنة اقلیم كردستان لحزب الشیوعی العراقی) بوو، گواسترامەوە بۆ كەركووك، بەرپرسیارەتی حزبیی فرقەی دووی جەیشـــی عێراقیان پێ ســـپاردم و ماوەی ١٩٦١، ١٩٦٢ تا ٨ی شوباتی ١٩٦٣، ٤٠ شەویش دوای ٨ شوبات لە كەركووك بەنهێنی مامەوە كە حوكم درام و حوكمی غیابی درام بە ئیعدام و رەسم و شتم بڵاوكراوە، ئەو وەختە لەلایەن هاوڕێیەك كە ئێستا خۆشبەختانە ماوە، زۆریش برادەرێكی نێزیكمە هەرچەندە بە تەمەنەو پیرە ئەو هـــات پێی گوتم كوڕە خۆت نەجات دە، ئـــەوە لێتدەگەڕێن بتگرن لەت و پەتت دەكەن، چونكە چەند ئەفســـەرەك و چەند كەسەك دانیان پێداناوەو گەیشتمە شاخ، لە شاخ وەكو كادرێك، ئێمە چەند كەســـێك بووین مابووینەوە قیـــادەی حیزب هەمووی ئیعدام كران، سكرتێرمان ماوەیەك كاك عەزیز بوو، دوایی كاك كەریم بووە سكرتێری لیژنەی هەرێمی كوردستان.

*** له شاخ مەبەستت ١٩٦٣یه یان ١٩٧٩؟**

- نا نا مەبەستم ١٩٦٣یه، له ١٩٦٣من مامەوه له شاخ تا ١٩٦٨ بۆ ماوەی ساڵ و نیوەك تا دوو ساڵ، ئیشوکاری رێکخراوەکان و سەرپەرشتی رێکخراوەکانی حیزبی ناو پێشمەرگەی حیزبی شیوعی عێراقی بووم له ناوچەی گەلاڵەو رەواندوز، بنکەکەم له دەرگەڵه بوو، دوای ئەوه چوومه دەرەوه له پەیمانگای (مارکسی- لینینی) خوێندم، وانەکانی ئابووری سیاسی و بزووتنەوەی کرێکاری و ئەوانەم خوێند، ئاگاداریان کردم له ساڵی ١٩٧٢ پاڵێوراوم بۆ لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراقی، له کۆنگرەی ١٩٧٦، له کۆنگرەی "٣" به ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرام و مامەوه له لیژنەی مەرکەزی تا کۆتایی ١٩٨٥. له کۆنگرەی"٤" ئێمه کۆمەڵێك له کادره کۆنەکانی حیزب دەنگمان نەهێنا، بەڵام وەکو کادری (متقدم) ماینەوه من ئەوکاته چوومه سوریا، له سوریا بوومه ئەندام له نووسینگەی پەیوەندی هێزەکانی نیشتمانیی سەربه مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عێراقی و "٣" ساڵ لەوێ پەیوەندیم به ئەحزابه کوردییەکان دەکرد.

*** واته بەرێزت له ساڵی ١٩٧٢ هەڵبژێردرای بۆ سەرکردایەتی؟**

- بەڵێ.

*** هەڵوێستی بەرێزت له وتووێژی حکومەتی بەغدا بۆ چوونەناو (بەره) یان نەچوونه ناو جەبهه چۆن بوو، لەو دەنگدانانه لەگەڵ بەشداریکردن بووی لەگەڵ حکومەت له یەك بەرەدا یا دژبووی، بەڵام تۆزێك به کورتی چونکه بەم شێوەیه بێ زۆر درێژ دەبێ؟**

- هەقیقەت ئەمن، له هەموو نووسینەکانم نووسیتم له هەموو کارەکانی حیزبی شیوعی له چاکەو خراپه بەشداربوویمه، من لەو بڕیاره لەگەڵ هاوکاری و تەعاون بووم لەگەڵ بەعس.

**!؟ لەگەڵ بەعس ***

- بەڵێ چونکه ئێمه ئومێدمان ئەوەبوو پارتیش بێته ناو جەبهەکه، بەو ئومێده بووین.

*** باشه له ١٩٧٩، که چوونه شاخ دەڵێن ئێوه یەکێکتان گرتووه به تۆمەتی بەکرێگیراوی که ناوی حوسێن رەسول میران بووەو دەڵێن سێ حیزبی کوردستانی بەرگریان لەو حوسێن ناوه کردو داوای ئازادکردنیان دەکرد، دەکرێ بزانین ئەو سێ حیزبه کێ بوون؟**

- من ئەوکاته له ناوزەنگ بووم سەرپەرشتی ئیشوکارەکانم دەکرد، که له (بەرید)ی رێکخستنەکانی قەڵادزه ناوەکمان بۆ هات، وتیان کوڕێك هەیه ناوی حوسێنه، ئەو کوڕه

هات ئیلتیحاقی کرد، که ئیلتیحاقی کرد گوتیان ئەوە جاسوسێکی خەتەرە، سۆشیالیست گوتی ئەمە هی ئێمەیە و یەکێتی نیشتیمانی گوتی هی ئێمەیە، دوایی پارتیش گوتی هی ئێمەیە، پاشان خۆی بە هیچ رانەوەستا هەڵات و فیسکەکی لە چاوی هەمووان دا و چۆوە ناو رژێم.

*** ئێوە بەرتاندا، یان...؟**

- نەء، ئێمە بەرمان نەدا، دوایی ئێمە تەسمیلی سۆشیالیستمان کردەوە، ئیسراریان کرد و پێیان داگرت وتیان ئێمە کەفالەتی دەکەین.

*** حیزبی شیوعی ئی هەموو عێراق بوو..**

- بەڵێ.

*** سـەبارەت بە ئەوکاتە، کوردسـتانچییەتی و کوردسـتانییەت و ئەوە نەبوو حیزبی شیوعی عێراق بوو و هەر تاکێکی دیکە کە لە ریزی حیزبی شیوعی عێراق بوو کەچی کە لە ١٩٧٩ حیزب لێدرا چووە شاخ لە سەرکردایەتی حیزبی شیوعی تەنها چوار هاوڕێ لە شـاخ مانەوە ئەوانیش کورد بوون کە ئەوانە سـەرکردایەتی بن بەڕێزت یەکێك بووی لەوانـە، لەگەڵ ئەحمەد بانی خێلانی و هاوڕێ کەریم ئەحمەد و چەند کەسـێك بوون، کەچی عەرەبەکان هەموو چوونە ئەورووپا، ئێوە ئەوکاتە هیچ تێبینییەکتان نەبوو باشە بۆ دوو عارەب لە سەرکردایەتی حزب لەگەڵتان لەو شاخە نەمانەوە، کار بکەن؟**

- خـۆی ئەو بۆچوونەی جەنابت زۆر راسـتە، حەقیقەت لە سـەرەتای راکردنمان بۆ شاخ، لە سەرەتای ١٩٧٩ کۆتایی ١٩٧٨، بەڵام دوابەدوای ئەوە لە ساڵی ١٩٨٠- ١٩٨١ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بە کاکی خۆم بڵێم، یەکە یەکە هاتن...

*** ئەوانیش سەردانیان دەکرد؟!**

- نا نا زۆریان مانەوە، بە حەقیقەت مانەوە، مەهدی عەبدولکەریم ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو لە کوردسـتان شەهید بوو، بە سـەکتەی قەلبی مرد، عەبدولوەهاب تاهیر ماوە، واتە مەسەلەکە دووبەش بوو. لە سەرەتا راستە، بەڵام دوای ئەوە لە ١٩٨١ ئەوانیش هەبوون و پەیدا بوون.

*** دوای ئەوەی کە حیزب بارەگای کردەوە فراوان بوو هاتنەسەر حازرەکی؟**

- بەڵێ، بەڵێ.

*** ئەوکاتە یەعنی لە ١٩٧٩ ئێوە داواتان نەکرد باشە بۆ ئەوانیش نایەن؟**

- ئەوە ئەگەر کتێبی "صفحات من تاریخ نچال الشعب الکردی" بەشی یەکەم بخوێنیتەوە،

ئیشـــارەم پێدایە. من لە ١٩٧٩ دەقی کاغەزی من لەو کتێبە نەشـــرکرایە کە پێشـــنیارم کردیە، پێویستە عەرەبەکانیش بێن.

*** کەس تەبەنی ئەو بۆچوونەی نەکردی؟**

- ئەوکات وەڵامیان نەدامەوە!

*** تۆش بەدوای دانەچووی؟**

- وەڵـــڵا هەر بـــە دوای دادەچووم، بەڵام ئەوە بە رەســـمی ئێســـتا بڵاوکرایەتەوە دەقی کاغەزەکە، تۆ جەنابت ئەو کتێبەت نەدیوە.

*** دیومە بەس رەنگە لە بیرم نەمابێ؟**

- تازە دەرچووە.

*** نەء، ئەوەی ئەخیرم نەدیتییە.**

روخسەت هەیە بیهێنم، دەقی نامەکەی کە من ناردیتم لە ١٩٧٩ لەو کتێبەدا هەیە.

*** نا پێویست ناکات! باشە لە ساڵانی ١٩٧٩ کە بەدرێژایی ١٩٧٩-١٩٨٠ کە لە شاخ بووی ئێوە هەمیشە لەناو ئەو کێشەو گرفتە قووڵانەی حیزبە کوردستانییەکان هاتووچۆتان کـــردووە، تا ڕادەیەك دەتوانین بڵێین ئاگاتان لە حیزبی شـــیوعی نەمابوو، بە قەد ئەوەی جیاوازی و ململانێیەکانی حیزبەکان ئاڵوگۆڕ بکەن و کامە باشەو خەتایی ئێوەیەو خەتایی ئەوی ترە، ئەبێ چاك ببنەوەو...هتد. پرســـیار ئەوەیە، ئێوە بیرتان لە خۆتان نەدەکردەوە، نەخشـــەیەك بۆ حیزبەکەی خۆتان دابنێن، حیزبی شـــیوعی لێدراوەو هاتۆتە شـــاخ جێ پێگەی خۆی بکاتەوەو ئێوە بوونەتە حەکەمی نێوان یاری ئەو حزبانە؟ رەنگبێ جەنابت لە هەمووان زیاتر ئەو رۆڵەی ناوبژیوانیشت دیبێ؟**

- ئەو تێبینییەی کە جەنابت باسی دەکەی راستە، بەڵام ئێمە هەموومان لە دوو کەناڵ ئەجوولاینەوە، یەك قەناعەتمان بەوە هەبوو کە چەند بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد یەك بگرێ، رێکوپێکبێ، بەتایبەتی کێشـــەی توندو دژواری نێوان یەکێتی نیشتمانی و پارتی چارەی بۆ بدۆزرێتەوە، ئایندەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی عێراقی گەشە دەکاو بەرەوپێش دەچێ.

*** بەڵام ئێوە هەستتان نەدەکرد تازە چوونەتە شاخ؟**

- ئێمە، ئێمە قەناعەتی تەواومان ئەوەبوو، من یەك لەوانە لەو قەنەعاتە دابووم کە چەندە زەمینەی برایەتی و تەبایی بۆ ئەو رێبازە رێکبخرێ ئەوەندە تەنزیماتی ئێمەش، تەنزیماتی بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردستان و تەنزیماتی دیموکراتی لە عێراق گەشە دەکات.

*** بەڵێ، بەس ئێوە بیرتان لە خۆتان نەدەکردەوە، ئێوە لە حاڵەتێکدا هاتوونەتە دەرێ ئینقاز کراون کە یەکێتیش و پارتیش و سۆشیالیستیش هەموویان بە چاوێکی خراپەوە سەیرتان دەکەن لەبەر ئەوەی ئێوە لەناو بەرەیەکدا بوون، ئەو بەرەیە دژ بە میللەت بوو، ئێوە چۆن دەتوانن ببنە حەکەمی ئەو حیزبانە؟**

- ئینجا، بابە با پێت بڵێم، من بەشەخسی زۆر لەناو لە کۆڕی ئیشەکەدا بووم، من هەستی ئەوەم نەدەکرد کە ئەوانە بە چاوێکی خراپ تەماشامان دەکەن، جارێ هەتا برادەرانی سۆسیالیست جیا نەبووبوونەوە، هاوکاریمان لەگەڵ هەموویان رێکوپێك و تەبابوو، یەکێتی نیشتمانی لەسەرەتادا لە ناوزەنگ و لەو ناوچانە زۆر باش و دڵسۆزانە دەستی یارمەتیان بۆ ئێمە درێژکرد، برادەرانی پارتی لە دەڤەری بادینان دەستی یارمەتیان بۆ ئێمە درێژکرد، کە ئێمە لەگەڵیان دادەنیشتین گوێیان لە ئێمە دەگرت و ئامۆژگاری ئێمەیان بە هەند وەردەگرت، هەروەها تەقەلای ئێمە لە بەینی هێزەکانی کوردستانی عێراق لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی رۆژهەڵات بەتایبەتی لەوکاتەی کە شەهید قاسملو ئەوەی دەکرد تەجاوب هەبوو لە بەیندا، تەجاوب هەبوو.

*** ئا، بەڵام هی ئەوە نەبوو ببنە حەکەم؟**

- بەڵام لێرەدا ئێمە نەهاتین یەعنی بڵێین کە لەو بوارە جهودمان سەرف دەکرد، تەنزیمات واز لێ بێنین ئاگامان لە تەنزیمات بوو، کادیری تایبەتیمان هەبوو.

*** بەس تێبینیت نەدەکرد کاك فاتح لەو کۆبوونەوانە هەر ئێوە دەچوونە بارەگای حیزبەکان، یەعنی بارەگای بەتایبەتی یەکێتی نیشتمانی، یەعنی ئەوان ئەوەندە نەدەهاتنە لای ئێوە، هەر ئێوە؟**

- بەپێچەوانەوە.

*** ئەگەر بەپێی تێبینییەکانی خۆشت، رێگەی پێ بدەی کە باش دیقەتم داوەتە ئەو شتە، هەموو جارێ ئێوە بە سەردانێك چوونە لەگەڵ فلان و فیساری چوونەتە بارەگای یەکێتی لەگەڵ فلان و ئیستقبال کراون؟**

- با پێت بڵێم ئێمە لەبەر ئەوەی وەکو سەر سپی، وەکو تەرەفی سێیەم وا بووین.

*** بەڵام ئێوە بە خۆتان، خۆتان کردبووە سەر سپی؟**

- نەخێر ئێمە وەکو سەر سپی وەکو ناوبژیوان رەفتارمان دەکرد، دوای ئەوە یەکێتی خۆیان زۆربەی مەشاکیلەکانیان دەهێنایە لای ئێمە کە کێشەیان لەگەڵ سۆشیالیست وا دژوارە، وەرن چارەسەری بکەن، پارتی لە هەندێ شوێن، هەندێ تێبینی هەبوو، مەفارزی پارتی دەگیرا.

*** بەڵام هیچیشتان بە هیچ نەکرد؟**

- نەء، بەپێی قەناعەتی من زۆر شتمان کرد.

*** ساڵی ١٩٨٠ جەبهەیەکتان کرد؟**

- ئەوەی یاداشـــتەکانی من و ئەو سێ بەرگە بخوێنێتەوە "صفحات من تاریخ کفاحه شعب کردی"، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی خەباتی گەلی کورد کە سەدان دیکۆمێنت، ســـەدان نامە، سەدان کاغەزی سەرکردایەتی حیزبە کوردستانییەکانی تێدایە، هەمووی شـــایەدن بۆ ئەوەی کە ئێمە بە دڵسۆزانە تێکۆشاوین لەپێناو چارەکردنی مەشاکیلەکان، بەڵام زۆر شـــت هەبوو لە ئیرادەی ئێمەدا نەبوو، یان فشاری دەرەوە چ لە ئێران بوو چ لە عێراق بەتایبەتی ئێران و عێراق دەوری زۆر زۆر ناشیرین و ناڕەوایان دەدیت.

*** عێراق بەرامبەر بە کام حیزب دەیدیت؟**

- عێراق دەوری ئەوە بوو و هەوڵی دەدا، لەگەڵ هەر سێ حیزبە کوردییەکان هەوڵی دەدا.

*** بۆ ئەوەی گرفت دروست بکا؟**

- لەگەڵ هەر سێ حیزبەکان، لەگەڵ یەکێتی.

*** باشە ئەوان بەخۆیان نەیاندەزانی؟**

- زۆرباش دەیانزانی، لەگەڵ یەکێتی هەیبوو، لەگەڵ سۆشیالیست هەیبوو، لەگەڵ پارتی هەیبوو و ئەوەی کە دەڵێ نەیبووە راست ناکا و تەئریخ هەرچی لەژێر....

*** بەڵگەت بەدەســـتەوە هەیە کە بەعس خەڵکەکی دروست کردبێ لەناو ئەو حیزبانە لە سەرکردایەتی؟**

- ئەمن هیچ بەڵگەیەکی وەهام بەدەســـتەوە نییە، بەڵام ئەو وەسایق و شتانەی کەوا لەلای حیزبەکانە ئیحتیماله بە سەدەها مەلەف و شتی وای تێدابێ، ئەمن هیچ شتەکم بەدەستەوە نییە لەو بابەتە.

*** باشـــە بەپێی ئەو گفتوگۆیانەی جەنابت دەتکرد لەگەڵ ســـەرکردایەتیی حیزبە کوردستانییەکان وەك قاسملو بوو، مام جەلال بوو، هەتا ئەوانی تریش؟**

- ئێمـــە دەچووینە راژان لای کاك مەســـعودی، لای خوا عافـــوی کاك ئیدریس بارزانی، لای کاك عەلی عەبدوڵڵا، فازڵ مەتنی، برادەری خۆشەویســـتم کاك فەلەك ئێمە بەبەردەوام دەچووین، یەعنی...

*** باشە ئێوە بارەگایەکتان لە سوریا هەبوو تەقریبەن سەرکردایەتی بڵێین لەوێ بوو؟**

- بارەگای سەرەکیی مەکتەبی سیاسی لە سوریا بوو.

*** لە سوریا بوو، ئێوەش وەکو سەرکردایەتییەك لە کوردستان بوون؟**

- بەڵێ.

*** تەوجیهاتتان لە هی سوریا وەردەگرت لە کاتێکدا ئەوان لە دنیایەکی دیکەدا دەژیان؟**

- با ئەو حەقیقەتەت پێ بڵێم، ئێمە کە لە کوردستان بووین ئەو هەیئەتەی لە کوردستان بوو خەتی عامەکەی بزووتنەوەکە لە کوردستان ئێمە خۆمان نەخشەکەمان دەکێشا، بەڵام خەتی گشتیی و پەیوەندی و مەسەلەی دارایی و پێوەندیی نومەمی و ئەو شتانە لە سوریا چارەسەر دەکرا.

*** زۆرجار لە سوریاوە بڕیارتان لەسەر فەرز نەدەکرا دەبێ وابکەن وانەکەن لە کاتێکدا ئەوانە لەناو واقیعەکەش نەبوون؟**

- وەڵڵاهی ئەوەی من بێتە یادم، بە زەمیرم ئێمە خۆمان بەتایبەتی فەترەك کە زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کەوتنە کوردستان ڕیارەکان لە کوردستان دەدران.

*** باشە پارتی لە ١٩٧١/١١/٤ کۆنگرەی ٩ی بەست لەوێندەر حیزبە کوردستانییەکانی داوەت نەکرد، تەنها حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا چوون، ئەوانی تر حسك و یەنك نەچوون، سەبەبەکە چ بوو خۆ ئەوکاتە هێشتا خلاف دروست نەبیوو؟**

- با من پێت بڵێم تەبعەن ئەگەر ئەو ڕاپۆرتەی کە کەوتە دەستی من دەربارەی ئەو کۆنگرەیەی ٩ی پارتی دیموکراتی کوردستان لەلایەن برادەرو هاوڕێی خۆشەویستم مەحمودی فەقێ خدر کە یاوەری یوسف حەنا بوون هەردووکیان ئەو دووە مەندووبی حیزبی شیوعی بوون و من لە بەرگی یەك بڵاوم کردیتەوە ئەگەر ئەوەی بخوێنیتەوە تێدەگەی کە ئەوان پەیوەندیان زۆر خراپ بوو لەگەڵ یەکێتی، ناحەزیان زۆر بوو لەگەڵ د. قاسملو و هەروەها لەگەڵ سۆشیالیستیش تەبا نەبوون، لەبەر ئەوە تەنها نوێنەری حیزبی شیوعی و وابزانم حیزبەك یان دوو حیزبی کوردستانی باکووریش داوەتکرا بوون.

*** باشــە بەپێی ئەوەی جەنابت خەڵکی کۆیەی زۆرجار کە یاداشتەکان دەخوێنیتەوە هــی وا هەیە ئینتباعەکی لا دروســت دەبی کە زیاتر پشــتگیرییەکت بۆ مام جەلال کردووە لەو ململانێیەی هەبووە، زیاتر ئۆبالی گوناهەکانت لە ملی حســك ئالاندووە، ئایا مەسەلەی عاتیفەی ناوچەگەری لە نووسینەوەی دەوری نەبووە؟**

- ئەوە من پێت بڵێم ئەوەڵەن من حەزدەکەم ئەوەش بەڕاشکاوی بنووسم من مام جەلال برادەرمە، برادەری مندالیمە و سەرەتای خەباتی سیاسی پێکڕا ئیشمانکردیە ماوەی ساڵ و نیوەك، ئــەوە مام جەلال، ئەوەش ئینکار ناکرێ بەڵام بەس بە قەناعەتی ویژدانیی من و بەپێــی ئەو دیکۆمێنتانەی کە من بڵاوم کردیتەوە موتڵەقەن من ئینحیازم نەکردییە نە بۆ یەکێتی نە بۆ حیزبی شــیوعی نە بۆ پارتی و دەربارەی هەموو تاوانەکان، دەربارەی مەسەلەی جەمالی عەلی باپیر کە چوو لەگەڵ شێرکۆی شێخ عەلی بەناوی دەعوەت و دۆستایەتی و دوایە ٢٦ پێشمەرگە کوژران، من بە ئەمانەت هەمووم بڵاوکردوونەوە، گوتم تاوانیش لەلایەن پێشمەرگەکانی یەکێتی بووە.

*** بەڵام شەخصی مام جەلال لەوێ ئەوەت نەکردیە خۆ یەکێتی کێ قیادەی دەکرد؟**

- مســاعدە بکە پێت بڵێم وەکو پێم گۆتی من تەبعەن زۆر حەتا لەناو حیزبی شیوعی بە(نا ئینســافانە) هەستم دەکرد وا تەسەوریان دەکرد کە من نەختەك دایئەشکێنم بۆ لای مام جەلال، تەبعەن حەقیقەتی تەئریخی وانەبووە، من علاقاتم....

*** باشە ئەو ئینتباعە بۆ دروست بووە منیش یەکێکم لەوانە بووم کە ئەو ملاحەزەم دا؟**

- زۆر سەرســەرم، تەبعەن لە قیادەی یەکێتی کە گەیشــتمە ناوزەنگ تەماشــام کرد مام جەلالی تێدایە برادەری مندالیمە، فوئاد مەعصــومی تێدایە برادەری مندالیمە، خدر مەعسوم برادەری مندالیمە، کەمال خۆشناو برادەری مندالیمە، نازم کوڕی خالی خێزانمە، بە حوکمی ئەو عەلی حەوێز ئەوانە هەموو، من عیلاقەی دۆســتایەتیم هەبووە بەڵام ئایا رۆژێك لە رۆژان من تەحەدای هەموو قیادەی حیزبی شیوعی عێراقیش دەکەم با یەکەکیان بێت بڵێ باوکی ئاسۆس ئینحیازی کردیە لە فلان هەڵوێست دژی بەرژەوەندی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی.

*** باشە ئەی ئەو ئینتیباعە بۆ دروست دەبێ یەعنی دەڵێن دووکەڵ بەبێ ئاگر نابێ؟**

- پێت دەڵێم ئەو دووکەڵە من پێت دەڵێم، لەناو حیزبی شــیوعی عەناسری وا هەبوون بە راستی رارابوون...

* **له سەرکردایەتی؟**

- له ســـەرکردایەتی حیزبی شـــیوعی رۆژەك کە دەچوونـــە راژان مەوقفەکیان هەبوو دەهاتنـــەوە کن مام جەلالی مەوقفەکیان هەبوو، من دژی ئەوانە بووم ئێســـتاش لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا من کابرایەکی خۆم بە سیاسییەکی سەربەخۆ دائەنێم، لە رووی ئینتمای حیزبی بەڵام لە رووی ئایدۆلۆجی من خۆم بە ئینسانەکی مارکسی دادەنێم و مارکسییشم، چونکە لە هەموو حەیاتم لام نەداوە لە حیزبەك نەپەڕیمەوە بۆ حیزبەکی دی لە ماوەی "٦٠" ســاڵ، بەڵام ئەمن دائمە ئەڵێم حیزبایەتی سیاسەتە وەکو لینینیش دەڵێ وەکو چەرچلیش دەڵێ مۆرکەکە لە تیجارەت چ حیزبەك...

* **ئەمە لینین دەڵێ فەنی مومکنە، ناتوانی؟**

- نەء، ئەوە مارکس دەڵێ سیاسەت (فن ممکنات) ئەوە مەوزوعەکی دیە، بەڵام برادەر هەبووە کە لە راژان بووە مەوقفەکی بووە هاتیتەوە ناوزەنگ مەوقفەکی دی هەبووە، تەبعەن من لەگەڵ ئەوە نەبوومە، ئەمن بچم...

* **باشە ئەو برادەرە دەکرێ ناوی بڵێی؟**

- نەخێر ئەمن ناوی ناهێنم، بەڵام مەســـەلەن کابرایەك کتێبەکی دەنووسی و دەڵێ (کنا نســـمی باللجنه المرکزیه الرفیق ابو اسوس، الرفیق الجلالی باللجنه المرکزیه) من ئەوەم بیســـتیتەوە، من چوومە سلێمانی، من ویستم ســـەر لەو هاوڕێیە بدەم لەگەڵ ئەندامانی ســـەرکردایەتیی یەکێتـــی دەعوەتیان کردم، گوتم وەڵڵا حەزدەکـــەم ببینم، پێی بڵێم ئەمن جەلالیمە یا ئەو کە مانگێ ٢٤ هەزار دینار وەردەگری، هەموویان سوندیان خوارد ئەوەی بڵاوکەوە وتیان ئێمە مانگێ "١٥٠" هەزار دیناری دەدەینێ.

* **بەڵام من مقابەلەم لەگەڵ کرد دەرێ پارەی وەرناگرم؟**

- گـــوێ بدێ، دەڵێن ١٥٠ هەزار دینـــاری دەدەینێ مانگێ بۆ تەنزیمەکەی و ٥٠٠٠ هەزار دۆلاریش مانگانە بۆ خۆی بەس ئەوە بڵاوکەوە بە ناوی من.

* **بەس ئەمن بڵاومکردەوە مقابەلەکم لەگەڵی کرد؟**

- ئەتو بەناوی من ئەوە بڵاوکەوە من دەڵێم مێوانیان بووم من گوتم لێی دەگەڕێم، پێی بڵێم بە موجامەلە پێی بڵێم ئەرێ کاکە من جەلالیم یان تۆ من هەتا ئێســـتا حەفت دنیا دەزانی بەڵام جەنابت مانگێ ٢٤ هەزار دینار وەردەگری، خۆیان لە من توڕەکرد.

* **باشە ئێستا باسی بەهائەدینت کرد من؟**

- نا من ناوی بەهائەدین نایێنم ئەمن، دەڵێم یەکەك بەڵام ناو مەینە ئەتوو.

*** بەڵام باشە لەسەر ئەوەی لە ١٩٧٩/١١/٢٤ مام جەلال بە جەنابتی وت گوتی بەهائەدین لەلای بەرەی دیمۆکراتی فەڵەستین و...؟**

- ئەوە بڵاومکردەوە ئەوەتا ئێستا بڵاومکردۆتەوە.

*** باشە پرسیارەکە ئەوەیە لۆ بە توی دەگۆ لۆ بە کەریم ئەحمەدی نەدەگۆ؟**

- بە کەریم ئەحمەدیشی وت، تا کەریم ئەحمەد لە سوریا بوو ئەو وەختە.

*** بە عەزیز محەمەدی نەدەگوت؟**

- دوایێ شەکاتی کرد بەرەسمی بەڵام نە عەزیز محەمەد نە کەریم ئەحمەد نە عومەر عەلی شێخ ئەوان موزەکەراتیان نەدەنووسی، من دەمنووسی.

*** بەس ئەتو دەتوانی محاسەبەی؟**

- ئەمن بە عەزیز محەمەدم گوت، شەکواکەی مام جەلال-م بە مەکتەبی سیاسی راگەیاندو کردمە کاغەزەك و بۆم نووسین، ئەمن هیچ شتەك کە عیلاقەی سیاسی هەبووە نەم شاردیتەوە.

**ئا بەس نازانم ئەو ئینتیباعە دروست بووە یەعنی وەکی دەڵێ دووکەڵیش بەبێ ئاگر نابێ، یەعنی دۆستایەتی تو چونکە لە سیاسەت جار وایە دوو برانە هەریەکە لە حیزبەکە، بەڵام کە جیاوازبوون هەریەکە لە حیزبەك بوون ئەو هامووشۆیە نامێنێ؟**

- ئەتو، پێت بڵێم، تەبعەن ئەوەی وەسائقەکانی من بخوێنێتەوە ئەبینی.

*** بەس مراعاتی مام جەلالت کردووە؟**

- **مساعەدە** بکە مراعاتی مام جەلالم کردیە، لەبەر ئەوەی مام جەلال و یەکێتی تائریخیەن دەیلێم و نایشارمەوە کە زۆر زۆر یارمەتی حیزبی شیوعیان دا لە میحنەو سیلاحیان داینێ، من و تۆمە تۆماس یارمەتی و پارەمان لێ وەرگرت و یارمەتیان دەداین لەسەرەتا ها.

*** سەرەتای ساڵی؟**

- ١٩٧٩ -١٩٨٠ هەتا ٨٣ پارچە سیلاحیان بڵاوکردیتەوە محسین یاسین وەریگرێ با ئەمن ناوەکانت پێ بڵێم؟

*** باشە کەریم ئەحمەد دەڵێ کە ئێمە چووینە شاخ پارتی دەعمی کردین؟**

- کەریم ئەحمەد کەیفی خۆیەتی، ئەوەش بنووسە کەریم ئەحمەد کەیفی خۆیەتی ئەوەی دەعمی ماددی مەلموس من و تۆمە تۆماس و ئەحمەد بانی خێلانی یەکەم کەس بووین، من و تۆمە تۆماس یارمەتیمان وەرگرت، من و تۆمە تۆماس خێمەمان وەرگرت،

من و تۆمە تۆماس بە شەخســـی ٨٣ پارچە ســـيلاحم وەرگرت، ئەوەم بڵاوكرديتەوە وەكو ديكۆمێنت تكايە ئيشارەت بدە ديكۆمێنتەكان،چونكە ئەوە ناشاردرێتەوە وەكو ديكۆمێنت، بەڵام تەبعەن كەريم ئەحمەد لۆ خۆی شـــتەك دەڵێ كەيفـــی خۆيەتی ئەمن ناڵێم پارتی يارمەتی مەيان نەكرديە، پارتيش يارمەتی مەيان دەدا، نەخۆشمان دەچووە ئێران بە هەويەی پارتی مێوانيان دەبووين لە رەزائيە لە راژان، ئەوانيش دوای ئەوەی پاش كارەســـاتی پشت ئاشان ئێمە بە تەواوی پچڕاين و بووينە دوژمن لەگەڵ يەكێتی، لە ماوەی دوژمنايەتی ژمارەيەكـــی زۆرمان لێ كوژرا شـــەهيدمان دا، پارتی شـــەو وەختە بەپێی توانای خۆی يارمەتی مەی دەدا مێوانداری دەكردين. لە ســـێلوێ لەژێـــر باڵی ئەوان بەناوی ئەفراد بارزانی ماينەوە دوای ئەوەی چووينە مەنتيقەی بادينان تەبعەن ئەوكاتە وەكو دۆســـتی نزيك، ئەمە...

*** باشـــە ئەوكاتەی لە بەرەی جود دا بوون جەنابت دۆستايەتيت لەگەڵ مام جەلال تا چەند ما؟**

- ئەوكاتە لە پاش پشت ئاشان...

*** نەء پێش پشت ئاشان لە ساڵی ١٩٨٠ بەرەی جود دامەزرا؟**

- مســـاعەدە بكە، تەبعەن ئەگەر جەنابت ئاگاداری بەرەی جود بی، نوێنەری حيزبی شـــيوعی عێراقی من و بانی خێلانی بووين و ئيمزامان كرد، من و بانی خێلانی و كاك مەســـعود و كاك عەلی عەبدوڵلا، تاهير عەلی والی و رەســـول مامەند ئێمە لە گوندی (كەوپـــەر) كۆبووينەوەو ئێمە ئيمزامان كرد. ئەو ئيمزاكردنە رەد فعلێكی لێ كەوتەوە. كە جودمان ئيمزاكردو هاتينەوە، من و ئەحمەد بانی خێلانی هاتينەوە يەكســـەر چووينە لای نەوشـــيروان گوتمان نەوشيروان ئەو جەبهەيەی ئێمە مۆرمان كرديە بۆ دژايەتی ئێوە نييە، دەمانەوێ ئێمە جسربين لە بەينی ئەنگۆ و پارتی، بۆ ئەوەی ئەو كێشەی كە لە ١٩٦٤و لەگەڵ جەماعەتی مەكتەبی سياسی كۆن و ئێستا لەگەڵ يەكێتی بەردەوامە و لە ١٩٧٧ لە مەســـيرەكەی توركيا نوێ بۆوە ئێمە دەمانەوێ ئەوەبين، يەعنی جســـربين، برا بين. تەبعەن هەڵوێســـتی كاك نەوشيروان هەڵوێستێكی سلبی بوو، هەڵوێستێكی باش نەبوو، نە من نە ئەحمەد بانی خێلانی مورتاح نەبووين لە هەڵوێستەكەی.

*** باشـــە ســـەبەبی دەرنەچوونت لە كۆنگـــرەی ١٩٨٥، كۆنگرەی چـــوار يەعنی بۆ دەرنەچووی كە ئەو تەشريخەت هێنابوو هەتا ئەو وەختە؟ لە شاخ دەورت هەبوو؟**

- وەڵلاهی برای عەزيزم مساعەدە بكە، پێت بڵێم تەبعەن ئەو وەختەی كە من دەرنەچووم

ســـكرتێری لیژنەی هەرێمی کوردستان بووم، تەبعەن ئێمە ئەگەر بڵێی بەناوی ئەوەی کە حیزب نوێ دەکرێتەوە جموجۆڵ کرا.

*** دژی تۆ؟**

- نەء، لە دژی من نا لە دژی بیست کادر.

*** یەعنی بووە گروپ گروپانێ؟**

- گروپ گروپانێ و نەتیجەکەش گەورەترین زەربەی لە حیزبی شـــیوعی عێراقی دا و ئەو حیزبە شیوعییەی پوکاندەوە.

*** باشـــە ئـــەو گروپانە زۆرن لەلایەك بەهائەدین نوری کـــە لەگەڵ جەنابت قەت رێك نەبووە؟**

- قەت رێك نەبووینە.

*** کەچی ئەویش دەرنەچووە نەیانهێشت بەشداریێ؟**

- نەء، نەء، بەهائەدین نوری دەر کرابوو لە حیزب.

*** نا لەلایەك ئەو، لەلایەك ئێوە واتان بەســـەرهات، یەعنی بەس گروپی هاوڕێ عەزیز مانەوە؟**

- نەخێـــر، نەخێر گروپی هاوڕێ عەزیز نا، چونکە هـــاوڕێ عەزیز خۆی نا، گروپ یان کۆمەڵەکی موتەئامر لەناو حیزبی شیوعی هەبوو کە فەخری کەریم و ئاراخاچادۆرو ســـەلیم ئیسماعیل بوون بەناوی شۆڕشگێڕییەتی ئەوانەو باری حیزبی شیوعیان تێکدا و بەداخەوە هەندێ کادری کوردی زەعیف لەگەڵ ئەوانەدا بوون.

*** باشـــە مەوقیفی کەریم ئەحمەد و هـــاوڕێ عەزیز و ئەوان لەو مەوزوعە چۆن بوو؟ بەتایبەتی حیزب کە لە شاخ بوو، خەبات دەکا؟**

- عەلاکولین ئەمن نامەوێ لێرەدا...

*** بۆ تەئریخە؟**

- بۆ تەئریخ دەڵێم مەوقفی هاوڕێ عەزیز مەوقفێکی شۆڕشـــگێڕی نەبوو، مەوقفەکی پتەونەبوو، مەوقفەکی (ترجیە) بوو، ئەو لەسەر تەوازنی قیوا تەعامولی دەکرد.

*** کەواتە ئێوە پێگەتان بە قوەت نەبوو بۆیە لەسەر تەوازنی قیوا...؟**

- ها ببوورە ئەوکاتەی تەبعەن جەنابیشتان دەزانن لە موئتەمەرات بەعزەجار موزایەدات دەکرێ/ زۆر شـــت دەبینی شیعاراتی شۆڕشـــگێڕی شۆڕش دەکەین و سەردەکەوین و واو وا، ئەم گروپانەی فەخری کەریم و بە کاکی خۆم بڵێم ئاراخاچادۆرو سەلیم ئیسماعیل و

کۆمەڵێك لەو سەورەتیانە، هەرواش بنووسە سەورەتی کۆمەڵێك لەو سەورەتیانە وایان دەزانی چیای هندرێن دەڕوخێنن و سەردەکەون و کاك عەزیزیش چەپڵەی بۆ ئەوانە لێدا.

*** ئەی هاوڕێ کەریم و ئەوانی تر کوردەکان خۆ بەس هاوڕێ عەزیز نەبوو؟**

- ئێ من پێــت دەڵێم یەعنی ئەکرێ کاك عەزیزیش ئەگەر لایەنگری نەبا نەیدەتوانی دیارە هەشبووە لە ژێر باڵی کاك عەزیزی.

*** باشە تۆ خیلافت لەگەڵ هاوڕێ عەزیز هەبووە؟**

- ئەبەدەن لە حەیاتم ئەمن خیلافم لەگەڵ هاوڕێ عەزیز نەبووە، هاوڕێ عەزیز لە ساڵی ١٩٤٦ هاتیتە ماڵی مە، لە ١٩٥٨ کە سکرتێری ئقلیم بووە پەیوەندی لەگەڵ من بووە، کە من بویمە ئەندامی ئقلیم ئەو لەوێ بووە لە ١٩٦٣، کە لە شاخ بووین ماوەك زۆر منسەجم بووین، بەڵام بۆچوونی فکری، هەڵسەنگاندنی سیاسی دائمە مانای ئەوە نییە....

*** مەبەستم خیلافی فکری و ئایدۆلۆژی و سیاسی بوو کە دەزانم خیلاف خۆ خیلافی ئیجتماعی هیچ ئەوە نییە؟ مەبەستم سیاسی.**

- نــەء خیلافی فکری و، خیلافی بچووك بچووك دەبوو مەســەلەن کادر هەبوو لەناو حیزبی شیوعی نە ئەو منی خۆش دەویست...

*** نە ئەتوش ئەوت خۆش دەویست؟**

- بەڵــێ، نە ئەمنیش ئەوم خۆش دەویســت و عەزیز محەمەدیــش دەیزانی و حەیات ئیســپاتی کرد ئەو کادرە چۆن ئینهیاری کرد و چۆن تەفەســوخی کرد، بەڵام پشــتی دەگرت.

*** باشــە ئێستا دەتوانین بڵێین کۆنگرەی چواری حیزبی شیوعی کۆنگرەیەك بوو وەکو نسکۆیەك بوو بۆ حیزبی شیوعی؟**

- بەبێ شــك ژیان ئیسپاتیکرد، واقع ئســپاتی کرد. کۆنگرە کە گەورەترین شکستی هێناســەر حیزبی شیوعی لە هەمووی غەڵەت تر بوو کە من یەك لەوانە هەتا دەمرم ئەوە قــەت لە بیرناکەم ئێمە لە لوجنەی مەرکەزی بڕیارەکمان وەرگرت کە هەقی ڤیتۆ بدرێتە عەزیز محەمەد ١٠ کەس بینیتە لجنەی مەرکەزی بەبێ هەڵبژاردن بۆ واتکرد.

*** ١٠ کەس بێتە لیژنەی مەرکەزی؟**

- بەڵێ ئەوە کەسێ، کەریم ئەحمەد باسی ئەوەی نەکرد لۆت.

*** نەخێر**

- هەی هەی.

*** ئەوە پێشی مونتەمەر؟**

- نەخێر لەکاتی، بەڵێ بەڵێ پێشی مونتەمەر ١٠ کەس بینیتە ناو سەرکردایەتی بەناوی سیفەتی ئیش، بەڵام ئیستشارەی لەگەڵ بکا من ئەتوم خۆش دەوێ ئەو ئەوی خۆش دەوێ ئەوە، دەکەسی هینا.

*** باشە ئەتو بۆ هەڵوێستت وەرنەگرت؟**

- ئەمن پێت دەڵێم ئەمن یەکێك بووم وەکو وان، منیش یەك بووم من هەر هەندەم پێ دەکرێ لە منیان پرسی کێ تەرشیح دەکەی گوتم زەید تەرشیح دەکەم کوڕێکی باشە.

*** نەتگوت پێویست ناکا کەس تەرشیح بکرێ؟**

- نەمان، ئاخر کاکە گیان زروفی سرِی لە حەرەکاتی شۆڕشگێڕ، زروفی سرِی ماڵوێرانییە، کارەساتە، زروفی سرِی لە حەرەکاتی شۆڕشگێڕی هەزاران تاوان، ئینحرافات، لادان، خەڵك کوشتن، خەڵك دوورخستنەوە، کارەساتی وا روویدەدا کە هەتاوەکو پاش ماوەکی لە تاریخ دەردەکەوێ ئاە لەژێر پەردەی حەرەکەی سرِی و شۆڕشگێڕی چ دەکرا.

*** ئەتو لە دوای مونتەمەر چت بەسەرهات؟**

- ئەمن لە دوای مونتەمەر زۆر بە ئیحترامەوە چوومە سوریا، لە سوریا بووم بە ئەندامی لوجنەی عیلاقاتی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی، کاك عەزیز محەمەد سکرتێرمان بوو ماوەك و سێ ساڵ لە سوریا مامەوە پەیوەندیم هەبوو لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان و تەجروبەکی باشم وەرگرت لێیان ...

*** بەڵام بە عاجزی ئیشت دەکرد؟**

- نەء تەبیعی واجبی خۆم بوو، ئەوەلی زۆرم پێ ناخۆش بوو.

*** لە سکرتێری ئقلیمەوە لە کۆنگرە دەرنەچی؟**

- پێت بڵێم ئەوەلی زۆرم پێ ناخۆش بوو بەڵام دوایێ کە مەسەلەی پرۆسترۆیکای گۆرباشۆف و گۆڕان و شت هات زۆرجار دەم گوت (عسى ان تكرهوا شيئا فهو خير لكم)، مورتاح بووم زۆر و ئەگەر ئەوە نەبا نەدەبوومە ئەو فاتیحەی کە ئێستا لەگەڵ توو دانیشتیمە کە توانیم خزمەتەك بە نەتەوەی کورد بگەیەنم و ساڵ بە ساڵ رۆڵەی کورد دیکۆمێنتەکان ببینێ دەزانی چ ئەهمیەتەکی هەیە.

*** باشــه هاوڕێ ئێوه هەر ناوبژیوانی ئەو حیزبە کوردســتانییەتان دەکرد ئێ باشە ئەو شالاوەی تودە دەیبردەسەر حەدکا لە ساڵی ١٩٧٩-١٩٨٠ و لەو حیزبی شیوعی لە ١٩٧٩ وەزعی خۆی خراپ بوو ئێوە هەر لە ١٩٧٩ لەناو مفاوەزاتی حیزبەکانیشـــدا هاتووچۆتان دەکردە بۆ نەتانتوانی ئەو شالاوەی تودە بۆ سەر حەدکا راگرن، حەدکا حیزبی دیموکراتی ئێران؟**

- ئــا من و کاك عەزیز وابزانم ١٩٨٢ بوو ئەگەر زاکــرە رێگەم بدا، لەگەڵ کیانوری ئیحسان تەبەری و رەزا شــەلتوك کۆبووینەوە ئەوا لەیەك لە کتابەکانم ئیشارەم پێکردیەو لە کاروانێکی دووردرێژیش ئیشـــارەم پێکردیە، کاك عەزیز زۆر بە دڵسۆزی پیشانیداو بە کیانــوری گۆ گوتی حەق وایە چارەی ئەم مشــکیلەیە بکەی، کیانوری ئینفعالی کرد قیژاندی گوتی قاســملۆ عەمیلە، قاســملۆ پارەی وەرگرتییە، حەتا کاك عەزیز ئەوەشم بڵاوکردیتەوە بە دزی بە منی گوت، ئەمە لە تەنیشــت یەك دانیشتبووین، کوڕە گۆتی خۆ ئەمە زەنگە سۆرەمان لەخۆمان وەر دا.

*** یەعنی بیزانیایە مەوقفی ئاوایە هەر باسی نەدەکرد؟**

- وەکو شــێت کیانوری هەڵسا رەزا شــەلتوك و ئیحسان تەبەری دانیشتبون من و کاك عەزیزیش دانیشـــتبووین برادەرەکی موتەرجمیشـــمان لەگەڵ بوو، هەستا هاتووچۆی کرد دەســتی لە مێزەکە دا تووڕەبوو قاســملۆ، قاسملۆ دەســتیپێکرد بە قیژان گوتی قاسملۆ عەمیلە، قاسملۆ پارەی وەرگرتییە.

*** ئێوەش لێی بێ دەنگ بوون؟ مەجال نەما؟**

- چی بکەین، نا، نا لە عیلاقاتی وەتەنی کابرایەك بێ ئێستا ئەمن ئێستا قسەك بکەم لۆ خۆم ئەگەر هەر غەڵەتەکی بیکەم ئەمن مەسول نیمە ئەتو چی گوناحت هەیە.

*** باشە کاك فاتح زۆر بەکورتی لە کۆنگرەی چاری حیزبی دیموکراتی ئێرانی ساڵی ١٩٨٠ ئـــەو کەســـەی ١١٠ نوێنەریان هەبوو هی مامە هێمنی شـــاعیرو مەجموعەیەك جیابوونەوە سەبەبی جیابوونەوەکەیان بە کورتی یەعنی هێمن و ئەوانە مەوقفیان لە حەدکا چ بوو چونکە وەختەکەی زۆر خراپ بوو بۆ ئەوان؟**

- بنۆڕە ئەمن لەم کۆبوونەوەیە دیسان لە بەرگی دوو تەفسیلم نووسیوە، لە بەرگی دوو تەفسیلی ئەو کۆبوونەوەم نووسیە. ئەمن داوام لە برادەرەکم کرد کە ناوی مەلا محەمەدی جوانرۆییە کە ئێســـتا پێی دەڵێن ئەبو تارا ئەندامی مەکتەبی سیاســـییە گوتم تەقریرەکم

لۆ بنووســـە وەکو لە تەقریرەکەی بۆ من باس دەکا نەســڵی کێشەکە ئەوەبوو جەماعەتی قاســملو دەیانویســـت زۆربەی پەیوەندییەکەیان لەگەڵ عێراق پتەوتر بکەن، جەماعەتی غەنــی بلوریان و بڵێین غەنی بلوریان بە دەرەجەی رەئیســـی نەوعە قەناعەتەکی هەبوو، چیان پێ دەگۆ بەخەتەکەی خومەینی پەیڕەوی ئیمام، پەیڕەوی ئیمام کە لە ئەساســدا حیزبی تودە دەورێکی خراپی هەبوو تەئسیری هەبوو لەسەر غەنی بلوریان، حیزبی تودەش سەری تیاچوو، غەنی بلوریان و غیری ویش سەری تیاچوو.

*** باشــە هاوڕێ فاتح زۆرجار کە باسی ســکرتێری هەرێمی حیزبی شیوعی دەکەی هەر حەرفەکــت دەهێنا لە کتابەکان هەر دەڵێی هاوڕێ"ع" بۆ ناوت نەهێنایە ئەو هاوڕێ "ع"ێنە کێیە؟**

- هاوڕێ "ع" ئاخر مەسەلەن أ، ب، أ، ع مەبەستم ابو عاملە.

*** ئەوە بەس "ع".**

- ئاخر دەبی مناسەبەبی، دەبی مناسەبەبی.

*** یەعنی ناوی نایەنی گۆتم نەوەکو مەبەستتە، تەعن بی یا؟**

- نا، نا ئەبەدەن ئەمن تەبعەن بۆ کاك عەزیزی هەر گۆتیتم هاوڕێ عەزیز، بۆ عومەر ئەبو شــێخ هەر دەڵێم ئەبو فاروق کە ئێســـتاش هاوڕێ عومەر یەك لە برادەرەکانی هەرە نێزیکمە یەعنی وەکو دوو هاوڕێی کۆن بە کاکی خۆم بڵێم بەڵام نازانم.

*** باشە هەر لەو مزەکەراتانە باسی ئەوە دەکەی ئێوە وەکو حیزبی شیوعی یارمەتی حیزبە کوردستانییەکانتان دەدا لە رووی مادییەوە ئایا ئێوە یارمەتیتان دەدان؟ بە راستی...**

- ئەرێ وەڵڵا، لە دەستی منیان وەرگرتووە.

*** یەعنی وەکو یەکێتی و پارتیش؟**

- نەء، بەتایبەتی سۆشیالیست.

*** ئێوە دیارە ئیمکانیەتی مادیتان دیارە باش بووە؟**

- وەڵڵاهی ئیمکانیاتی مادیمان باشـــتر بوو لەوان کەمۆکەك مەبەستم ١٩٧٩و ١٩٨٠، ١٩٨١تا ١٩٨٢یش لەوان باشتربووین، بەڵام پاشی پشت ئاشان کارەسات لە ئێمە روویدا.

*** باشــە کە حســـك پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی باش نەبو کەچی لەگەڵ وان پێکەوە چوونە ناو جود قەد هۆی ئەمە چی بوو، تەئسیراتی شەخصی لەسەر بوو؟**

- نەخێر، تەئســـیراتی مســـاعەداتی ســـوری و لیبی بوو، هیچ تەئسیراتی تر نەبوو، هەمووی تەئسیراتی سوری بە دەرەجەی رەئیسی و دۆلاراتی لیبی بوو.

*** باشە ئێوە چوونە ناو جوقەد هەر لە ناو جوقەد ١٥ رۆژی پێچوو کشانەوە، چوونە ناو جود، ئایا ئەوە سیاسەت بوو خەتێکی ستراتیجی هەیە لەوە؟**

- وەکو پێم گوتی ئێمە نەکشاینەوە لەناو جوقەد.

*** بەڵام جوقەد تێکچوو، جوقەد نەما؟**

- نەخێر ئەتو پێت بڵێم ئێمە کە چووینە ناو جود من ئاماژەم پێکرد کە ئیمزامان کرد من و ئەحمەد بانی خێلانی هاتینەوە چووینە لای نەوشیروان مستەفا هەموو شتمان پێ وت.

*** ئا بەڵام دەبوایە پێشتر پێی بڵێن؟**

- دەیانزانی و هەموو شتیشیان دەزانی کە ئێمە محاوەلە دەکەین جسر دروست کەین.

*** لەگەڵیان خۆ دروستیان نەکرد ئاخری، جود نەبووە جسر؟**

- گوێ بدێ بەڵام نەوشـــیروان رۆڵێکی سلبی بینی، بەرقیاتی توندی بۆ مام جەلال لێدا، مام جەلالی توڕەکرد و مام جەلال لە ســـوریا پەیوەندی لەگەڵ حیزبی شـــیوعی راگرت.

*** ئێ بەڵام ئێوە کە چوونە ناو جود بۆ ئەوەی جود ببێتە جســـرێك بۆ ئەوەی ئەو دوو حیزبە بەیەکەوە ببەستنەوە، خۆتان بوونە تەرەفێك لە جەبهەو شەڕەکە؟**

- فەرزکرا لەسەرمان ئەمە بەو نیازە نەبووین.

*** کەواتە ئەگەر لە جودیش بکشابانەوە باشتر نەبوو؟**

- ئەمـــە گوێ بگـــرە پێت بڵێم نەخێر ئەمە رۆژێك لە رۆژان ئەوەی چوو بەنســـبەت منەوە پانزە ســـاڵە من ممارەسەی ژیانی خەلیەی حزبی ناکەم، بەڵام بۆ تەئریخ دەڵێم بۆ تەئریخ و دەڵێم ئومێدەوارم هەموو خاوەن ویجدانێکی سیاسی ئێمە لەو رۆژەی کە هاتینە شاخ دەتوانم بڵێم لەسەرەتای ١٩٧٩ تا ئەو رۆژەی پاش منیش کە جەبهەی کوردستانی ئیمزاکرا ئێمە نە دژایەتی یەکێتی نە دژایەتی سۆشیالیست.

*** بەس ئەمە لەرووی عەمەلییەوە خزمەتی لایەکی دەکرد دژی لایەکی بوو؟**

- نە دژایەتی پارتیمان کردییە بەڵام برادەرەك خۆی بڵێین تەسەروفی شازی کردبێ ئەوە شتەکی دییە من مەبدەئی قەراراتی حیزبی دەڵێم قەراراتی حیزبی ئەبەدەن هەمووی...

*** بەس ئەو قەراراتانە غەڵەت نەبوون، چوونە ناو جوقەد پارتی پێی ناخۆشبوو، هاتنەناو جود ئەو جارە یەکێتی پێی ناخۆش بوو؟**

- ئەبەدەن بلعەکس ئەمە لەبەر خاتری پارتی نەچووینە هەرچی وا تەســـەوەر بکا زۆر یاغنیشە.

*** بەڵام گوشاری پارتییتان لەسەر نەبوو لە جود؟**

- ئەبــەدەن بەپێچەوانەوە پارتــی وەزعەکی زەعیفی هەبوو، پارتــی ئیمکانیاتی زۆر مەحدود بوو، پارتی بە هەموو شتەك رازی بوو، ئەوە بنووسە مەترسە، بە هەموو شتەکی رازی بــوو، پارتی ئەو ئیمکاناتی کە هەیبوو ئیمکانیاتەکی مەحدودیان هەبوو، وەزعەکی ناسکیان هەبوو، تواناییان زۆرکەم بوو، ئێمە بە زۆر بە دڵسۆزی دەمانەویست سەرکردایەتی و برادەرانی پارتی لە کاك مەسعود و کاك....

*** بەڵام چۆن زەعیف بوو خۆ مەنتیقەکیان کۆنترۆڵ کردبوو ناوچەی بادینانیان لەژێر دەسەڵاتدا بوو؟**

- ئەو مەنتیقە مەنتیقەیەکی لە ئەساسیشــدا هەتا حدودی رەواندوز مەوزوعەکی دیە، بســت بە بست، ئەوە ناکرێ بەڵام قواتی ئەساســی و ئەو شتانە ئیلا خۆ هەر ئەوە نییە حیزبەك چەند پێشــمەرگەی هەبێ، وەزعیان، حاڵەتیــان، حاڵەتی جەماهیریان وەزعەکی دی بوو.

*** باشــە راستە کە وشــەی جود، جود یەعنی جبهە وەتەنییەت دیموکراتیەت، بەرەی نیشتمانی دیموکراتی لەلایەن عەلی عەبدوڵلاوە پێشنیارکراو پەسندکرا؟**

- ئەشەدەمبیلا ئەوە راسترین شتە ئێمە لێ بووینەوە.

*** لەچی؟**

- لە کۆبوونەوەکە لەبن خێمە دانیشــتین هەموو شــت تەوقیعکــرا کاك عەلی گوتی دەبــێ ناوەکی بۆ بدۆزینەوە گوێت لێ بــێ، کاك عەلی ئەمە کە چووین من و ئەحمەد بانی خێلانی بۆ تەئریخ دەڵێم خۆ ئەوی غەڵەت بکا بڵێ کفر نییەو ئعدامی لەســەر نییە وەنییە ئێمە کە چووین عەلائەســاس ناوی لێنێیــن رێکەوتنا،مە رێکەوتنامەیەکی برایانە لــە بەینی ئەو ســێ، هیچ ناوی تر نەبوو، کاك عەلی گوتــی چۆن دەبێ رێکەوتنامە ناوی نەبێ، خۆ کاك عەلی ئێســتاش وەکو مام وەکــو برا گەورەی منە، ئەوپەڕی رێزم بۆی هەیە،گوتی دەبێ ناوێکی بۆ بدۆزینەوە یەکســەر تومەز بیری لێ کردبووەوە بەرەی نیشتمانی دیموکراتی، سۆشیالیســت ئیمزای کرد، پارتی ئیمزای کرد، وەڵلاهی دەتوانم بڵێم من و هاوڕێ مەلا ئەحمەدیش ئەو شتەمان ئیمزا کرد.

*** ناچاربوون؟**

- تێپەڕی بەڵام لە پێشان موتڵەقەن.

*** باشە بۆ تێبینییەکتان نەدا بەرەی نیشتمانی کوردستانی بۆ ناوی لێبنێن بەرەی نیشتمانی دیموکراتی ئێوە لە شاخ بوون دیموکراتییەتی چی، یان بەرەی کوردستانی دیموکراتی؟**

- نـــا نا عەلاکولین وەکو پێم گوتی ئەوەتا ئەوەی بـــرای بەڕێزم ئەوەی ئەمن پێم گۆتی ئەوهایە ئەوە هەقیقەتە کاك عەلی ئیقتراحی کرد و پەسندکرا.

*** ئێوە هیچ ئەوەتان نەکرد؟**

- معارەزەمان نەکرد، تێدەگەی بەعزە غەڵەت هەیە لە سیاســـەت پاشی بیست ساڵ وەکو کۆنە نەخۆشی بە بیری دێتەوە.

*** باشـــە کاك فاتح دەعمی سۆڤیەت، هاوکاری سۆڤیەت بۆ حیزبی شیوعی عێراق چۆن بوو؟**

- وەڵـــلا حەقیقەت ئەو دەعمـــە تەنها ئەگەر ئەندامەك یەعنـــی کاك عەزیز محەمەد و لەوانەیـــە بەس زانییەتی ئەوانی دی ئەمـــە هیچمان نەدەزانی ڕۆژەك لە ڕۆژان لە لوجنەی مەرکەزی باس نەکرایە بۆ تەشریح دەڵێم ئەبەدەن نە باسی پارەکرایە...

*** ئەی کە یارمەتیتان بۆ دەهات نەتان دەگوت ئەو پارە لە کوێوەهات؟**

- نەماندەزانـــی، ئەبـــەدەن هەرچی برێ درۆ دەکا، برێ زانیتـــم درۆ دەکات بەس عەزیز محەمەدو یەك دووکەس نەبێ.

*** ئەی دوو کەسەکەی تر کێ بوون؟**

- نازانم پێویست ناکات ناوەکانیان بڵێم.

*** باشە ئێوە بۆ قسەتان نەدەکرد بڵێن ئەو یارمەتییە لە کوێ دێ چەند بوو؟**

- کاکە ئێمە لە محنەت دابووین لە شـــتەك دابووین تێدەگەی دوای ئەوەی تۆ وا تەسەوڕ مەکە حەیات وەکو پێم گۆتی حەیاتی سیاسی و حەیاتی حیزبی...

*** ئا دەشکرا خۆ یەکجار ئەوها نەبوو؟**

- ناکرێ لە تەنزیماتی سڕی ناکرێ برام.

*** ئێوە لە شاخ بوون خۆ لە ناوشار نەبوون؟**

- ئێ لە شاخ بووین بەڵام حیزبی شیوعی خۆ حیزبی شەڕ نەبوو، حیزبی شیوعی حیزبی سڕی بوو نەدەکرا، بە دوویکەوی.

*** ئا مەبەستم لە هەشتاکانە؟**

- نەدەکـــرا بە دوویکەوی چـــۆن دەتوانی بە دوویکەوی ئەرێ پارە لە کێ دێ ئەرێ ئەوە لە کێ دێ.

*** ئێ لە دەعمی ئەورووپی دەهات، لە دەعمی ئەورووپای شەرقی دەهات؟**

- ئێ ناکرێ، ناکرێ یەك کەس باسی ناکا، ئەمن پێت بڵێم ئەو پازدە شازدە، ئەو ماوەی کە لە لوجنەی مەرکەزی بووین موتڵەقەن رۆژەك لە رۆژان تائێستا کە من ئەوا لە ژیان ماوم نەمبیستییە باس نەکرایە ئەو پارە لە کێ دێ.

*** خۆ کەسی تریش نەیدەپرسی؟**

- کەســـیش نەیدەپرسی، دەیانگۆت هەندەك دەیانگۆ فەڵەستین یارمەتیمان دەدا هەندەك دەیانگۆ ســـوری یارمەتیمان دەدا هەندەك دەیانگۆ فەخری کەریم پارەی زۆر وەردەگرێ ئەو شتانەیان دەگۆ.

*** بەڵام چەندی وەرگرتووە؟**

- بەڵام چەندی وەرگرتووەو کو ســـەرف دەکرێ، دوای لەو ئەخیرەی رۆژ بەرۆژ هەتا ئێســـتاش ئەسرار ئاشکرا نەبووە خەمت نەبێ هەتا ئێســـتاش تاریخ جورئەتی نییە، ئەوە لازم بوو کاك عەزیز محەمەد ئەو شتانە روون کاتەوە جورئەت نییە هەتا ئێستا. ئەمن بە سەراحەت دەڵێم دوای ئەوەی هەر کەسەك دانیشی پاشی ئەو هەموو شتەی خۆی بکاتە فس فس پاڵەوان ئەوە سیاسەت نییە.

*** باشە پێتوایە ئێستا حیزبی شیوعی ئیمکانییەتی ماددی خراپە؟**

- بە تەسەورم ئیمکانیاتی ماددی زۆر خراپە، چونکە نە ئومەمیەت ماوە نە سۆڤیەت ماوە.

*** ئـــێ برام ئەدی ئەو هەموو دەعمەی جاران هەیبـــوو نەیتوانی بیکاتە پێگەیەك بۆ خۆی؟**

- ئەوە بەوانە بڵێ کەوا قوەتی قەراری پارەکەیان بەدەست بوو لۆیە.

*** یەعنی ئێوە لە شاخ قیادەی موستەفید نەبوون لەو دەعمانە؟**

- ئەمە، وەڵڵاهی وەکو پێشـــمەرگە وەختەك"٥" دینارمان وەردەگرت دوای بوو بە "١٠" دینار.

*** یەعنی لەو هاوکارییانە هیچ نەدەدرا ئەولا ئەولا؟**

- ئەبـــەدەن هەر کەســـەك بڵـــێ ئەمن وەکو یەکەك کە لە شـــاخ بوویـــن وەکو یەکەك کادرەکی.

*** سکرتێری ئقلیم بوویی؟**

- سکرتێری ئقلیم بووبم، وەڵڵاهی کاکە گیان لە غەیری ئەوەی کەوا مخەسەساتەکەمان

وەردەگرت هیچی دیمان نەدەدرایێ، ئەگەر مەواریدەکیش بهاتایە لەولا لەولا ئشتراکاتەك، تەبەروعاتــەك دەمانکردە قائیمەو ئیجتماعی ئیقلیمان دەکرد، ئەمما مەســائیلی پارەی پێشمەرگەو سیلاحی پێشمەرگەو شتی وا باس نەدەکرا، چونکە خاسەتەن تۆ لە حەرەکاتی سڕی و لە حیزبی سڕی چونکە سیقە کۆنترۆڵی لەسەر بوو جولانەوە کۆنترۆڵی لەسەرە تۆ بە دووی هەموو شتەکی بکەوی گومانت دەکەوێتە سەرێ، پارە لەکێ دێ، سیلاح لە کێ دێ، کێ دەیهێنێ، کو دەڕوا، کو ســەرف دەکرێ، لۆ فلانکەس لە سوریا وا دەژی، لۆ مارسیدیسی هەیە، لۆ ئەوەی نییە کاکە نەتدەتوانی.

*** کەواتە ئەو گرفتانەی دروستبووینەو هەندێ کێشە هەبووە لەناو حیزبی شیوعی کە جەنابت ســکرتێری ئقلیمی کوردستان بووی یەعنی بەرپرسی یەکەم بووی لە کوردستان، یەعنــی زەریبەی گەورەترین زەریبە ئەتو دەیــدەی کە لەو گرفتانەی کە هەبووە چونکە لەوکاتەی تۆش هەڵوێستت نەبووە لەبەر ئەوەی ئەوەك دەرت بکەن یا لات بدەن یا تەجمیدت بکەن؟**

- وەڵڵاهی تەبعەن وەکو پێم گۆتی ئەو تەفکیرەی ئێستا دەیکەمەوە ئەو تەفکیرەم نەبوو، ئەو تەفکیرە بەشێك بوو لە بلۆکەك کە ئەو بلۆکە پێی دەگۆ رێگای قیادی و ئەو هەیئە قیادییە حیزبەك قیادەی حەرەکەیەکی چەکداری تەنزیمەکی ســڕی دەکرد، و منیش وەکو پێم گۆتی و خۆش بەختانە لە هەموو نووســینەکان لە هەندێ شــت، شتی ناو بەناو لە کۆبوونەوەکان بازە رەئی شت دەدرا بەڵام شتی ئەساسیی نا.

*** باشــە ئێستا مەســەلەن لەو وەزعەی کە ئەتو مەوقیفت بەو شکلە بووە ئنجا بابڵێین لەگەڵ جەبهەی لەگەڵ بەعس مەوقفت بە هەمان شێوە هەبووە ئێستا هەست ناکەی ئەتو فعلەن لە خەباتەکەی شۆڕشگێڕانەوە بەڵام کۆمەڵێك سلبیاتیش لە ئەستۆیە؟**

- ئەمن وەکو پێم گۆتی.

*** یەعنی بە قەد ئەوەی تێکۆشــانەکی سەربەرزانەت کردیە بەڵام غەڵەتی گەورەشت کردیە لە ئەنجامی ئەو تێکۆشانە؟**

- مــن زۆر بە دڵســۆزی ئەندامەك بوومــە لە ریزی حیزبی شــیوعی و بە هەموو تواناوە خۆشبەختانە دەڵێم بەپێی توانای خۆم خۆڕاگربوویمەو هەڵوێستی لاوازیم نەنواندییە بەرامبەر یان شتەك لەو بابەتانە من بەبۆچوونی من، لە زۆربەی خەتی رەئیسی.

*** ئەتو لەگەڵ رادیکاڵەکە نەبووی لەگەڵ خەتی رادیکاڵ تور هەمیشە لەگەڵ خەتی قیادەکەدا بووی؟**

- کاکــە خەتی رادیکاڵەکە، خەتەکە فەوزا بــوو، تێکدەربوون، ئەوان، ئەوا عەزیز الحاج ئەوانە بەناو شۆڕشگێڕبوون بەڵام درۆیان دەکرد تێکدەربوون.

*** لە هەشتاکان؟**

- ئەوانــەش ئەوانی هەشــتاکانیش ئەوانەبوون کە لە موئتەمەری چوار ئێمە بیســت کەسیان بەلاوەنا، دەکەسیان هێنا لوجنەی مەرکەزی پشتی کاك عەزیزیان گرت چیان کرد لە عیلاقاتی عەرەبی، لە عیلاقاتی کوردســتانی، لە عیلاقاتی عێراقی. ئەوەیە مەسەلە ئەمن قەتعیەن نەمگۆتییــە، ئەمنیش یەکەك بوویمە لە ریزی ئەو حیزبە بەڵام مەعنای ئــەوە نییە ئالەتەکی میکانیك بوویم. رەئیم هەبووە، رەئی تایبەتیم هەبووە، شــتم هەبووە بەڵام ئایا ئەمن وەکو بەعزە کەس شۆڕشگێڕییەتی بفرۆشم وام نەکردییە، ئەمن مزایەداتم نەکردییە، نەکو نــەدرۆم لەگەڵ خۆم کردییە، نە درۆم لەگەڵ ئایدۆلۆژییەتم کردییە، نە درۆم لەگەڵ حیزب و جەماوەریش کردییە.

*** باشە کاك فاتح بەڕاستی پەیوەندی حزبی شیوعی لەگەڵ یەکێتییدا لەسەر فڕاندن و کوشتنی عەولا ماویلی بوو یان ئەسبابی دیکە هەبوو؟**

- نەء لەسەر ئەوە نەبوو عەولا ماویلی تەبعەن.

*** پیاوی رژێم بوو؟**

- پێــت بڵێم تەبعەن یەکێتی وەکو بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی ســێ گروپە، خەتی پان، کۆمەڵە، بزووتنەوەی سۆسیالیســتی، تێدەگەی لەناو ئەو خەتانەش تائێستاش کێشە هەیە و زۆر کەس بەتایبەتی ئەوانەی کە لیبراڵ و بە ناوی شۆڕشــگێڕی و بەناوی مارکسی یەعنــی خەتی کۆمەڵە ئەوانە زۆر زۆر توندڕەوبوون ناو بەناو لە کۆبوونەوەکان بازە رەئی شت دەدرا بەڵام شتی ئەساسیی نا.

*** لە هەشتاکان؟**

توندڕەوبوون بە عەکسی هەندێك لە قیادەکانیان هێمن و لەسەرخۆبوون و حەتا ئەمن یەك لەوانە جارەکیان ئەندامەکی سەرکردایەتی یەکێتی بە منی گۆ گوتی ئێوە ئەوەندە هەوڵ دەدەن یەعنی دۆســتایەتی ئێمەو پارتی چارەســەر بکەن دابەزی رەئی چەوتی نیشاندا گوتی ئێوە زەرەر دەکەن.

*** یەعنی بابڵێین عولا ماویلی نەبووە ئەوەی کە شقاتەکە داگیرسێنێ لە بەینی ئێوەو یەکێتی؟.**

- دوایی چارەســـەرکرا، مشکیلەکە لە وەرتێ چشتەك روویدا دوای ئێمە گەڕاینەوە مام جەلال گەڕاوە ئەو مشکیلە نەما چارەسەرکرا..

*** یەعنی ئەو سەبەب نەبوو؟**

- ئەبەدەن..

*** نەوشیروان دەڵێ ئەو دەوری هەبوو شەڕەکە لەوێ دەستییێکرد؟**

- نەخێر، نا، نا.

*** باشە ئەو کابرایە عەولاماویلی پیاوی رژێم بووە پیاوێکی خراپ بووە دەڵێن موجرمیش بووە پێشمەرگەی کوشتووە؟**

- بەڵێ.

*** باشە ئێوە بۆ داڵدەتاندا؟**

- خۆی لەوکاتەی تەبعەن عولاماویلی کە لە سەرەتای ژیانی کۆنە شیوعی بوو، گوێ بدێ بۆیە واهات چەند کەسێکی لەگەڵ خۆی هێناو ئیلتحاقی کرد، تەبعەن حیزبەکانی کوردســـتانی هەمـــوو پێیان ناخۆش بوو کە لە ســـەرەتای هاتنەدەرمان جاش ئیلتحاق بە حیزبی شیوعی بکا، بە تەنزیماتی ئێمە بکا، تەبعەن ئەساسەکەی ئەوەبوو.

*** ئەو بەس جاش بوو یان پێشمەرگەی کوشتبوو؟**

- وەڵڵا ئەوەی ئەمن دوایێ بیســـتم کەمێك خەڵكی کوشبوو، هەموو جاشێك زۆرجاش خەڵكیان نەکوشتبوو، لۆ ئێستا...

*** ئەوەی پێشمەرگەی کوشتبێ نابێ وەربگیرێ؟**

- بۆ ئێســـتا لەناو هەولێرو لە ســـلێمانی دەیەها کەس نییە ئێستا ئیشیشیان بە دەستە، بەڵام بینووسییەوە ها ئیشیشیان بەدەستە پێشمەرگەشیان کوشتییە، ماڵی پێشمەرگەشیان وێران کردیە، ئێستاکە....

*** باشـــە بۆ چاو لەشـــتی خراپە دەکەی، بۆ چـــاو لەوە ناکەی کە ئێـــوە حیزبێکی شۆڕشگێڕن دەبێ شۆڕشگێڕیتی خۆتان بەردەوام بکەن؟**

- راست دەکەی، راست دەکەی.

*** مەســـەلەن وەك ئەوەی دەڵێی کاتی خـــۆی بەعس وایدەکرد، بۆ خۆت بەراوردبکەی لەگەڵ بەعس؟ مقارەنەی لەگەڵ شتی باش بکە؟**

- ئەتو راست دەکەی لەو ناحیەیە، لەو ناحیەیە قسەکەی تۆیە، بەڵام من مقارەنەکەی تۆ لەگەڵ شتی باش دەکەم، هات عەلائەساس پەشیمان بوویتەوە دوای ئێمە نەماندەزانی کە ئەوە خەڵکی کوشتییە یان خەڵکی نەکوشتییە...

*** یەعنی حیزبی شیوعی هەرچی دەهاتە لای وەریدەگرت؟**

- کـــەس نەهاتیتە ناومان، خەڵکەکی زۆرکەم هاتینە ناومان بلعکس ئەوەی کەوا رووی تێدەکرد بە دەرەجەی ئەساسی یەك یەکێتی، دوو سۆشیالیست.

*** باشـــە ئەتو بەخـــۆت لە موزەکەراتەکەت دەڵێی ئەوانەی لە شـــەڕی ناوخۆ کوژران شەهید نینە بەخۆشت بەرپرسی مەیدانیی ئەو شەڕە بووی کەواتە ئێستا خۆت بە تاوانبار نازانی ئەو خەڵکەت بە کوشتن داوە؟**

- نەخێر مساعەدە بکە ئەوە لە بەرگی سێ پێشمەرگەکی یەکێتی....

*** دەبوایە ئەوکاتە بتگوتایایە ئێوە شەهید نین کە دەکوژرێن؟**

- دەڕاوەستە پێشـــمەرگەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ناوی.. کاغەزەکی بۆ ناردم ئەڵێ کاك فاتح ئەگەر پێشمەرگەی ئێوە لە شەڕەکان شەهید ببن چیان ناو لێ دەنێی لە وەڵامدا گوتم ناویان لێدەنێم شـــەهید، ئەدی هی ئێمە ئەڵێم تۆ راست دەکەی من غەڵەت بووم من لە هەشتاوە دانم بەو غەڵەتە داهێنایە کە هەموو پێشمەرگەکانی کوردستان پارتی، یەکێتی، سۆشیالیست، شیوعی لە شەڕی ناوخۆ کوژران، هەموویان شەهیدن.

*** کەواتە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە داوای لێبوردن لە کەسوکاری ئەو خەڵکە بکەی کە کوڕیان شەهید بوو برایان شەهید بوو؟**

- من لە هەشـــتاوە داوای لێبوردنم کردیە، ئەتو پێم مەڵێ ئەمن بڵاوم کردیتەوە، ئەمن لە هەشتاوە داوام لێکردینە ٢٦ساڵ پێش ئێستا.

*** ئا بەڵام دوای ١٩٨٠ شەڕ گەرم بوو؟**

- دوای هەشـــتا مەوزوعەکی دیە، ئەمن هەمووم بە شەهید داناوە، دوای ئەوەی ئەمن ٢٠٠ پەڕەم لە بەرگی سێ لەسەر کارەساتی پشت ئاشان نووسی، ناوی هەموو شەهیدەکان، هی حیزبی شـــیوعی، هی یەکێتی، هی پارتی، هی سۆشیالیست، نازانم جەنابت دیوتەو ناوی هەموو شەهیدەکانیشم بڵاوکردیتەوە بە هەمووشیان دەڵێم شەهید.

*** باشــە باسی پشت ئاشــانت کرد، گرتنی هاوڕێ کەریم و با بڵێین ئەو وەزعەی بە ســەری هات هەستت بە هەڵوێستی لاوازی ئەوکرد یان هەڵوێستەکەی لاواز نەبوو حیزب خۆی سەرکۆنەی کرد؟**

- نەخێر تەبعەن هاوڕێ کەریم محاسەبە کرا کە هاتە سێلوێ.

*** لە حیزب محاسەبەکرا لە جێی خۆی بوو یان غەدر بوو؟**

- نــا، نا، زۆر لە جێی خۆیدا بوو، نەخێر لازم بوو هاوڕێ کەریم بڵێ مام جەلال ڕێگام بدە من دەچمەوە لەگەڵ برادەرانم دائەنیشم گفتوگۆ دەکەم ڕێك دەکەوم دەگەڕێمەوە ئینجا ئیتفاق دەکەین ئەوە ڕاست بوو.

*** باشە تۆ پێتوایە هاوڕێ کەریم لە ترسان بوو؟**

- ئەوە ناتوانم ئەوە بڵێم، ناتوانم ئیحتماله ئیستعجالی کردبێ، پەلەی کردبێ.

*** بەخــۆت بە ئەعتباری ئەویش کۆییەو جەنابت کۆیــی و زیاتر یەکتری دەخوێننەوە، پێتوایە هاوڕێ کەریم کەسێك بێ لە مەوقفی تێکۆشانیدا ترسێك بیگرێ؟**

- وەڵڵا ئەوە مەسائیلی وا ....

*** ئەوە دەبێ ئینتباعی خۆت بێ؟**

- نــا نا پێت بڵێم ئینتباعی من ئینتباعی شەخســی،ە ئەوە مــن ناتوانم لەو ڕەئییە، من تەبعەن کاك کەریم لە ١٩٤٦وە مامۆســتام بووە و لەگەڵ سەدان هەزار تێکۆشەرانی شــیوعی و کوردو عێراقی ژیاوە، تەقدیرات بۆ وان، هەر کەســەك کە بیەوێ باش خۆی بناســێ دەبێ باش خۆی بخاتە بەر مینایەکــی، ئاوێنەیەکی زۆر گەورە کە ئاوێنە ڕای گشتی ڕای جەماهیری، ڕای سیاسییە.

*** پەیوەندی دۆستایەتیت دوور لە سیاسەت لەگەڵ هاوڕێ کەریم چۆنە؟**

- وەڵڵا پەیوەندی و سیاسی من، لەگەڵ هەموو هاوڕێکان غەیر سیاسی....

*** هاوڕێ کەریم؟**

- لەگەڵ هاوڕێ کەریم مامۆستام بووە ڕێزی دەگرم و ئەوبەڕی ڕێزی دەگرم من هیچ کێشەکم لەگەڵی نییە، کێشەکی شەخسیم لەگەڵ هیچ کەسەك نییە، بەڵام ڕەئی جیاوازم هەبێ یا بۆچوونی تایبەتیم هەبێ شتەکی دیە.

*** باشە دوای ئەوەی راپەڕین کرا حیزبی شیوعی هاتە ناو جەماوەر، خەباتی ئاشکرای دەستـــپێکرد داوایان لە جەنابت نەکرد کە بێیەوە پێویســـتیمان بە تۆیە بێی خەبات بکەی لێرە؟**

- تەبعەن من هەتا ٩٥ ممارەســـاتی ژیانی حزبیم دەکرد، بەڵام من ئیستقالەم ندا من خۆم تەجمید کرد، کۆمەڵەك شت روویدا بە دڵم نەبوو کەموکورتی....

*** یەعنی داوایان لێکردی یان نەیان کرد؟**

- چۆن.

*** لە دوای راپەڕین داوایان لێکردبی بێیەوە؟**

- داوا، نـــەء، من داوام لێ نەکـــرا، چونکە ئەوەڵەن من دوو ئەرکم هەبوو ئەرکەکم ئەوە بوو من کەوتبوومە ناونووسین، ئەرکی دووەشم وەزعی تەندروستی بوو ئەمن چاوم خراپ بوو عەمەلیاتم کردو و شـــتی وا، بەڵام رەئی تایبەتم هەبـــوو، بۆچوونم هەبوو دەربارەی هەڵبژاردن، دەربارەی ئەو پەرۆ سۆرو زەردو شین و کەسك بە منداڵ بازاڕیم دەزانی، ئەو قائیمەی کە حیزبی شیوعی دەریهێنا ١٣٢ کەس ئەسڵەن بێژم بۆوە بۆ پەرلەمان، هی وای تێدابوو لە حەیاتی ناوی خۆشـــی نەدیتییە، لە ماڵی خۆی ژنەکەشـــی بانگی نەکردیە، تەرشیحی کەم بۆ پەرلەمان فشەم پێهات .

*** هەتا ئێستاش؟**

- هەتا ئێستاش تەبعەن، رەئیم دەربڕی ناڕەزابووم و من زدی ئەوەبووم، رەئیشم دەربڕی، هاوارم کرد.

*** چۆن یەعنی زدی بووی؟**

- من رەئیم ئەوەبوو حیزبی شـــیوعی لە هەڵبژاردنی یەکەمی ساڵی ١٩٩٢ بەرنامەکی تایبەتـــی هەبێ، تکایە ئەوە بە ئیهتـــام بڵاوبکەوە، بەرنامەکـــی تایبەتی هەبێ بیداتە ســـەرکردایەتی پارتی کاك مەســـعود بارزانی و مەکتەبی سیاســـی پارتی، بیداتە مام جەلالی و مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی، بڵێ ئەوە بەرنامە "١٠" نوقتەیە، یەکێتی نیشـــتمانی گوتی ئەمن لەو"١٠" نوقتە"٦" نوقتە لەگەڵـــم، "٥" نائیبت دەدەمێ، پارتی گوتی"٨" نوقتەت لەگەڵم "٧" نائیبت دەدەمێ ...

*** یەعنی بەرەئی تۆ لەگەڵ یەکەکیان بوایە؟**

- لەگەڵ یەکەکیان بابە لەسەر ئەساسی مەسلەحەتی حیزبی شیوعی کوردستان.

*** ئەوان پێیان وابوو ١٠٪ زیاتر دەهێنن؟**

- ئەوان پێیان وابوو ١٤٪ی دەهێنن.

*** تۆ پێت وابوو ئەوکاتە حیزب ئەوەندە نایەنێ؟**

- ئەبـــەدەن، مـــن لەبەر ئەوەی منداڵەکی کورد بووم، گەنجەکی کوردم لە کوردســـتان قەناعەتم وابوو ٥٪یش نایەنێ چونکە شـــارەزایی ســـایکۆلۆجیەتی کوردم، ئێستاش لەو وەزعەی...

*** ئەو رەئییەی خۆت ئەوکاتی دا حیزب؟**

- شـــەڕم کرد، چەندەها کەسی وەکو یوســـف حەنەو ئەبو تارا ماون، شایەدن ئەگەر لە بیریان بێ، ویژدانیان هەبێ، کورە ئەمن گوتم، گوتم جەلال تاڵەبانی "٧" نائیبتان دەداتێ "٨" نوقتەتان ئیتفاق دەکەم، ئەچم سیاســـەت یەعنی مەســـلەحەت کاك مەسعود گوتی نەء ئەمن "٨" نائیبت دەدەمێ لەگەڵ "٨" نوقتەت لۆ جێبەجێ دەکەم لەگەڵ کاك مەسعود رێك دەکەوم. "٨" نائیبی خۆم دەدەمە پەرلەمان و دیفاع لە قەزییەی کوردی دەکەم.

*** باشـــە کە دێیەسەر شەڕی ناوخۆ باس دەکەی دەڵێی هەموو حیزبەکان دژی شەڕی ناوخۆبوون کە لەگەڵیان دادەنیشی باشە ئەدی ئەو شەڕە کێ دەیکرد یەعنی ئەگەر هەموو حیزبی شیوعی دژ بوو پارتی دژ بوو یەکێتی و سۆشیالیست دژبوون ئەی ئەو ئاگرە بۆ نەدەکوژاوە؟**

- ئەو ئاگرە بۆ نەدەکوژاوە، تەبعەن ئەساســـی ســـایکۆلۆجییەکەی ئەوەبوو عەقڵییەتی حیزبایەتی تەســـك بوو ناوچەگەرایەتی، گێت لە برات بێ، ناوچەگەرییەتی، پاوانکردن ئەو ســـنوورەی ئـــەو مەنتیقەی هی منە، ئەوە هی تووە، هـــی منە، خەڵکی بەرەڵلاش کرابوو برۆ خۆت بژێنەو پارە کۆکەوەو ئەتوش لە شـــاخ بووی ئەو وەختە لە نەتیجە خۆت دەزانی کاری تێکدەری زۆر ئاسانە بە دوو کەسان دەکرێ بە دووکەس بەیەك کەس کاری تێکدەری دەکرێ.

*** یەعنی غەڵەتەکە لە سەرکردایەتی بوو لە راستیدا یان لە خوارەوە لە کۆنترۆڵەکە؟**

- غەڵەتەکە لە هەردوولا بوو، ستراتیجییەتی.....

*** کەواتە حیزبەکان دژی شەڕی ناوخۆ نەبوون؟**

- ستراتیجییەتی حیزبەکان لە ئەساسدا، مزایەدات و کڕین و فرۆشتنی تێدابوو، تێدەگەی هەڵوێســـتی تێدابوو و ئەگەر نووســـینەکانی من بە ئینســـاف بخوێنییەوە نووسینەکانی من بەتایبەتی ئەو ســـێ بەرگە بخوێنییەوە زۆرباش دەزانی کە زۆر شـــت هەیە لەکاتی

سەرکردایەتی ڕێکدەکەوت بەڵام کە دەکەوتە تەنفیز تێکدەدرا.

*** مەبەستم ئەوەیە یەعنی قیادەی حیزبەکان کەواتە لەگەڵ دژی شەڕی ناوخۆ نەبوون لەبەر ئەوەی؟**

- نا نا پاوانکردن هەبوو، مەسەلەن، پاوان کردن چۆن نەبوو، پاوانکردن هەبوو.

*** دەتوانی ئێستا بڵێی شەڕی ناوخۆ بە دەرەجەی ئەساسی خەتای فڵانە لایەن بوو؟**

- بە تەسەوری من شەڕ بە لایەك ناکرێ، غەڵەت و چەوتی لە هەموو لایەکان.....

*** بەڵام هەیە زیاتر هۆکاری هەڵگیرسانەکەیە؟**

- تۆ رام مەکێشـــە بۆ ئەوەی بڵێی زەیدو فڵان، من پێت دەڵێم غەڵەت بۆ هەموو لایەك بوو و دوژمن دەوزی هەبوو، مخابەراتی عێراقی و ســـەدام و هەموو دەوریان هەبوو، بەڵام ئەو دەورە تێدەگەی هەتا ئێســـتاش ئەو هەموو دیکۆمێنتانەش ئاشکرابووە بەڵام حەقائق لە میللەت بزرە.

*** باشە کاك فاتح تۆ لە بەرگی سێی مزەکەراتەکانت یاداشتەکانت باسی خۆپیشاندانەکانی کوردستان دەکەی ساڵی ١٩٨٢، خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٨٢ لە هەموو شوێنێك خۆپیشاندان کرا زۆر زۆر بە لاوازی باسی هەولێر دەکەی بۆ؟**

- وەڵڵاهی ئەو تەقریرەی کە لە هەولێر گەیشتە دەستم تەبعەن ئەمن ئیعتیمادم دەکردەسەر راپۆرتەکە، ئیعتیمادم دەکردەســـەر ئەو راپۆرتەی ئەو برادەرە قوتابییە کە ناوی سەلاح بوو ســـەلاح جەوهەر تێدەگەی ئەو راپۆرتەی گەیشتە دەستم راپۆرتەکی داوە ئەمن ئیعتیمادم دەکردەسەر راپۆرتەکەی چونکە من تەقریرم....

*** بەڵام دەزانرا کە خۆپیشاندان لە هەموو شوێنەکانی هەولێرێ بەردەوام بوو؟**

- تێدەگەم، ئەمن راپۆرتم لە مەنزاماتەوە بۆ دەهات.

*** باشە بۆ ئەوکاتە مەنەزمات لاواز بوو؟**

- تەبعەن لاواز بوو.

*** ئێ حیزبی شیوعی خەباتی نهێنی بەخۆی یەعنی لە...؟**

- بەڵام بە هەزاران ئەندامەمان لێدرابوو خرابوونە زیندان.

*** ئا بەڵام لە ١٩٨٢؟**

- نەخێر تەنزیمات وا بەو تەســـەورە نەبوو تەنزیمات لاوازبوو، هەرچی برێ تەنزیمات بە قوەت بوو ئەوا پاڵەوانییەتی دەکات.

*** باشــه کاك فاتح ئێوه بارەگاتان له نۆکان و زەلێ و ســونێ و ئەو سێ چوار گوندە بوو، یەعنی بۆچی بارەگاتان گواســتەوە پشت ئاشــان گووشارتان لەسەر بوو یان چەند هاوڕێیەك کە سوور بوون لەسەر ئەوەی، سەبەبەکە چی بوو؟**

- ناوەڵڵا تەبعەن من ئەوە بۆ تاریخ دەڵێم ئەوە پەلەکردنەکی منداڵانەی تێدابوو ســوپای پاســدارانی ئێران هات میراوەی گرت ئەلوەتانی گرت، میراوەی گرت هات نێزیك بۆوە لە ســنوور بەبێ ئەوە کە دراسەتەکی قووڵ بکرێ بڕیاردرا کە بنکە بگوازرێتەوە، گوێ بدێ....

*** ئێ بۆ ئەوێندەرێ؟ بۆ پشت ئاشان؟**

- تاکە کەسی کە دژی ئەوەی بوو کە ئێمە بچینە پشت ئاشان من و عەبدوڵڵای مەلا فەرەج بووین کە ئامر بەتالیۆنی هێزی مەقەڕی مەکتەبی سیاســی حیزبی شیوعی بوو کە ناوی مەلا عەلییە، ئێمە....

*** لەبەرچی دژی بووی؟**

- ئەمن لەبەر ئەوەی کە کوردەك بووم شــارەزابووم کە پشت ئاشان و دۆڵی پشت ئاشان وەکو تەپکەکە لە زســتان کۆنتان بگیرێ قەندیل بەفری لێببارێ دوژمن بە ئاســانی تۆ دەتوانــی تەحتیمت کا وەکــو روویدا، مەلا عەلیش عەبدوڵڵای مــەلا فەرەجی بەهۆی خیبرەی عەسکەری من و مەلا عەلی تاکە رێکبووین بەڵام مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری قسەکەی ئێمەیان بە فلسەك وەرنەگرت.

*** تۆ ئەوکاتە سکرتێری تقلیم بووی ئەی چۆن قسەی تۆیان وەرنەگرت؟**

- ئێ مەکتەبی عەسکەرییە قراری عەسکەرییە.

*** باشە لە مەکتەبی عەسکەری و مەکتەبی سیاسی کێ مسربوو کە بچنە وێ؟**

- خۆیان هەموویان، بەس ئەمن لە لوجنەی مەرکەزی بووم وە عەبدوڵڵای مەلا فەرەجیش ئێســتا ئەلحەمدولیلا ناوت بیستییە مەلا عەلی، ئێستا عەبدوڵڵای مەلا فەرەجیش ماوە، پەلەکرا جا نوکتە ئەوەیە ئێمە لە پشــت نۆکان هەزاران تومەنمان سەرف کرد کە ئیزاعەی لێ دانێین بینایە خەریك بوو تەواوبێ بە پەلە پەل بینا بەجێهێشــترا کەلوپەل بەجێما هاتە هاتەمان تووش هات، هات، هات، هات، هات، هات.

*** باشە کاک فاتح بەپێی ئەو ئەزموونەی لەگەڵ سەرکردایەتی ئەو حیزبە کوردستانیانە هەتــە کەوا زۆر هەمیشــە لەگەڵ پێکهاتــن و عاملەکی زۆر ئیجابــی بوو، عاملەکی نیشــتمانیانە بوو کێش زۆر هەمیشە دەورێکی سلبی دەبینی لە کۆبوونەوەکان و هەمیشەو هەڵچوون و بەگژداچوونەوەی پێوە دیاربوو؟**

- وەڵڵاهــی ئەمــن تەبعەن بۆ مێژوو نــاو نابینم، بەڵام نا نــاو نایەنم زۆرکەس هەبوو بەتایبەتی لەناو سۆشیالیســت زۆر هەڵوێستی ناشیرین، هەڵوێستی تێکدەری، هەڵوێستی تەخریب ب کە من دادەنیشتم لە هەموو کۆبوونەوەکان کە ئەوها تەماشام دەکرد عەقڵییەتی منداڵی کوردی کە دەڵێ دوو نینۆکان دەخورێنم دوو کەســان بەشەڕ دێنم ئیشیان ئەوەبوو هانی حیزبی شیوعی بدەن ببتە شەڕ لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی لەناو سۆشیالیست.

*** باشە کە ئەوەت دەزانی لۆ واتان دەکرد؟**

- من یەك کەس بووم برای بەڕێزم.

*** ئەی بۆ قیادەت باس نەدەکرد؟**

- ئەمن لەگەڵ قیادە دادەنیشتین دەچووینە مفاوەزات خۆ هەر ئەمن نەبووم، کاك کەریم دەهات عەبدولرەزاق سافی دەهات ئەحمەد بانی خێڵانی دەهات.

*** ئەو ئینتباعە لای ئەوانیش دروست ببوو؟**

- نازانم..

*** پێت نەدەگوتن ئەوانە مەوقیفیان وایە مەسەلەن؟**

- لە بەینی خۆمان رەئیمان دەدا ها قسەکانی من زۆرجار بەمنیان دەگوت ئەوە نەختەك مەتەعاتفە لەگەڵ مام جەلال ئەمن قســەی وام دەکرد ئەدی لە پێشــا نەتگوت."لا دخان بدون نار." تێدەگەی، چۆن مەســەلەن خەڵکیان دەکوشــت بابە بۆ دەیکوژی مەکوژە نەء ئەوە تۆڵەیە کاکە ئەمن پێت بڵێم ئەوەندە جەرائیمی راستە حەرەکەی شۆڕشگێڕی کوردی تەزحیەی داو هەزاران قوربانی و هەموومان لازمە کڕنووشــی بۆ ببەین، بەڵام زۆر تاوان و زۆر غەڵەتی گەورەش کرا زۆر بەداخەوە لەژێر پەردەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد وە زۆر بەداخەوە دەڵێم تا ئێســتا قەڵەم نووسانی پاکی مێژوونووسی راستگۆی میللەتی کورد حەقی تەواویان نەدایتە ئەو؟؟؟.

*** باشە باسی نووسین و قەڵەم و ئەو شتانەت کرد رات لەسەر یاداشتەکانی ئەحمەدی بانی خێڵانی چۆنە؟**

- وەڵڵا برام تۆ سوئالی وا مەکە.

*** ئاخر ئەو لەوێ زیاتر لایەنگـــری پارتی گرتووە پێچەوانەی مزەکەراتی تۆ یەعنی دوو مزەکەراتە لە یەك واقعی سیاسیدا بەڵام زۆر لێك جیاوازە؟**

- وەڵـــڵا ئەوە پێت بڵێم، ئەمن ئومێدەوارم و زۆریش بڕوام بە هۆشـــیاری رۆڵەی کورد هەیە، نەوەی تازەی کورد کە ئێســـتاکە مێشکیان کراوەتەوە زۆریاش دەزانن کە بەراوردی بکەن لە بەینی هەڵوێست و نووسین و کردەوەی هەموو لایەك، ئەو وەرامەی من ئەیخەمە بەردەمی مێژوو، بەردەمی رۆڵەی کوردو نووسەران و گەنجانی دڵسۆزی کورد.

*** باشە ئێوە لە ٦/١ مانگی شوباتی ١٩٨٣، "١٩" گروپ بوون لە لیبیا بەیاننامەیەکتان دەرکرد دوایی حیزبی شیوعی زوو کشاوە باشە لۆ چووە ناوێ، لۆ کشاوە یەعنی زۆرجاران حیزبی شیوعی لە...؟**

- ئەوەش پەیوەندی هەیە بەو کێشـــە نارەوایەی کە لەناو سەرکردایەتی حیزبی شیوعی هەبوو و بەعزە کەس، بەعزە عناصر نامەوێ ناویان بێنم کە وەکو ئاگری بەنزین دەورەکیان دیت دوای کپبوونەوە.

*** لەناو حیزبی شیوعی؟**

- لەنـــاو حیزبی شـــیوعی ئەوانـــە دەوری تێکدەریان هەبوو، بـــەس دەزانم کێنە بەڵام ناویان..

*** ئەوانە لە سونعی قەراربوون؟**

- تەبعـــەن لە ســـونعی قەراربـــوون، ئەمە لە شـــاخ بووین کاکە کێ قســـەی مەی دەخوندەوە.

*** یەعنی قسەی ئێوە لە شاخ نەدەخوێندراوە؟**

- نەدەخوندراوە نە شتی وا نەدەخوندراوە برام ئەوان قارەمان بوون.

*** ئەی ئێوە رەئیتان نەدەدا؟**

- چۆن رەئیمان نەدەدا، بەڵام ئەمن پێت دەڵێم میسالم بۆ هێنای نەڵێم من هاوارم کاکە عەلەمی ئاڵای ســـۆرو شین و زەرد تێکدەن حیزبی شیوعی بەیەك قائمە دامەبەزە کەس گوێی نەدا قســـەی مـــن، نامەوێ ناوت بۆبینم عناصر هەبوو دە ئەگەر بەدەســـتیان با قوڕگیان دەگرتم چۆن دەبێ ئەو قسانە بکەم وە تسپاتیشیان کرد چەند....

*** باشە بۆچی ناوەکان ناهێنی؟**

- لەبەر ئەوەی چونکە ئەوە....

*** بۆ تاریخ نییە بۆ هەر بە دەمامك دراوی بمێنێتەوە؟**

- نەء نەء ئەوە بنۆڕە ناوهێنان لە سیاسەت مسداقیەت بزر دەکا.

*** نەء بلعکس؟**

- نەخێر ناوهێنان لە سیاسـەت مسـداقیەت بزر دەکا ئەبێتە موهاتەرات ئەبێتە شـتی شەخصی، بەڵام مەواقع، مەواقف....

*** مەسـەلەن تۆ دەڵێی قیادە٢٠ کەس بووە چوزانی کامەیان موتەتەرف بووە کامەیان معتەدل بووە؟**

- ئەمن پێت دەڵێم مەسـەلەن ئەوە حەیات ئەوە ئسپات دەکا دوای تۆ بەمن دەڵێی فلان بۆ لە نووسـینەکانی وادەنووسـی بەڵکو ئێستاش هەر عەینی تاس و حەمام بێ ئێستاش عەینی شت بێ.

*** باشـە بەس ئێوە بە کشـانەوەتان لەگـەڵ لەو رێکەوتنامەیەکتـان دەرکرد لە لیبیا پەیوەندی ئێوە لەگەڵ یەکێتی بەرەو خراپی چوو؟**

- لەبـەر ئەوەی ئەوە نەء بلعکس پەیوەندی ئێمە وەکو ئەمن ئاگام لێیە پاشـی زۆری نەخایاند یەعنی پاشـی لە سەرەتای١٩٨٤ یەکێتی سێ جار محاوەلەی کرد لەگەڵ ئێمە چاك ببتەوە....

*** ئا بەڵام وردە وردە خراپ بوو؟**

- نا نا یەکێتی سـێ جار محاوەلەی کرد، جارەکیـان جەبار فەرمانیان نارد، جارەکیان حەمەی حەمە باقی ناردرا بۆ مەنتیقەی بارزان ئەوە دوو، جارەکیان من تەکلیف کرام.

*** باشـە نوێنـەری حیزبی شـیوعی کێ بووە لـەو کۆبوونەوەی ئـەوەی ترابلس نوێنەرەکە؟**

- ئای بلعکس ئەوە هەر دەیەوێ ناوان بڵێم.

*** ئا نوێنەرەکە خۆ تەبیعییە نوێنەر بووە لەوێندەر؟**

- وابزانم ئەگەر زاکرە تووشی غەڵەتم نەکا فەخری کەریم و نەزیهە دلێمی بوو....

*** نەء تەواوە وایە، هەر ئەوانەن؟**

- یەعنی نووسیتت.

*** باشـە ئێوە کە بارەگاتان لە ناوزەنگ گواسـتەوە بۆ پشت ئاشان، ناوزەنگ یەکێتی زۆر تیابوو، ئەوکاتی کە لەوێ رۆیشتن یەکێتی پێی ناخۆش نەبوو؟**

- پێیان خۆش نەبوو.

*** پێیان خۆش نەبوو حەزیان دەکرد هەر لەوێ بن؟**

- حەزیان دەکرد، ئاخر پێت دەڵێم یەعینی بەڕاستی بەڕاستی چ لەناو حیزبی شیوعی چ لەناو یەکێتی چ لەناو سۆشیالیست هەموو بۆچوون و را وەکو یەك نەبوو تێدەگەی تەبعەن رەئی موتەشــەنج هەبوو رەئی توندڕەو هەبوو بەڵام رەئی دروستکەریش هەبوو بەتایبەتی مەجموعەکی دیاریکراو لەناو برادەران و ســەرکردایەتی یەکێتــی عیلاقەیان بەقوەت بوو لەگەڵ کاك عەزیز لەگەڵ من لەگەڵ کاك کەریم.

*** یەعنی ئەوان داوایان لێ کردن نەچنە پشت ئاشان؟**

- داوای چی، ئەوان گوتیان پەلەیە منیش زانیم پەلەیە ئاخر ئەوە جەیشی ئێرانی هات جەیشــی ئێرانی هاتە ئەڵواتانت دیوە هاتە ئەڵواتان هاتە بە نوخەجێ ئێ ئەمن بۆ هەڵێم بۆ هەڵێم زۆریش گران لەســەرمان وەستا لەرووی ماددی لە رووی نەتائیجی لەو ئەوەی لەو بنکە تێکچوونە بە پەلە گواستنەوە بۆ پشت ئاشان گەورەترین زەربە بە حورمەت و بە ئیحترام و بەرێزو بەکیان بە شەخصیەت.

*** باشە ئەگەر لە نۆکان یان هەر هەمان شت دووبارە نەدەبۆوە؟**

- لە سیاسەت ناتوانی بڵێی نەء ئیحتمالاتە جەیشی ئێران لێیدابانایە ئیحتمالاتی هەموو شــت هەبوو، تۆ شــەڕی پارتیزانی دەکەی کە دەچییە شــەڕ بە ئومێدی ئەوەی دەچی خەسارە نەدەی بەڵام کە...

*** نەء بە تێڕوانینی خۆت یەعنی ئەگەر هەر لە نۆکان بمابانایەوە؟**

- نەء ئەمن تەوەقعی یەعنی ئەمن نەم دەگۆ هەموو شت مسۆگەرەو دنیا بەخێر، بەڵام شت هەیە، دیارە پەلە پەلەکردن دوای ئەمە سێ حیزب لێرە بین سۆشیالیست لە دوڵە توێ بی، یەکێتی نیشتمانی لە توژەلەو لە ناوزەنگ ئەوە بی ئێمە لەوێ بین، حیزبی دیموکراتی کوردستان چوار پێنج حیزب لەو دۆڵە بی ئێ ئەمن بۆ پێش هەمووان هەڵێم.

*** باشــە کاك فاتح دەکرێ بڵێین دەســتپێکی شەڕی ناوخۆی جدی کە ئەوەبوو لەنێوان حیزبی شــیوعی و هەتا سۆشیالستیش بوو بەس بابڵێین حیزبی شیوعی لەگەڵ یەکێتی لە شــەڕی نێرەگینەوە، شــەڕی نێرەگین کە یەکێتی هێرشی هێنایەسەر حیزبی شیوعی و سۆشیالســت لەوێندەر کۆمەڵێك خەڵکی تێداگرت و هەندێکی لێ کوشــتن و ئەو شەڕە پێشــتر پێشینەیەکی هەبوو کە حیزبی شیوعی غەدرێکی گەورەی لێکردبن لە یەکێتی بۆ تۆڵەکردنەوە هاتبووە ئەوێ. یان ئەوان هاتن پەرە بەو شەڕە بدەن؟**

- نــەء ئەمن بۆ تەئریخ دەڵێم وە ئامادەمە لە ســەمیناراتیش، یەکێتی دائیمە لە هەموو کۆبوونــەوەکان بە ئێمەیان دەگوت ئێوە بە ناوی جوود دفاع لە کردەوەکانی سۆشیالیســت

مەکەن. لە هەمانکات پاوان، سیاسەتی پاوان بەرامبەر بە پارتی چونکە دەیانگۆ پارتی رێنادا ئەمە بچینە بادینان ئەمەش رێنادەین ئەوان بێن، ئەو دوو شتە دائمە نوقتەی خیلاف بوو لە بەینی مەو یەکێتی، تێدەگەی تەبعەن یەکێتی خۆی بە خاوەنی شۆڕشی تازە دەزانی خۆی بە خاوەنی قوە دەزانی، سۆشیالیستیش خۆی دەیەویست ببتە بەدیلی سێیەم و یەعنی ئەوە بکا لەو کێشە ئەساسەکەی لەوەوە هات شەڕی نێرەگین.

* لەوێ تەقییەوە؟

- لەوێ دەستپێکرد، نا لەوێ دەستپێکرد بەڵام وەکو من لە بەرگی سێ بڵاومکردیتەوە تا حەدەك ئاگرەکە دامرکاوە بەڵام دوایێ لە دۆڵی خەلەکان شەماڵ و سەرباز لەلایەن چەند کادرێك کوژران هەرچەندە کادیرانی حیزبی شیوعی پێی ئیتهام کران، بەڵام لە واقیع کادیرانی حیزب، پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی دەستیان تێدا نەبوو، بەڵام بە قارەمانییان زانی گوتیان ئێمەش دەستمان تێدایە، دوایی گران لەسەریان وەستا، نامەوێ ناوبێنم.

* باشە زۆرجار وا بووە زۆرجار؟

- مساعدە بکە دوای تەبعەن ئەوە زیاتر تەوەترەکەی پەیاکرد یەعنی ئەوەبوو لە هەمووی نوکتەتر ئەوەیە ٢٨ یا ٢٦ نیسان ئێمە لە پشت ئاشان بووین مەفرەزەکی، قوەتەکی زۆری یەکێتی نیشتمانی تێپەڕی بەکنەمە داوای یارمەتیان لەمە کرد معەلەبات لەگەڵ نانی زۆرمان بۆناردن چونە ناوزەنگ و ئەو ناوە. پاشی ماوەکی لەگەڵ نەوشیروان هاتن هەر ئەوانە بوون دەورەی ئێمەیان داو زەرەرەکی زۆر بە ئێمە، کەوت ئێمە یەعنی تا ئەو لەحزە بە بۆچوونی من تەسەوڕ نەدەکرا کە یەکێتی ئەو هێرشە بێنێ.

* باشە ئێوە هێرشتان بردو لە بالیسان دەرتان کردبوون بۆ تەسەوڕتان نەدەکرد ئەو هێرشە بێنێ؟

- ئا تەبعەن ئەو هێرشەی کە کرا لە بالیسان دیسان ئەگەر بەرگی سێ بخوێنییەوە من باسی دەکەم بە سەراحەت یوسف حەننا بەرقییەکی کرد.

* ئەبو حکمەت؟

- بەڵێ بەڵێ، یوسف حەننا بەرقییەکی کرد دەڵێ قوەتی سۆشیالیست و یەکێتی لە گوندی پارتی لە گوندی بالوکاوە، بالوکاوە دەزانی لە کێیە لە گوندی بالوکاوە تەسادمیان بوو ئێمە چ بکەین من چوومە مەکتەبی سیاسی گوتم مەچوونە ئەو شەڕەوە بڵاویشم کردیتەوە چوومە مەکتەبی سیاسی کەریم ئەحمەد دانیشتبوو عەبدولڕەزاق سافی دانیشتبوو باقر ئیبراهیم دانیشتبوو سلێمان یوسف کە پێی دەڵێن ئەبو عامل دانیشتبوو پێم گۆتن گۆتم مەچوونە ئەو شەڕەی با نەچین حەتا ئەمن گۆتم ئەو شەڕە، گوتم هێزی

دۆستی مه هەیە، هەیە سێیەکی لەگەڵ ئێمەیە کاك کەریم خۆی لێ تورەکردم گوتی مەڵێ سێ یەك بلێ پێنج یەك باشە من قەرارەکیان وەرگرت(؟؟؟) علاقەی جود ئەوەبوو شەری بالوکاوەی یوسف حەننا قەراریدا گوتی برۆن عەزیزی کوری سالحی شەقلاوەی و دوو سێ پێشمەرگەی کوژراو.....

*** شەهید ئازاد؟**

- شەهید ئازاد، زار خۆش، ئازاد سەرسۆر کوژراو ئەوە نەتیجەکەی، مام جەلالیش گۆتی تۆڵە بەزەبرە ئەمما بەسەبرە، نالێم تاریخ زاڵمە بەلام هەر رێگای خۆی دەکاتەوە هەقائق هەر ئاشکرا دەبێ.

*** باشە پێتوایە ئەبو حکمەت ئەوکاتە پەیوەندییەکی لەگەڵ پارتی هەبوویێ؟**

- ناتوانم ئەمن ئەوەی بلێم بەلام لە تەئریخی دوورو....

*** باشە خۆش نەویستنەکەی نێوانتان لەسەر مەواقفە سیاسییەکان بوو یان؟ یان شەخصی؟**

- وەڵلا ئیحتماله لەسەر هەڵسان و، وەڵلاهی بەعزە جار ئینتباعە، بەعزە جار شەخصیە، بەعزەجار لە علمی نەفس شتەك هەیە دەبینی ئەتو ناشناسم ئەتوم خۆش دەوێ تێدەگەی بەس ئەمن تەبعەن ئەو تەئریخ حەیاتی منی باش دەزانی، منیش تەئریخ حەیاتی وی لە ١٩٤٦ەوە دەزانم کو گیرا لە ١٩٤٩ چی کرد چی نەکرد لە سجن مەوقفی، هەموو شتی دەزانم هەردووکمان باش یەکتر دەناسین.

*** ئێ باشە خۆ هەر ئەتو نازانی قیادەش دەزانی مەوقفی چۆن بووە؟**

- ئێ قیادە دەزانی برۆ بە عەزیز محەمەدی بلێ.

*** ئەو چاوپێکەوتن ناکا؟**

- بلێ بە عەزیز محەمەدی بلێ پێی بلێ، بلێ کاك عەزیز بۆ لە ١٩٤٤ەوە یوسف حەننا دەزانی بۆ گەیشتە ئەو نەتیجەیە ئەو سوئالەی لێ بکە، بینووسە ئەو سوئالەی، بۆ گەیشتە ئەو نەتیجە بلێ لە ١٩٤٤ەوە دەیناسی."١٠" ساڵ بلێ لە سجن لەگەڵت بووە لە نوگرە سەلمان و کوت لەگەڵت بووە باش دەزانی بۆ گەیشتە ئەو نەتیجە ئەوەندەی لێ بپرسە خێرت دەگا.

*** جواب ناداتەوە؟**

- خێرت دەگا ئەتو واجبی خۆت دەکەی قەڵەمت بەدەستەوەیە کوری بابم.

*** باشــه دەڵێی حکومەت لە پشــت ئەو شەڕانە بوو شــەڕی ناوخۆ و با بڵێین ئەوانە بەنســـبەت ئەوەی پشت ئاشان ئی پشت ئاشانیش هەر دەوری حکومەتی تێدابوو یان ئەو شەڕەی بالیسانێ سەبەبەك بوو؟**

- وەڵڵاهـــی پێت بڵێم برا ئەمن ناتوانم لە غەیـــب هیچ بڵێم، بەڵام ئەزانم هەر کارەکی تێکدەری لە کوردستان روویدایە دوژمن ئینجا چ ئێراق چ ئێران چ تورکیا دەستیان هەبووە تا ئێستاش دەستیان هەیە.

*** باشە دەڵێن لەو شەڕەی پشت ئاشان نەوشیروان موسەببیی ئەو شەڕە بوو ئەو شەڕەکەی هەڵگیرساند ئەو قیادەی شەڕەکەی کرد ئەویش تاوانباری یەکە ئەساسی ئەو شەڕەیە ئی پشت ئاشان، بەڕەئی تۆش وایە؟**

- وەڵڵا بەڕەئی من تەبعەن بڕیاری ســـەرکردایەتییە، بەڵام نەوشیروان زیاد لە پێویست هەنگاوی خراپی نا یەك لەوانە ژنی من دایکی ئاسۆســـی لەگەڵ خوشکی دڵزاری کە خەجیج خانە ناوی فریشتەیە لەوێ بوون کە نەوشیروان بڕیاری دایە ئەسیر بکوژرێن وەکو شاهێد مەوجودن ئێستاش...

*** ئەی باشە ئەوان ئەسیر بوون بۆ نەکوژران؟**

- کێ.

*** فریشتە؟**

- ١٤ ژن ئەسیربوون بابەگیان، ١٤ ژن ئەسیربوون.

*** ئەوجا ئەو چواردەیە چەندی لێ کوژرا؟**

- لە ژنەکان نەکوژرا.

*** بەس پیاوەکانیان کوشت؟**

- بەتایبەتی عەرەبەکان، عەرەبەکان و نەختێك کورد.

*** عەرەبەکانیان هەموو کوشت؟**

- نازانم هەموویان نا، بەڵام دایکی ئاســـۆس و فریشتە لەوێ بوون کە خۆیان دیبوویان وابزانم شەش کەسیان دیبوو لەسەر کانی پشت ئاشانێ بە(؟؟).

*** نەوشیروان گوتبووی لێیان دەن؟**

- نا بە شاهید ئەوانن.

*** باشە ئێستا جەنابت دوای ئەو هەموو گێرمەو کێشەیەو ئەو هەموو وەزعەی لەناو ئەو خەباتە دوورودرێژەی هێناو بردت ئێستا چۆن سەیری تەجرەبەی خۆت دەکەی، تەجرەبەیەکت هەیە ترش و سوێری تفت و تاڵی خۆشی و شیرینی هەمووی تێدایە یەعنی ئێستا ئەگەر ببیەوە گەنجەك لە تەمەنی بیست ساڵییەوە بی بە هەمان ئەو عەقڵییەتی ئێستا هەیتت بەڵام تەمەنەکەت بگەڕێتەوە دواوە دەچییەوە ناو ئەو خەباتە** ئاڵۆزکاوەی کە نە سەری دیارە نەبن، دنیایەك گوناهی تێداکرایە دنیایەك خەڵکی **تێکۆشەری تێدا کوژرا بەبێ هیچ تاوانەك هەر لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ و لە ئەنجامی بەرژەوەندی چەند پیادەیەك با بڵێین ئێستا ئەگەر؟**

- وەڵلا دەمەوێ ئاماژەت بەوە بۆ بکەم کە من لە سەرەتایی لە تەمەنی ١٥ ساڵی فەقیرم خۆش دەویست هەژارم خۆش دەویست وام لێهات لەناو خەڵك دەمگۆ لایەنگری رووسانم فەقیرم خۆش دەوێ ئەوەبوو وای لێکردم کە ببم بە ئینسانەکی...

*** ئەوکاتی هیچ، ئەوە زروفەکە چاك بوو ئێستا، ئێستا؟**

- ئەو ماوەی کە ئیشمکردییە من وەکو کابرایەکی بەبێ فرتوفێڵا ئەوەی لە توانام بووە چاك و خراپ، قازانج و زەرەر درێخم تێدا نەکردییە وە قەناعەتم وابووە کە باشترین ئازادبوون لە پێناو رزگاربوونی میللەت لە رێگای حەرەکەی شیوعی پەیادەبێ، بەدەست دێ، تەحقیق دەبێ، بەڵام بڕوا بکە پاش ئەوەی کە لە ناوەڕاستی هەشتاکان پرۆسترۆیکا پەیابوو ملم لە خوێندنەوە نا، سەدەها لاپەڕەی رەشم ئەخوندەوە یەك لەوانە کتێبەکم خوندەوە لە سوریا ئەندامەکی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی؟؟؟ ساڵی ١٩٣٨ نووسیبوی بەناوی ستالنیزم.

*** هەمە کتابەکەم هەیە، هی ستالینییە؟**

- هەر بەناوی ستالنیزم، بە کاکی خۆم بڵێم ئەوە منیش تەبیعەتەکم حەزدەکەم شت بخونمەوە سەبر سەبر گۆڕان، ئێستا بگەڕێمەوە عەینی تەمەن وەڵلا بە عەقڵییەتەکی سۆسیال دیموکراتەکی دیموکراتخواز، مافی مرۆڤ، یەکسانی...

*** پێتوایە یەکسانی شتێکی واقعییە؟**

- مەبەستم لە یەکسانی سەروەری یاسایە، چونکە من لە سوید دەژیم ئەزانم لە سوید ملیاردێر هەیە وە کابراش هەیە لەناو ژوورێکی(؟؟؟) دەنوێ تێدەگەی بەڵام قانون کە دەڵێم سەروەری یاسا ئەساسە تێدەگەی مەبەستم یەکسانی ئەوە نییە بە عەقڵییەتە کۆنەکەی کە ئێمە خەڵکمان پێ پەروەردەکردو خۆشمان پێ پەروەردەکرا تەوزیعات و...

*** باشە تۆ باسی سۆشیال دیموکراتت کرد بە عەقلییەتێکی سۆشیال دیموکراتانە؟**

- لەسەر ئەساسی مانیفیستۆی کارل مارکس.

*** ئێستا یەکێتی بانگەشە بۆ ئەو سۆشیال دیموکراتە دەکات تۆ ئنتباعت چۆنە لەسەری؟**

- ئەوە ئیشی خۆیانە برۆ بەوان بڵێ.

*** باشە کاک فاتح رەئی چەند کەسێکت لێ وەردەگرم، ئنتباعت بەرامبەر ئەو شەخصانە کە لەگەڵیان کارت کردووە زۆر یەکتریتان هینایەو بردیە لە سیاسەتداو ئەوانە بەکورتی مەسەلەن قاسملو، رەئیت لەسەر قاسملو؟**

- قاسملو من لە نێزیکەوە دەیناسم بە بۆچوونی من زیرەکترین سیاسییە، زیرەکترین سیاسیی، وشیارترین سیاسی، زبانزان د. قاسملوە، بەڵام بەداخەوە کە لە نەمسا تووشی شتەك بوو وادەرنەچوو کە سەری تیاچوو.

*** جەلال تاڵەبانی؟**

- مام جەلال برادەری نێزیکمە لە عومری حەفت ساڵییەوە تا ئێستا برادەرین زۆر زۆر زیرەکە زۆر خۆڕاگرە، بەڵام مام جەلالیش وەکو هەر سیاسییەك نییە لە دونیا بێ بیست و چوار(؟؟؟) هیچ کەموکورتییەکی نەبێ.

*** عەزیز محەمەد؟**

- لە ١٩٤٦وە مامۆستام بووە بەشی وەڵڵا هەموو حەیاتی سیاسی لەوی نێزیك بووم زۆرباش ئەیناسم، بەس حەق وابوو پاشەخۆی شتەکی زۆباش بەجێ بێڵێ بەداخەوە بەجێی نەهێشت.

*** کەریم ئەحمەد؟**

- کەریم ئەحمەد مامۆستام بووە مامۆستامە ئەویش رەئی و بۆچوونی ئەیخەمە بەردەمی کادیرانی کۆن و تازەی حیزبی شیوعی و جەماوەرەکەی.

*** رەئی خۆت لەسەر نادەی؟**

- ئەیخەمەبەر مەحەك.

*** مەلا بەختیار؟**

- مەلا بەختیار زیرەکە وە بەڕاستی من لەیەك شت، بەسەری تۆ لە یەك شت ئەمن تەقدیری دەکەم مەلا بەختیار کە ئاڵای شۆڕش تەفروتونا بوو، مەلا بەختیار دوو ساڵ وابزانم لە سجن بوو، بەڵام مەلا بەختیار هەڵساوە ئازایانە هەڵسا (؟؟؟) ئەڵمانی دەڵێ لە

ژیان کەوتن مهم نییە راست بوونەوە مهم ترە لە کەوتن، مەلا بەختیار هەڵسایەوە.

*** کەمال شاکر؟**

- وەڵڵا کابرایەکی حەبابەو مجامەلەو رووی خۆشە.

*** ئاخرکەس جەلال دەباغ؟**

- وەڵڵا برادەرەکی تێزیکمە.

*** لە سیاسەت؟**

- سیاســـییەن و حیزبییەن و نووســـین زۆر رێکوپێکە ئەویش یەعنی عالەمەکی خۆی هەیە.

*** هەست ناکەی جەلال دەباغ لە سیاسەتدا زۆر سەرکەوتوو نەبوو؟**

- برۆ بەخۆی بڵێ.

*** ئەمە بەرپرسی جەنابت؟**

- برۆ بەخۆی بڵێ بۆ بەمن دەڵێی.

مەلا سدیق عەبدولعەزیز، برای مەلا عوسمان عەبدولعەزیزو مەلا عەلی عەبدولعەزیزە، کە مەلا عوسمان رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان بووەو دواتریش مەلا عەلی لەشوێنی مەلا عوسمان لەناو بزووتنەوە دانرا.

مەلا سـدیق هەر کە رووی کردۆتە شـاخ و هەڵەبجەی جێهێشـتووە، چووەتە ناو ئیخوان، دیارە لەوێش لەودیو(ئێرانەوە) لە هەندێك رووەوە جیاوازی لەگەڵ سەلاحەدین بەهائەدین هەبووە کە ئێستا ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامییە.

دوای ئەوەی مەلا سـدیق لەگەڵ سـەلاحەدین بەهائەدیـن تێکدەچێ و راپەڕین لەکوردسـتان سەرهەڵدەدا، مەلا سـدیق ئەم باوەڕەی دەقۆزێتەوەو ئەویش بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسـلامی دادەمەزرێنێ و تاڕادەیەك خەڵکێکی لەدەور کۆدەبێتەوە، بەڵام دواتر دروستکردنی یەکگرتووی ئیسـلامی و ناکۆکییەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لەگەڵ یەکێتی نیشـتمانی و ئەو دۆخە سیاسیە دژوارەی لەکوردستان هاتە ئاراوە، رەنگدانەوەو کاریگەیی زۆری بەسـەر راپەڕینی ئیسلامییەوە هەبوو، تا وای لێهات لەگەڵ بزووتنـەوە یەکیان گرت، لەکاتێکدا بارودۆخی بزووتنەوەی ئیسـلامی زۆر زۆر لە بارودۆخی حزبی سۆشیالیسـتی دوای نیوەی دووەمی هەشتاکان ئاڵۆزتربوو، لەراسـتیدا مەلا سدیق بەر لەوەی سیاسـیانە بڕیار بدات کەوتبووە ژێر کاریگەری سـۆزو عاتیفەو ئەو ژیانـە کۆمەڵایەتیەی کە لە رۆژهەڵاتدا بـاوە، بەتایبەت کە رابەرانی بزووتنەوەی ئیسـلامی برا گەورەی بـوون و نەیدەتوانی لەژێرکاریگەری ئەو برایەتییە راپەڕێ، ئیتر راپەڕینی ئیسـلامی چووە ناو بزووتنەوەی ئیسـلامی، بزووتنەوەی ئیسلامیش تووشی پەتای کەرت و بوون و جوادبوونەوە هات، بەم شێوەیە هەم بزووتنەوەی ئیسـلامی زۆر بچوك بووەوەو هیچ کاریگەری نەما، هەم راپەڕینی ئیسلامیش توایەوە.

*** دەکرێ بە کورتی باســـی یەکەم ئینتیمات بۆ هەر بزووتنەوەیەکی ئیســـلامی سیاسی بکەیت، ئایا یەکەمجار چوویتە ناو ئیخوان موســـلمینی عێراق یان پێش ئەوە لە ناو گرووپی تردا کارت کردووە؟**

- بـــە کورتی لە ١٩٥٢ دا رێکخســـتنی ئیخوان لە رێگەی شـــێخ (ئەمجەد الزهاوی و مەحمود ســـواف)ەوە، هاتە ناوچەی هەڵەبجە، کاکە مەلا عوسمانم باوەشی بۆ ئەو فیکرەیە کردەوە و ئینتیمای ئەو زیاتر رۆحی و ئەدەبی بوو نەك تەنزیمی و ئیداری، لە ١٩٥٨ دا کە عەبدولکەریم قاسم ئینقلابی کرد و لە پاشاندا باوەشی بۆ شیوعییەکان کردەوە و وەزارەتی پێدان، شیوعییەکان کەوتنە دروستکردنی (مقاومە شعبی) و ئەو هێزەشیان بەردایە گیانی خەڵکی موتەدەین و ئەمەش وایکرد کە هەستی دینی بەهێزتر بێت، لە ١٩٦٣ دا عەبدولسەلام عارف لەگەڵ بەعســـییەکاندا ئینقلابیان بەسەر عەبدولکەریم قاسمدا کرد و ئەوەبوو ئەحمەد حەسەن بەکر کرایە سەرۆك وەزیران و عەبدولسەلام خۆی بوو بە سەرۆك کۆمار و دەستی بەعسییەکان کرایەوە ئەمانیش وەك شـــیوعییەکانی سەردەمی عەبدولکەریم کەوتنە دروستکردنی (حەرەس قەومی) و بەریان دایە گیانی خەڵکی غەیرە عەرەب بەتایبەتی.

شۆڕشی کورد ئەوکاتە لەگەڵ بەعســـییەکاندا رێکەوت و ئەوەبوو عەبدولسەلام وادەکانی خۆی نەبردە ســـەر. شۆڕشی کورد لەو ساڵانەدا تووشی ئینشیقاقات بوو، شۆڕشی ئەیلوول دەســـتپێکرد و هێزێکی گەورەی ئەو شۆڕشـــە لەگەڵ حکومەتی مەرکـــەزی ئەوکاتەدا رێککەوتنـــی کرد و شۆڕشـــی گەلی کورد ناچاری ئەوەبوو دانووســـتان لەگەڵ حکومەت بکات، حەلکردنی ئەو هێزەی رێککەوتنیان لەگەڵ حکومەت کرد و لەو لاشەوە ئەو هێزانەی عەشـــایەر کە بەناوی (فرســـان ســـەلاح الدین) دروســـت کرابوون، ئەوەبوو ئەو دانووستانانە ســـەری گرت و بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠ دەرکرا و بەو حوکمەش هێزە چەکدارەکانی لای حکومەتی مەرکەزی حەلکران. لە ١٩٦٣ دا و پاش هەشت نۆ مانگ عەبدولسەلام لەگەڵ بەعســـییەکاندا ناکۆکی بۆ دروست بوو ئەوەبوو(حەرەس قەومی)یەکانی حەلکرد و خۆی بوو بە حاکمی موتڵەق لە عێراقدا، ئەمەی وایکرد کە بەعسییەکان خۆیان و یەك لایەنە کودەتای ١٩٦٨ بکەن بەســـەر عەبدولڕەحمان برای عەبدولسەلام عارفدا و بە دەستێکی پۆڵایین بدەن لە نەیارەکانیان، کاتی خۆی دوو ڕەوت کاری دەکرد ڕەوتە ناســـیۆنالیزمیەکان بریتی بوو لە بەعســـییەکان لەناو عەرەبەکاندا و شۆڕشی ئەیلوول لەناو کورددا کە هەر زوو ناکۆکی و دوو بەرەیی کەوتە ناو شۆڕشـــەکە لەسەر تەفسیرکردنی مەســـەلەکان و داڕێژانی سیاسەتەکان، ڕەوتە ئەنتەرناسیۆنالیزمەکەش لەناو عەرەبەکاندا بریتی بوو لە شیوعییەکان و لەناو کوردیشدا

بریتی بوو لە رەوتی ئیسلامی کە تەنزیمی ئیخوان لە پەنجاکانەوە تا شەستەکان و تا(١٩٦٢) کاری تەنزیمی نەبوو لەو ساڵەدا یەکەمین شانەی رێکخستن دروست کرا و پاش ئەوە ئیتر راسپاردە و تەعلیمات دەهات و من ئەوکاتە بۆ هێنان و بردنی راسپاردە نهێنییەکانی تەنزیم دانرابووم لەنێوان کەرکوك و ناوچەی هەڵەبجەدا کە ئەوکاتە مامۆستا عابدین رەشید سەرپەرشتیاری رێکخستنەکانی کوردستان بوو، بۆیە ئەگەر ورد وەڵامی پرسیارەکەی ئێوە بدەینەوە ئەوەیە من بە حوکمی ئەوەی مامۆستا مەلا ساڵح و مامۆستا مەلا عوسمانی کاکم باوەشی بۆ ئەو رێکخستنە کردەوە و بنەماڵەکەمان داخڵی ئەو رێکخستنە بوون منیش ئاوێتە بووم، بەڵام تا ساڵی(١٩٦٢) هەر ئینتیمایەکی رۆحی و ئەدەبیات بوو، بەڵام پاش ئەو ساڵە بوو بە پەیوەندییەکی تەنزیمی و ئیداری و لەوەودوا کارەکان شکلی حیزبایەتیان وەرگرت و منیش وەك کەسێکی موسڵمان ئەو رێکخستنەم بەڕاست دەزانی و دڵنیابووم کە هەوڵ دەدەن بۆ سەروەری ئیسلام کە یەقینم هەبوو تەواوی چارەسەرییەکانی ئەم مرۆڤە لەو دینەدایە و ئەمەش بە شایەتی مێژووی دوور و نزیك کە لەم چاوپێکەوتنە بچووکەدا بوار نییە بۆ سەلماندنی ئەم قەناعەتە.

*** بۆچی ئیخوانت هەڵبژارد لە کاتێکدا بزووتنەوەی دیکەی نەتەوەیی لە کوردستان هەبوون، بزووتنەوەی ئیخوانیش هەڵقوڵاوی واقیعی ناو میسر بوو؟**

- پرسیارەکە دوو لقە، یەکەمیان بۆچی ئیخوانم هەڵبژارد دووەمیان بۆچی بزووتنەوەیەکی نەتەوەییم هەڵنەبژارد، بە کورتی وەڵامی هەردوو لقەکە بدەمەوە.

هەڵبژاردنی من بۆ رێکخستنی ئیخوان زۆر هۆی هەبوو، یەکێکیان وا بەستەبوونی کاکە مەلا عوسمانم و بنەماڵەکەمان بەو رێکخستنەوە، یەکێکی تر قەناعەتم هەبوو بەوەی ئەو رێکخستنە، رێکخستنێکی قەومی یان ئیقلیمی نەبوو بەڵکو رێکخستنێکی ئیسلامی بوو دوور بوو لە دەمارگیری قەومی و ئیقلیمی و ئێمەش لەوە دڵنیابووین کە ئیخوان نەك، هەر رێگرنین لەوەدا تەریب لەگەڵ بەرژەوەندی گەل و میللەتی خۆماندا رێ بکەین بەڵکو هاوکار و هاریکاریش دەبن، با من نموونەیەك بهێنمەوە، کە شایەتحاڵەکانی ئەو قۆناغە زۆر هەیە کە ئەم نموونەیە پشت راست بکاتەوە و لەوانە برای بەڕێز مامۆستا مەلا جەلالی کاکە ساڵحم کوڕە گەورەی مامۆستا مەلا ساڵحی گەورە لە دوای(١٩٦٣) وە کە هەندێك ئیجتیهادی وابوو کە عەشایەر چەکدار بکرێت و لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا، هەڵوێست هەماهەنگ بکات و لەو لاشەوە شۆڕشی کورد بە بەرامبەر ئەم رایە وەستابوو ئیخوان ئەوکاتە رای لەو چەکدارکردنەی عەشایەر نەبوو و دەشیان گوت کورد ناهەقی ناکات کە

دەســـتی داوەتە شۆڕشکردن، تەنانەت دەیانگوت: چی تێدایە کە کوردیش خاوەنی حکومەتی خۆیان بن، ئەگەر ناهەقیش بکەن ئەوانیش وەك ئەم حکومەتانەی تر کە هەن و ماف بەخۆیان دەدەن!! بۆیە لە راســـتیدا ئەوکاتە کارکردنمان لەو رێکخستنەدا بەو دیدە نەدەبینی کە جەنابت بۆی دەچی، ئەو رێکخســـتنە هەڵقوڵاوی میســـر بێت و وابەستەبێت بە هەرێمێك و بیرێکی قەومییەوە.

*** ئایا راستە بۆ یەکەمجار لە عێراقدا ئیخوان لە موسڵ هاتە سەرهەڵدان؟**

- بەڵێ راســـتە ئیخوان یەکەمجار لەسەر دەستی شێخ مەحمود سوافدا هاتە ناو عێراق کە ئەویش مامۆستایەکی بە توانای خەڵکی موسڵ بوو، بەڵام مەحمود سواف بە هاوناهەنگ و پشـــتیوانی شێخ ئەمجەد ئەلزەهاوی دەســـتی بەو کارەکرد کە زەهاویش زانایەکی بەرز و بلیمەتی کورد بوو، نەك هەر ئەوە بەڵکو ســـەرۆکی هەموو زانایانی عێراق و پلەی (مفتی) هەبوو شـــێخ ئەمجەد (بە رەحمەت بێت) تا بڵێی زانا و دانا بوو بوونی ئەو لەو کارەدا هەر خۆی بەڵگە بوو بۆ دروســـتی و خۆشەویســـتیکردنی کارەکە بۆیە هەر زوو جێگەی خۆی کردەوە لە کوردستاندا.

* دەکرێ بە ناوهێنان باسی ئەو کەسانە بکەیت کە بۆ یەکەمجار لە کوردستاندا ئیخوانیان هێنا؟

- ئەوەی لە بیرم بێت کاری رێکخســـتنی ئیخوانی لە هەموو شارەکانی کوردستاندا کەوتە رەگداکوتان لەبەر زۆری هۆی زاتی و مەوزووعی.

هۆیـــە زاتییەکان بریتـــی بوون، لەوەی بانگەوازەکە بانگەوازێکـــی دینی بوو لە زۆرترین کەســـی زانا و دانای جیهانی ئیسلامی پێکهاتبوون و خەڵکی کوردیش هەمیشە چاوی لە ئاماژە و تەوجیهی زانایانەوە بوو، هۆیە مەوزووعیەکانیش بە کورتی بریتی بوون، لەو هەموو فشـــارەی کە بیری چەپ و کۆمۆنیســـتەکان هێنابوویان بۆ خەڵکی و جاری وا هەبوو لە خۆپیشاندانەکانیاندا دەیانگوت (بعد شهر، ماکو مهر) یان دەیانگوت (مژدە بێت خوشك و برا دەرگای مزگەوت داخرا) ئێمە کەمتر هەواڵی شارەکانی تری کوردستانمان دەزانی بەڵام لەوە دڵنیابووین کە لە کەرکووك و هەولێر و دهۆکدا کاری باش کراوە و، تەنانەت لەســـەردانێکی تەنزیمی برایەکی هەولێر بەناوی مامۆســـتا ســـوبحی داودی و مامۆستا عابدین رەشید لە کەرکووك یەکەمین شـــانەی رێکخســـتنی ئیخوانیان لە من و مامۆستا مەلا جەلالی کاکە مەلا ساڵحم دروستکرد و لەسەردەستی ئەواندا بوو، کە کارەکە گەورەبوو ئەوەبوو پاشان بەڕێز مامۆستا عومەری ریشاوی و مامۆستا شێخ عەبدولعەزیز پارەزانی و کەسانی تریش هاتنە

ناو تەنزیمەکە و بەڕێز مامۆستا عومەر ریشاویان کردە بەرپرسی ئیداری رێکخستنەکە. پاشان مامۆستا شـێخ محەمەدی خەتیب کە ئەوکات وتارخوێنی مزگەوتی پاشا بوو و مامۆستا شـێخ نورەدین فقی کە ئیمام و واعزی مزگەوتی دارولسەلام بوو گوڕوتینێکی زۆر باشیان دایە رێکخسـتنەکە و بەراسـتی درێغیان نەکرد لە بڵاوکردنەوەو پشتیوانیکردن لەو تەنزیمە ئیسلامییە.

*** ئایا چوونی بەڕێزتان بۆ ناو ئیخوان بەهۆی مەلا عوسـمانی براتەوە بوو یان شـتێکی تر هەبوو بۆ ئەو ئینتیمایەت؟**

- لە پرسـیارەکانی پێشـوودا وەڵامێکی(شێوە)ی ئەم پرسـیارەم دایەوە بۆیە پێویست بە دووبارەکردنەوە نییە و نکوڵی لەوەش ناکەم، کە هاندان و پشـتیوانی کاکە مەلا عوسمانم بۆ برایان کاریگەری باشی هەبوو لەسەر من و جگە لە منیش کە بەو رێکخستنەوە پابەند ببین و کاری لـە ناودا بکەین و هەر زۆر زووش زانایانی ئیسـلامی فەرموویانە(من قلد عالما لقی الله سالما).

*** ئەوکاتەی ئیخوان لە هەموو چالاکییەك خۆی سر(تجمید) کرد، ئایا بەڕێزت پەیوەندیت لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی هەبوو یان تۆش وەکو ئیخوان خۆت بۆ خۆت هەموو چالاکییەکی خۆت راگرت؟**

- کە بەعسییەکان کودەتایان کرد دوو داخی گەورەیان پێ بوو بۆ ئیخوان یەکەمیان ئەوەبوو کە کادر و ئەندامێکی دەرەجەداری زۆریان هەبوو لەناو سـوپادا و خولیا و خەیاڵی ئینقلاب کردنیشـیان لەسـەر دابوو، دووهەمیان ئیخوان بیرێکی ئایینی هەبـوو ئەوەش وەك دینەمۆ بەردەوام دەیجولاندن و گەشـەی زیاتری دەکرد چونکە ئیخوان بە ئاشـکرا لە پاش کودەتا سەرنەکەوتووەکەی (شواف) دوە، لە ساڵی (١٩٥٩)دا کە بەسەر حوکمی عەبدولکەریم قاسمدا کردی بوونە دووباڵ باڵێك زیاتر لایەنگری لە کودەتاو هێزی سـەربازی دەکردەوە و باڵێکیش کە ئەو بیروبڕکردنەوەی بە هەڵە و ترسـناك دەزانی بۆیە لە ساڵی(١٩٦٨)داو بە ماوەیەکی کەم پێش کودەتای بەعسـییەکان بەسـەر عەبدولڕەحمان عارفدا، ئەفسەر و دەرەجەدارەکانی ناو سـوپای عێراقی پێشنیاری کودەتاکردن دەکەن بۆ ئیخوان و هەواڵی ئەوەشیان دەدەنێ کە ئەگەر ئێوە کودەتا نەکەن ئەوە بەعسییەکان بەرنامەی کودەتاکردنیان هەیە، بەڵام سەرکردایەتی ئیخوانی ئەوکاتە ئەم بیرە دەداتە دواوە و زۆری پێ ناچێ بەعسـییەکان کودەتای(١٩٦٨) دەکەن و سـەرەتا ( )ی ئیخوان دەکەن و پێشـنیاری ئەوە دەکەن کە بێن و وەزارەت وەربگرن، بەڵام لە پاشاندا ئەوەبوو بەعس کەوتە مولاحەقە و تەنگ پێ هەڵچنینیان و چەندانیشی لێ

شەهیدکردن وەك محەمەد فەرەج و قاسم قەیسی و کێ و کێ.......

پاش ئەمانە کاری ئیخوان لە نێوان سێ تاقمدا قەتیس بوو(تربیە)(تنقیم) (ترکی ما سوی ژلك) وتجمیدکردنی کار هاتە ناو کارەکە بەڵام، من ئەوکاتەش بەو جۆرە بیرکردنەوانە رازی نەبووم لەبەر زۆر شـــت: یەکێك لە ئیسلامدا نابێ کارکردن بۆ دین پەیوەند بکرێ بە کەسێك یان جەمعێکەوە کە ئەگەر ئەو کەســـە یان ئەو جەمعە تووشـــی (صدمە)یەك بوو کارەکەش تووشی سدمە ببێت.

دووهەم: هەر کەســـەو زرووفـــی تایبەتی خۆی هەیە، لەوانەیە بـــرا عەرەبەکان زرووفیان رێگەیان نەدات کاری تەنزیمی بکەن لەبەر بەهێزی دەســـەڵاتی بەعسی بەسەر ناوچەکەیاندا بـــەڵام خۆ ئێمە وانەبووین بۆ ئەوەش کە دەڵێن ئایـــا پەیوەندیم لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی هەبوو، لە راســـتیدا کاری ئیسلامی منی ســـەرقاڵ کردبوو، سەیتەرەی بەسەر بیروهۆشمدا کردبـــوو، خەیاڵم لای ئـــەوە نەبوو کە بیری نەتەوەیی بە بەدیلی ئەم بزانم یان ئەم بە بەدیلی ئەو بزانم، بۆیە لە ســـاڵی (١٩٧٠) کاتێك کە بەیانی ١١/ ئازار خوێنرایەوە، کاکە عوسمانم چووە لای بارزانی لە گەڵاڵە لەوێ پێشـــنیاری دروستکردنی یەکێتی زانایانی بۆ ئەوکات، بارزانیش زۆر بە پێشنیارەکە دڵخۆش دەبێت و تەنانەت چەند وتەی بە نرخی لەو مەجلیسەدا لێ دەگێڕنەوە کەوتوویەتی، ئێوە حاکم بن و منیش داری دەســـتی ئێوە، یان وتوویەتی: من ئاواتم ئەوەیە شـــەریعەتی خوا جێبەجێ بکەم، لە راستیدا براینە ئەو بیروبیرکردنەوەی ئێستا هەیـــە بۆ دین و کاری دینی ئەوکات نەبوو، هەرگیـــز مەبدەئی (من دائەمەزرێم تۆ هەڵێ) نەبوو وەك ئێستا هەیە.

*** ئیخوان بڕوای بە خەباتی چەکداری نەبوو مامۆســـتا مەلا عوســـمانی براشت بڕوای بە تێکۆشانی ســـەربازی هەبوو ئایا راستە لەبەر ئەم هۆیە مامۆستا عوسمان لەناو ئیخوان دەرکـــرا؟ یان خۆی ئیخوانی بەجێهێشـــت؟ کە ئەو بەرپرسە لەناو ئیخـــوان ئەما تەکلیفی بە جدایيشت نەکرد کە ئیخوان جێبهێڵێت و لەگەڵ ئەو بڕوێتە ناو بزووتنەوە؟**

- یەکەم بڕوانەبوونی ئیخوان بە چەك پێویســـتی بە دراسەو توێژینەوەی ورد هەیە ئیخوان یەکێك لە دروشمە بەردەوامەکانی بریتی بوو لە (الجهاد سبیلنا) (الموت فی سبیل الله اسمی أمانینا) هەرواش بوو شێخ حەسەن البنا لە پاڵ رێکخستنەکەدا هێزی چەکداریشی دروستکرد بوو بەتایبەت ئەوکاتەی کە میسر لەلایەن ئیمپریالیزمی ئینگلیزییەوە داگیرکرابوو، بەڵام لە پاشـــاندا ئیخوان کە لەسەربوونی ئەو هێزانەدا تووشی گلان و شکسی زۆر بوو (اعادە نقر) یان کرد لەبوونی ئەو هێزانەو گەیشـــتنە ئەوەی کە هێز دروستکردن زیانی زیاترە لە دروست

نەکردنی، کە تۆمەتیش هاتەسەر کوردستان ئیخوان هەمان قەناعەتی هەبوو کە دورستکردنی هێزی چەکداری لەناو کوردستاندا بەناوی ئیخوانەوە مایەی زیانی گەورەیە بۆیە نووسیان بۆ مامۆســتا مەلا عوسمان کە ئەو خۆی لە هێزی چەکداری نەئاڵێنێ و کاکە مەلا عەلیم بۆ ئەوکارە تەرخان بکات و ئەو هێزە ســەربازییە بەو بسپێرێت و لەپشتی پەردەوە دەعمی بکات، بەڵام ئەوکاتە هەڵومەرجی کوردســتان بەجۆرێك بوو کە تەفسیرکردن و تەحلیلکردنی ئاسان نەبوو بەو شــێوەیەش ئاســان نەبوو ئیخوان قەناعەت پێ بکەی کە هەڵومەرجی کوردستان جیاوازی هەیە لەگەڵ شــوێنەکانی تردا، بۆیە لەسەر ئەو قەناعەتەی خۆیان بەردەوام بوون و مامۆســتا مەلا عوسمانیش لێیان عادز بوو، زۆر رەق وەڵامی دانەوە و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی مامۆســتا بە عەکسی ئیرادەو ئیدارەی ئەوانەوە ئیعلانی بزووتنەوەی ئیسلامی بکات لــە (١٩٨٧) داو ئەوانیش لەناو خەڵکدا ئیعلانی ئەوە بکەن کە مامۆســتا مەلا عوســمان پەیوەندی بە ئیخوانەوە نەماوە مامۆســتا لای گرنگ نەبوو کە ئیخوان نەبێت، ئەوەی لای گرنــگ بوو لەکاتی لێقەوماندێکی گەورەی وادا کە میللەتی کوردی تێکەوتووە ئەو لەگەڵ ئازارەکانی میللەتەکەیدا بێت و خواو پاشان میللەت و گەلەکەی رازی بکات، ئیتر خەڵکێکی تــر کە لەو ئازارە ناگات و لۆمەی دەکات و گرنگ نییە لەم نارازی بن و مەدحی نەکەن، ئەوە بوو ئیجتیهادەکەی مامۆســتا مەلا عوسمانیش راست دەرچوو، بزووتنەوەی ئیسلامیش پارسەنگێکی باشیدا بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و پیاوە ئاگادارو بە ویژدانەکانی ناو شۆرشی کوردیش ئەو شــایەتییە دەدەن بەنسبەت ئەوەشەوە کە ئەو تەکلیفی کردبێت ئیخوان بەجێبهێڵــم و لەگەڵ ئــەودا بچمە ناو بزووتنەوەوە، ئــەوە حیکایەتێکی دووردودرێژە و هەروا بە ســادەیی ناوترێ بەڵام بەکورتی من ئەوکات وام بە مەســڵەحەت دەزانی کە تا دەتوانرێ ئــەو هێزە چەکدارییە بەهێزو بەپێز بکرێ و بۆ ئــەوەش من هیچ درێغییەکم نەکرد، لەگەڵ ئەوەشــدا دەست لەو کەســانە بەرنەدرێت کە قەناعەتیان بەهێزی چەکداری نییە بۆ ئەوەی هێــزی چەکدارو هێزی تەنزیم یان هێزی بیرو هێزی بازوو لەیەك جیانەبنەوە و ئەو خۆی بە بەدیلــی ئەو بزانێت، بەڵکو زەروورە یەك خۆی بەتەواوکەری ئەوی تر بزانێ، بەڵام بەداخەوە هەڵومەرجــەکان دژ بەم بیرەی من بوون و وەك شــاعیر دەڵێ (تجری الرياح بما لاتشــتهي السفن).

*** ئەوکاتەی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیســلامی لەساڵی ١٩٧٨ دامەزرا، بەرێزت تا چەند ئاگادار بووی؟ بۆچی نەچوویتە ناوی، لەکاتێکدا ئیخوان ئەوکاتە خۆی تەجمید کردبوو؟**

- ئێمە ئەوکاتە ســەرگەرمی کاری خۆمان بووین قۆناغی دامەزران و مەشــوەرت کردن

بوو بۆ نوێکردنەوەی ڕێکخستنی ئیخوان، ئەوە بوو کۆمەڵێکی باش لە لاوانی خوێن گەرم ئامادەیی خۆیان دەربڕی، بۆ کارەکەو ئەو ڕێکخستنەش کاریگەری و ناوی وای نەبوو لە ناوەندی ئیسلامییەکانداو خۆسڕکردنی ئیخوانیش کارێك بوو نە ئێمە قەناعەتمان پێ هەبوو نە کاری لە مەعنەویاتی ئێمەش کرد.

*** ئەوکاتەی مەلا عوسمانی برات بزووتنەوەی ئیسلامی دروستکرد لە ساڵی١٩٨٧ تۆ رات لەسەر دروستکرنی چی بوو؟ ئایا راوێژت لەگەڵ کرابوو؟**

- پێشتر عەرزم کردن کە کاتێك کاکە عوسمانم کۆچی کرد بۆ ئێران من پێشتر لەبەر ئەوەی ئەمری گرتن و لەسێدارەدانم لەلایەن بەعسییەکانەوە بۆ دەرچووبوو لە ئێران بووم، کە کۆچی زانایانی هەڵەبجەش لە(١٩٨٧)دا دەستییێکرد من و کاك (سەلاح)یش چووین بەدەمیانەوەو ئەوان لەوێدا پێشنیاری دروستکردنی هێزێکی چەکداریان کرد ئێمەش (مەبدەئییەن) پشتوانیمان لێکردن و بەڵام ئەوە بوو کە ئیخوان لە دەرەوە بەمەیان زانی وایان بەباشزانی کە کاکە عوسمانم ئەو هێزە چەکدارییە بسپێرێت بەمامۆستا مەلا عەلی و خۆی تەنزیمی ئیخوانی نەپێچێت بەو هێزە عەسکەرییەوە لەپشتی پەردەوە هاوکارییان بێت، بەڵام کاکە عوسمانم رای وانەبوو، ئەوەبوو ئەوە روویدا کە روویدا.

*** کە بزووتنەوە دامەزرا، تۆ قاچێکت لەگەڵ بزووتنەوە بوو قاچێکیشت لەگەڵ ئیخوان بوو، دواتر لەساڵی ١٩٨٩ گەڕایتەوە ناو ئیخوان تا ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ ئیخوان مایتەوە، بەڵام لە ١٩٩١ جارێکی تر لێیان دابڕایتەوە، دەکرێ هۆکارەکانی ئەو دابڕانەت لە ئیخوان بزانین، بەتایبەت لەگەڵ (سەلاحەدین باهەدین)؟**

- پرسیارەکەتان هەندێکی وایە و هەندێکی وا نییە، جارێ من لە(١٩٨٩) دا قاچێکم لەناو بزووتنەوە قاچێکم لەناو ئیخواندا نەبوو، بەڵکو هەردوو قاچم هەر لەناو ئیخواندا بوو، نەك تا(١٩٩١) بەڵکو تا(١٩٩٢/١١/٢٢) بەردەوام هەر ئیخوان بووین و لەو رۆژەداو بەبڕیاری سەرکردایەتی ئەوکاتە هاتینە سەر ئەو قەناعەتەی کە ناوی (برا) (بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامی) رابگەیەنین و بەو ناوەوە کاربکەین هۆکاری دابڕینی ئێمە لە ئیخوان بۆ چەند شتێك دەگەڕێتەوە:

١- ئێمە هەر لەپاش (١٩٧١) کە کاری ئیخوانی سڕکرا، ناڕازیتی خۆمان لەو کارە دەربڕی و ئەوەمان بەڕاست نەزانی، کە پابەندبین بەو بڕیارەوە و ئەمەش بەجۆرێك لەیاخی بوون سەیر دەکرا.

٢- ئێمە بەبێ گوێدانە ئەو بڕیارە کاری تەنزیماتمان نوێ کردەوە و بەیعەتیشمان لەخەڵکی

وەردەگرت بۆکاری ئیسلامی و ئەمەش بووە هۆی موناقەشەو دەمەقاڵە و جارجارەش دەبووە هۆی دابڕان لەم کەسایەتی یان لەو کەسایەتی و دیاریش بوو ئێمە تەنیا مەبەستمان ئەوە بوو کوردستان تایبەتییەکی خۆی هەیە و ناکرێ رەچاوی ئەو تایبەتییە نەکرێت، ئەمەش بووە رەسیدێکی لە ئەرسیدەی موخالەفاتمان بەنەزەری ئەوان.

٣- ئێمە رامان لە دروستکردنی هێزێکی چەکداری هەبوو لەبەر زۆر هۆی شەرعی و سیاسی کاری باشیشمان کرد بۆ دامەزراندن و رێکخستنی ئەو کارە بە ئەفکارو بە ئەفرادیش ئەمەش بووە مایەی نیگەرانی ئیخوان و ئەوانەی کە موخالەفاتیان نەبوو بۆ ئیخوان ئەم کارەشمان دیسانەوە چووە سەر رەسیدە نامەقبولەکەمان.

٤- کە لە ئێرانیش رێککەوتنمان کرد لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی تری برایان کە هاوڕا نەبوون لەگەڵ ئەو رایانەی سەرەوەی ئێمەداو ئەو راوبۆچوونەیان بەجۆرێك لە یاخیبوون دەدایە قەڵەم لەگەڵ ئەو برایانەدا وامان بڕیاردا تا ئێمەو رێکخستنی ئێمە لە ئێراندابین پابەند دەبین بە راسپاردەو تەوجیهاتی ئەوانەوە بەو مەرجەی کە گەڕاینەوە بۆ عێراق ئەوان پابەندبن بە راسپاردەو تەوجیهاتی ئێمەوە، ئەمەش وەك بەڵگەنامەیەك لامانەو هەموو ئیمزامان کردووە بەڵام بەداخەوە وا دەرنەچوو، ئێمە بەڕاستمان بوو کەچی ئەوان وەك (تەکتیك) بۆ ئەو رێککەوتننامەیان روانیبوو. ئەو چوار خاڵە وایکرد کە ئیخوان و ئەوانەی کتومت وەك ئەوان بیریان دەکردەوە بەچاوی گومانەوە بۆ ئێمەو تەنزیمی ئێمە بڕوانن و کەمە کەمە هەستی بێ ئومێدی و دابڕان لەوان و لە ئێمەشدا دروست بوو، کە دەرئەنجام گەیشتە ئەوەی لە ١٩٩٢/١١/٢٢دا راگەیاندنی تەنزیمی سەربەخۆی خۆمان بکەین و ناوی بنێین(راپەڕینی ئیسلامی).

*** بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٩٣ لەلایەن بەڕێزتانەوە دامەزرا، بەڵام ئێوە زۆرترین گرفتتان لەگەڵ باڵێکی ئیخوان کە سەلاحەدین باهەدین رابەرایەتی دەکرد دروستبوو، ئایا هۆکاری ئەم ناکۆکیانە لەبەر ئەوە نەبوو چونکە ئەوان لە ساڵی ١٩٩١-١٩٩٢ رازی نەبوون جەنابت ببی بە ئەمیندار، بەڵکو لە دژی بەڕێزتان(خەلیل عەبدوڵلا) دواتر(عومەر ریشاوی)یان کرد بە ئەمیندار تا دواتر بەهۆی دروستکردنی یەکگرتووی ئیسلامییەوە سەلاحەدین باهەدین خۆی بوو بە ئەمیندار و ئەوە ١٤ ساڵە هەر خۆی ئەمیندارە؟**

- هەندێ هەڵە لە پرسیارەکەتاندا هەیە، ئێمە لە(١٩٩٢)دا راپەڕینمان راگەیاند نەك(١٩٩٣).
بە نسبەت کاك خەلیل عەبدوڵلاوە ئەگەر مەبەستتان کاك خەلیلی بادینان بێ ئەوە یەکێ بوو لە ئەندامە چالاك و دڵسۆزەکانی رێکخستنمان لە بادینان هیچ کات نەمبیستووە پاڵێوراو

بێت بۆ ئەمینداری و مامۆستا عومەری ریشاویش(غەریقی رەحمەت بێت) ئەمیندار نەبووە، چ ئەوکاتــەی کە لــە ئێران هەردوو باڵەکە رێککەوتننامەمــان ئیمزاکرد لە (١٩٨٨)ەوە چ ئەوکاتەش کە لە(١٩٩٢)دا بە تەواوی لە یەکتر دابڕاین. لە(١٩٨٨)دا بەشـێوەیەکی کاتی و بۆ ئیدارەدانی رێکخسـتنەکە لە ئێراندا ئەنجوومەنێکی سەرۆکایەتی دروست بوو لە من و کاك سەلاح و مامۆستا ریشاوی- بە رەحمەت بێت- من بەرپرسی مەسەلە سیاسییەکان کاك ســەلاح بەرپرسی تەنزیم و مامۆستا ریشاویش بەرپرســی پەروەردە ئەوە بوو وەك لە پێشەوە گوتم بڕیار بوو ئێمە بە هەموو شـێوەیەك پابەندبین بە بڕیارو تەوجیهاتی ئەوانەوە لە ئێراندا کە هاتینەوە ئەمدیو ئەوانیش پابەندبن بە ئێمەوە، بەڵام وا دەرنەچوو(لســبب أو لاخر) کە لە یەکتریش دابڕاین لە (١٩٩٢)دا مامۆستا ریشاوی هەر ئەمیندار نەبووەو کاك سەلاح خۆی یەکەم بوو نە کاك ســەلاح و نە منیش لەبەر شــتی شەخسی نەبووە موناقەشە بکەین بەڵکو هەرکەسەو باری سەرنجی بەشێوەیەك بوو، من رێزم بۆ بۆچوونەکانی ئەو هەبوو ئەویش خوا هەڵناگرێ هەمیشــە رێزم لێ بینیووەو ئیتر ئەمــەش حیزبایەتیکردنە کەس ناتوانێ بە زۆر لەگەڵ ئەوی تردا حیزبایەتی بکات وەك لە لایەنە قەومییەکانیشدا هەیە، ئەو هەموو لایەنە دروست بووە کە سەرەتا هەموو هەریەك حیزب بوون و یەك سیاسەت بوون، بەڵام باری سەرنج و هەڵســەنگاندنی مەسەلەو هەڵویستەکان بوونە هۆی دروســتبوونی فرە لایەنی و ئەگەر کۆنترۆڵیش بکرێت، بە خێری خۆشـیان و میللەتەکەشـمان تەواو دەبێت و یەکێکیان گلانی نابێتە هۆی گوشانەوەو گلانی کێشەکەمان.

*** ســەلاحەدین بەهائەدین لە دیمانەیەکدا دەڵێ لە ســاڵی(١٩٨٩) لە ئێران منیان گرت، دەکرێ بۆمان باس بکەیت هۆکاری گرتنەکەی چی بوو؟**

- ئەو پرســیارە راست وایە کە لە کاك سەلاح خۆی بکرێت تەنیا ئەوەندە هەیە کە بەربوو، سەرم لێداو دڵخۆشی خۆمم بۆ دەربڕی بەبۆنەی بەربوونییەوە.

*** کە ئێوە راپەڕینتان دامەزراند، لەلایەك هەڵوێســتی بزووتنەوەی ئیســلامی چۆن بوو، لەلایەکی تریشــەوە هەڵوێســتی ئیخوانی عێــراق گلەیی و رەخنەیان نەبــوو، لە بەرامبەر دروستکردنی راپەڕینی ئیسلامی؟**

- کە ئێمە راپەڕینی ئیســلامیمان راگەیاند مایەی دڵخۆشـــی بوو بۆ ئیخوان یان راستتر بڵێم بــۆ ئەو برایانەی کە زۆر پابەندیان بۆ ئیخوان دەردەبــڕی، چونکە ئەگەر خوانەیکات بە گوناهـ لەســەرم وایان دەزانی ســەرکەوتوو نابین لــەو کارەداو، مومکین نییە کارێك کە هێزێکی وەك ئیخوانی لە پشــتەوە نەبێ سەرکەوتوو دەبێت، بەڵام الحمدلله و لە خوا بە زیاد

بێت دەرکەوت کە ســـەرکەوتنی کاری ئیسلامی پەیوەندە بە سێ شتی گەورەوە یەکەم نیازی پاك، دووهەم بیر پاك، ســـێیەم بەرنامەی پاك بەڵام، راستی بزووتنەوەی ئیسلامی کارەکەیان پێ باش نەبوو تەنانەت ئەوکاتە نامەیەکیان نووسی تێیدا داوا دەکەن یان هەر با ئیخوان بین یـــان با (بزووتنەوە)بین، بەڵام ئێمە ئەوکاتە وەك چۆن تێبینی زۆرمان لەســـەر ئیخوان هەبوو هەرواش تێبینی زۆرمان لەسەر بزووتنەوە هەبوو، بۆیە بە راستی ئەو دوو پێشنیارەی ئەوانمان بـــە شـــتێکی ورد نەئەزانی دواییش دەرکەوت روانینەکەی ئێمـــە وردترو واقیعی تر بوو، بە هەرحاڵ لە هەموو لایەکەوە ئێمە پاڵەپەســـتۆمان لەســـەر بوو بەڵام بڕوامان بەکاری خۆمان ئەوەندە پتەو بوو. هیچ فشارێك کاری تێ نەدەکردین و بەردەوام بووین لە بەرنامە دارِێژانی خۆمانداو ســـوپاس بۆ خوا توانیمان لەو ماوە کەمەدا کۆمەڵێکی رۆشـــنبیرو دڵسۆز بۆ دین دروست بکەین.

*** دەکـــرێ بزانین گرنگترین ئەو هۆکارانە چی بوون کە وای لە بزووتنەوەی ئیســـلامی کرد، چەندین گرووپی توندرەو لە ناو منداڵدانی خۆیدا دروســـت بکات، کە سەر ئەنجام بووە زۆر بێهێزکردنی خۆیشی؟**

- هۆی دروســـتبوونی گرووپی توندرەو لە بزووتنەوەدا دەگەرێتەوە بۆ زۆر شـــت: یەکەم/ بزووتنەوەی ئیسلامی لە پرێکدا ئەوەندە گەورە بوو، کە کۆنترۆڵکردنی ناوچەو مەڵبەندەکانی زۆر زەحمـــەت بوو بەو شـــێوەیەش چەندین کەس و مجامیعی هاتە ناو کە پێویســـتیان بە پـــەروەردەو نەقارِیکردن هەبوو تا بگونجێنرێ لەگەڵ ئامانج و سیاســـەتەکانی بزووتنەوەدا، دووهەم/ لە ئەســـڵی ســـەرکردایەتییەکەی بزووتنەوەدا دوو باڵی بەهێز هەبوو کە بەراســـتی هۆکاری گـــەورە بوون بۆ ئەوەی لە پەنای ئەم یان ئەو باڵەدا ئەو گرووپانە جێگەی خۆیان بکەنەوەو کاتێکیش ئیجرائات برِیار دەدرا دەرهەق فلانەکەس یان فلانە هێزو گرووپ بکرێ ئەویتریان هەوڵی پەکخســـتنی دەدا بەوشێوەیە کێشەکان هەر دەمانەوە. سێیەم/ دەستی ئەملاو ئەولاش زۆر لە کاردا بوو بۆ ئەوەی بزووتنەوە شـــەکەت و ماندوو بکات و نەیپەرژێتە ســـەر گەشـــەی دەرەکی و هەر بە ناوخۆیەوە ســـەرقاڵ بێت و، هەرچی هێزی هەیە لەو ململانێی ناوخۆییانەدا ســـەرفی بکات، بە هەرحاڵ بوونی خەت و باڵ لە هەموو حیزبێکدا هەیەو ئەو خەت و باڵانەش دەبنە سەرەخۆرەی حیزب و دەوڵەتان لە جیهانداو بزووتنەوەش لەو هاوکێشەیە تەریك نەبوو((انا لله وانا الیه راجعون)).

*** نووســینەکانی ســەید قوتب و عەبدولسەلام فەرەج و حەســەن بەنات بەلاوە باشترە یا نووســینەکانی محەمــەد عەبــدەو جەمالەدینی ئەفغانــی و عەبدولڕەحمــان کواکبی؟وە لەبەرچی؟**

- جیاوازییەکــی زۆر لــە نێوان نووســینەکانی ئەو دوو بەرەیەدا هــەن بەرەی ئیصلاحی کۆمەڵایەتی جەمالەدین و محەمەد عەبدەو کواکبی، بەرەی ئیصلاحی سیاســی حەســەن ئەلبەناو سەید قوتب و محەمەد فەرەج..

بەرەی یەکەم جیلی هەشت ســەدەکانن ئەوکاتەی کە دەوڵەتی عوسمانی هەبووەو جڵەوی سیاسەت لە دەست موسڵماناندا بووەو ئەمان زیاتر پرۆژەی ئیصلاحی فیکری و کۆمەڵایەتییان هەبووەو جار جارەش پرۆژەی سیاسی و راگەیاندنیان هەبووە بۆ ئەو مەیدانەش وەك(کواکبی) و بەتایبەت لە کتێبی(گبائع الاســتبدادو مصارع الاستعباد)دا بەڵام حەسەن ئەلبەناو سەید قوتــب تارادەیەکیش محەمەد فەرەج خاوەنی پرۆژەیەکی شــمولی بــوون زیاتر هەوڵیان بۆ ئیصلاحی کۆمەڵایەتی و سیاســی بووەو کاریان بۆ ئەوە کردووە، کە جڵەوی سیاسەت سەر لە نوێ بگەڕێتەوە دەســت موســڵمانی مولتەزیم. محەمەد فەرەج کەمتر خاوەنی پرۆژەی سیاســی بووە، ئەو پیاوە بە حوکمی ئەوەی پیاوێکی عەسکەری بووە زیاتر بڕوای بە کودەتا و گۆڕینی لە(رأس)ەوە بۆ(قاعدە) هەبووە بەڵام، هەریەك لە حەســەن ئەلبەناو سەید قوتب بڕوایان بە گۆڕینی لە قاعدەوە بۆ رأس بووەو لە کتێبەکانیشیاندا ئەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێ.

من خۆم سوودم لە نووسینی هەردوو بەرە وەگرتووە بە گوێرەی پێویستی کار.

*** عەلی باپیــر دەڵێت ئێمە بۆیە لە بزووتنەوەی یەکبوونی ئیســلامیش چووینە دەرەوە، چونکە مامۆســتا مەلا عەلی رابەری بزووتنەوەمان بۆ پابەند نەدەکرا بە شوراو بە بەرنامە، بەڕای بەڕێزتان ئایا هۆکاری راستەقینە ئەمە بوو یان هۆکاری دیکە هەبوون؟**

- شــتەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو، ئەســبابی زاتی و مەوزووعــی زۆر هەبوو بۆ ئەوەی یەکبوونی ئیسلامی هەڵبوەشێتەوە.

*** دەڵێن لە ناو ئیخواندا هەمیشــە بەڕێزت لەگەڵ ســەلاحەدین باهەدین ناکۆك بوویت؟ دەکرێ هۆکاری سەرەکی ئەو ناکۆکیانە بزانین؟**

- چ من و چ کاك(ســەلاح)یش موناقەشەمان لەسەر شتی شەخسی نەبووە، ململانێمان بــۆ ئەوە نەبووە یەکترمان خۆش ناوێ یان خوانە خواســتە رقمان لە یەکترییە، ئێمە خەڵکی ناوچەیەکین و لە زۆر رێگەوە پێکەوە پێچراوین و لەسەرووی هەمووشیانەوە ئێمە موسڵمانین و الحمدلله بە چاوی رێزەوە بۆ یەکتری دەڕوانین جیاوازی بیروڕاش لەســەر چۆنێتی کاری

ئیســـلامی بووە، ئەو بەشێوەیەك بیری دەرکردەوەو منیش بەشێوەیەکی تر، هەردووکیشمان دوو کەسی-ئیخوانی- بووین و تەعبیرمان لە مەدرەسەی ئیخوان دەکرد، بەڵام ئەوە بوو لە کۆتاییدا ئیخوان زیاتر لە بیرکردنەوەی کاك ســـەڵاح مورتاح بوون و خۆشـــیان لە بیرکردنەوەی ئێمە نە ئەهات و ئەویان بە رەســـمی ناساندو ئێمەش نەمانتوانی دەستبەرداری بیرو بیرکردنەوەی خۆمان ببین و ئەو رەســـمییەتی ئیخوانی پێـــدراو، ئێمەش لەژێر ئەو لافیتەدا هاتینە دەرەوەو راپەڕینمان راگەیاند ئێســـتاش الحمدالله ئەوپەڕی رێزمان بۆ یەکتری هەیەو براو دڵسۆزی یەکترین و بە تەنگی یەکەوەین.

*** بۆچی بەڕێزت کە لە بەرپرسە گەورەکانی ئیخوان بوویت نەتتوانی ئیخوان بەلای خۆتدا رابکێشـــی، کەچی سەڵاحەدین بەهادین بەهۆی دروســـتکردنی یەکگرتووەوە توانی پەرە بە ئیخوان بدات، لەکاتێکدا راپەڕینی ئیسلامی پێش یەکگرتووش دروست بوو؟**

- وەڵڵاهی مەســـەلەی ئەوەی ئێمە بۆچی نەمانتوانی ئیخوان بەلای خۆماندا رابکێشین هۆی زۆری هەیە، هەندێکیان پێشتر باسم لێوەکردن لە وەڵامەکانی پێشوودا، بۆ ئەوەی مێژوو چەواشەکاریشـــی تێدا نەکرێ پێویستە بڵێم: کاك سەڵاح دۆستایەتی تایبەتی لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد راشد هەبوو، ئەویش کاریگەری زۆری لەسەر بڕیاری ئیخوان هەبوو، بەو پێیە راشد رۆڵی گەورەی لەو وەرچەرخانەدا هەبوو(ســـامحەاللە) ئامادەی ئەوە نەبوو ورد لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوەو (تأنی) بکات، ئەگینا مامۆســـتا مستەفا مەشهور کە رێبەری گشتی ئیخوان بوو، ئەو لە مەسەلەکان زوو حاڵی بوو، تەکلیفیشی کرد کە ئێمەش هەر بە سەربەخۆیی کار بکەین و تەعبیر لە مەدرەســـەی ئیخوان بکەینـــەوە بەڵام ئەو(تجاڑبات)انە بە ئێمە نەدەکراو حەزمان بەوە بوو یان یەکرابین و کاری جدی بکەین یان با هەرکەســـەو ئیتیجاهاتی خۆی مومارەســـە بکات ئەوەبوو، ئێمە خۆجێیەتیمان بە ســـەرکەوتووتر زانی و دەستبەرداری ناو و رەســـمییەتی ئیخوانی بووین چونکە بەڕاســـتی هەرچەندمان دەکرد نەماندەتوانی ئەو(سمع وگاعە)یەی کە ئیخوان داوای دەکات پێڕەوی بکەین و ئەوانیش رەسمییەت بە کەسێك دەدەن کە(سامع و مگیع) بێت بۆیان لە هەموو شتێکدا.

*** ئایا راســـته له ئایاری ٢٠٠٠ که لهگهڵ بزووتنهوهی ئیسلامی یهکتان گرت، لهژێرهوه جــۆره تهحالوفێك لهگهڵ عهلی باپیردا ههبــوو بۆ کۆنگره له دژی مهلا عهلی برات، ئهو تهکهتولهش بوو که بووه هۆی لێکههڵوهشــانهوهی یهکبوونی ئیسلامی؟ دهکرێ بزانین ئهمه چۆن بوو؟**

- پرســـیارهکه چهند ههڵهیهکی تێدایه، یهکهمیان دروستکردنی یهکبوون ساڵی ١٩٩٩ بوو نهك ساڵی (٢٠٠٠) دووههمیان من لهژێرهوه تهحالوفم نهکردووه دژ به مامۆستا مهلا عهلی، کاك مهلا عهلی باپیریش شــتی وای نهکردووه، بهڵکو مامۆستا مهلا عهلی بهڕای گشتی پێش کۆنگرهو لهناو کۆنگرهشـــداو پاش کۆنگره ههموو قبوڵیان بووه که رابهری گشتی بێت و کهس کێشهی نهبووه لهگهڵیدا وهك کهسی یهکهم و رابهری ئهو حیزبه، بهڵکو کێشه لهسهر غهیری ئهو بــوو جۆرێك لهبێ ویژدانی ههبوو لهلایهن خهڵکانێکهوه بهرامبهر کهســانێکی ماندوو لهناو بزووتنهوهی کۆندا، ئهوه وایکرد که رهوتێکی توند دروست ببێت بهرامبهر ئهوانهو ههر ئهوهش بووه گۆڕههڵکهنی یهکبوون. ههرچهنده بۆ مێژوو بیڵێم پاش کۆنگره ههوڵی چاك درا بۆ پهیوهستکردنهوهی یهکبوون و پرۆژهیهکی (تهوافوقی) ئیمزاکرا، کهچی بهڕاستی هۆی تری له ئیرادهبهدهر نهیهێڵا ئهو ههوڵه سهربگرێ و ئهوهی لێکهوتهوه که گشتی دهیزانێت.

*** راســـته جیابوونهوهی کۆمهڵی ئیســـلامی له یهکبوونی ئیسلامی دهستی حکومهتی عێراق (بهعس)ی تێدابوو؟ ئهی ههڵوێستی ئێران چی بوو؟**

- من وهڵڵاهی ئهم پرســـیارهم لا نییهو داهاتووش زامنی وهڵامدانهوهی ئهم پرســـیارهیه تا راستی و ناڕاستی ئهو مهسهلهیه دهربکهوێت.

*** له ســـهردهمی دیموکراســـی و مافی مرۆڤ و ئازادی سیاســـیدا تا چهند بڕوات به دروستکردنی ئیمپراتۆریایهکی وهکو هی عهباسییهکان یا عوسمانییهکان ههیه؟**

- ئهمه پرســـیارێکی سهیره، هیچ (موشریك) نییه بۆ ئهوهی پرسیاری وا بکرێت، جارێ دهوڵهته ئیسلامییهکان سهد پارچهن، ههر دهوڵهتهش جۆرێك بیرکردنهوهی ههیه، یهکناگرێتهوه لهگهڵ ئهوی تریاندا، ئهوهته تهنانهت دانیشـــتنی لوتکـــهی عهرهبیش له نوخبهی دهوڵهته ئیســـلامییهکانه کهسیان شان به شانی ئهویتریان ناهێنێ، ئیتر دهبێ کێ ئهم ئیمپراتۆرییهته ئیســـلامییه دروســـت بکات. ئێ خۆ میللهتهکانی ئیســـلامیش کاندیدنین بۆ کارێکی لهو شێوهیهو جهماوهرو میللهت ئهگهر دهوڵهتێك یان بزاڤێکی ئیسلامی ههڵیان نهسووڕێنێ چیان پێ دهکرێت، لهولاشـــهوه بزووتنهوه ئیســـلامییهکانی دونیای ئیسلامی ههمان دهردو بهڵای دهوڵهته ئیسلامییهکانیان گرتووهو کهسیان مل بۆ ئهوی تریان نادات و تهنانهت ئامادهش نین

هەماهەنگی لە هەڵوێستەکانیشـیاندا بکەن سـوحبەتیان بە پرۆژەی یەکبوون و یەك حیزبی دێت. دەی ئیتر دەوڵەتە ئیسلامییەکان و بزووتنەوەی ئیسلامییەکان و میللەتانی ئیسلامیش کاندیدو مورەشـح نەبن بۆ ئەو کارە ئیتر ئەم پرسیارە لە پای چی خۆ ئەگەر هەندێکیش وا بزانن ئێران لە خولیای پرۆژەیەکی لەو شـێوەدایە ئەوە من بزانم ئێران وەها بیرناکاتەوە، لەبەر ئەوەی لە ناو دونیای سونەدا ئەوان ئەکسەرییەت نین و لە ناو دونیای سیاسەتی دەوڵەتیشدا هەزارو یەك دوژمنیان هەیەو نایەڵن بیر لە شـتی وابکەنەوە و ئێران ئێستا سەدان هەڕەشەی لەسـەرەو ئەوەتا یەکێکی وەکو ئیسـرائیل هەڕەشەی سـووتاندن و تواندنەوەی ئێران دەکات زیاد لەمانەش چەرخی ئیمپراتۆرییەت و بلۆك دروسـتکردن بەسـەرچووەو ئەمڕۆ مۆدێلی بچووککردنەوەی قەوارە گەورەکانە نەك یەکخستنی قەوارە بچووکەکان یان گەورەکان.

*** پێتوانییـە هەڵەبجە ئەگەر بەعس کیمیابارانی کرد، بەڵام بزووتنەوەی ئیسـلامیش لە دوای راپەڕین دەستی بەسەرداگرت و بەرەو ماڵوێرانی برد؟**

- مێـژوو بێ لایەنە، ئەوەی من لە نزیکەوە ئاگادارم کاتی خۆی کاکە عوسـمانم، زۆر راشـکاوانە دژایەتی گرتنی هەڵەبجەی کرد و نووسـراوی تایبەتیشی نووسی و بە رەسمی ئێرانـی ئاگادارکرد کە هەوڵی گرتنی هەڵەبجە نەدات چونکە عێراق و حیزبی بەعس ئەوە قبوڵ ناکات و دڕندانە تۆڵە دەکاتەوە لەو خەڵکە هەژارە، بەڵام ئێران هەر سـووربوو لەسـەر گرتنی هەڵەبجە ئەوەبوو ئەوە روویدا کە روویدا، پاشـان دەبـێ تاوانی ئاوەدان نەکردنەوەی هەڵەبجە پاش راپەڕین بخرێتە ئەستۆی ئیسلامییەکان یان بزووتنەوەی ئیسلامی...

جارێ یەکەم ئیسلامییەکان هێزێکی بەشداری ناو راپەڕین بوو دووهەم/ هێزێکی بەشداریش بوو لە دروسـتکردنی قەوارەی کوردی و پەرلەمانی کوردسـتاندا، پاشان بەسەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکانیش رازی بوو هەرچەندە بە ئاشـکرا بێ ئینصافی کرا بەرامبەری و هێزێکی گـەورەی وا پەراوێز خرا، سـێیەم/ لە حکومەتەکاندا بەشـداربووەو وەزارەتی هەبووەو کاری باشیشـیان نەکردبێ خۆ کاری گەندەڵی و خراپیان نەکردووە لەو کابینانەدا لە شـەڕەکانی ناوخۆشدا کە ئەگەر تاوان بووبێت قاچی هەمووی پێوەبووەو بزووتنەوە تاکە حیزبێك نییە ئەو لێقەومانەی بەسەردا هاتبێت لە درێژایی دەسەڵاتی بزووتنەوەشدا بەسەر هەڵەبجەدا بزووتنەوە یـان لە کابینەی حکومەتی هەولێردا بووە یان لە کابینەی حکومەتی سـلێمانیدا بووەو ئەو حکومەتانە خاوەنی ئیدارات و بڕیار بوون سـەبارەت بـەو ناوچەیە، ئیتر چۆن بزووتنەوەی شەریکی حکومەت بێت لەولاشەوە تاوانی ئاوەدانکردنەوەی هەڵەبجە بخرێتە سەر ئەو؟! ئەمە جۆرێك بێویژدانی تێدایە. لەسـەرووی ئەمانەشـەوە ئەگەر بزووتنەوە(وارداتی کوردستان و

وارداتی بڕیاری نەوت بەرامبەر خۆراك) لەبندەســتدا نەبووبێت و لە دوورو نزیك مەشوورەتی پێ نەکرابێت و تەنانەت بۆ (تەوریتکردنیش) بێت جارێك، پرۆژەیەکی ئاوەدانی پێ نەسپێردرا بێت لە ناوچەکەدا تا بزانرێ ئەوانیش ســەرکەوتوو دەبن یان گومرگی ئەو پرۆژەیە دەکەن، ئەی ئیتر دەبێ بزووتنەوەی هەژار بەچی ناوچەکە ئاوەدان بکاتەوەو ئەو شــارە هەڵسێنێتەوە سەر پێی خۆی!! خۆزگە وای لێدەهات ئینصاف بوایە لە سەنتەرەکانی بڕیار دووردەخرایەوە. لەگەڵ ئەوانەشــدا لەکاتی بزووتنەوەو دەســەڵاتی بزووتنەوەدا خەڵك لــە ماڵ و منداڵ و ناموســی خۆی ئەمین بوو. هەر پرۆژەیەکی ئاوەدانیش لەو ماوەیەدا بە ئەنجام گەیشتبێت بێ کێشــە تەواو بووە، وەك دروســتکردنەوەی گەڕەکی کانی عاشــقان و دروستکردنەوەی گەڕەکی مامۆســتایان و کەسیش شك نابەم دەســتی وەردابێتە ئەو کارانەو خزمە خزمێنەی کردبێت، یان حیزب حیزبێنەی کردبێت. پاشان ئەوە چەند ساڵە بزووتنەوە دەسەڵاتی عەمەلی نەماوە لە هەڵەبجەدا کەچی هەر مەحرومییەتی زیاد دەکات و کاریش گەیشــتە ئەوەی لە تاو بێ وەزعی خەڵك مینۆمێنتەکەشــیان ســوتاندو فشاری نارەزاییان هێنا بۆ حکومەت و کاربەدەستان. ئێستاش من حەز دەکەم لێرەوە ئەوە رابگەیەنم کە با حکومەتی هەرێم تەفعیلی بڕیــاری بە پارێزگابوونی هەڵەبجە بــکات وەك لە بڕیارەکانی پەرلەماندا هەیە، چونکە خۆ ئەوە بڕیارەو نە خەڵك خەڵەتاندنە و نە خۆڵ کردنە چاوی خەڵکی هەڵەبجەیەو نە گاڵتەکردنە بــە پەرلەمان و بڕیارەکانی پەرلەمان. با ئەگەر ئەو بڕیارەش جێبەجێ ناکرێ با هەنگاو بۆ هێنانەدی مەرج و بنەماکانی بڕیارەکە هەڵبگیرێت. چونکە بەڕاســتی هەڵەبجە شایشتەی ئەوەیە کە ئەوەی بۆ بکرێت چونکە قوربانیدانی ئەو شارەو خزمەتی بە دۆزی لەو ئاستەدایە هەموو شتێکی بۆ بکرێ. با بۆ نموونە زانکۆیەکی تێدا بکرێتەوە، چەند بەڕێوەبەرایەتییەکی گشــتی ببرێتە ئەوێ و ناوبنرێن بەڕێوەبەرێتی گشــتی هەڵەبجە نەك(شارەزوور)، هەروەها جادەو بانەکانی وا لێ بکرێت رووی ئەوەی ببێ دوو میوانی بۆ بەرێت نەك میوان لە دەرەوە بێت و لە ســلێمانی یان لە هەولێر ئاهەنگیان بۆ بکرێت و بە رەســم هەڵەبجە ببینن و قــەی لەســەر بکەن، با چەند کارگەیەکی گەورەی تێدا بکرێتەوە وەك کارگەی رستن و چنین یان کارگەی بەردوکاشــی و چانسی ئیشکردن بۆ رۆڵەکانی ئەو شارە دروست ببێ، ئیتر بەسە ئەوەندە لۆمەکردنی هەڵەبجەو خەڵکی هەڵەبجەو پەردەپۆشکردنی کەمتەرخەمی بەرامبەر ئەو شارە قارەمان و شەهیدە بەبوونی بزووتنەوە یان گابقی دینی ئەو ناوچەیە هەر لێرەشەوە داوام لە دەســتەڵاتدارانی هەرێم ئەوەیە ئەوانەی تائێستاو بەردەوام گیرۆدەی بەرکەوتنی کیمیاوین ببرێنە دەرەوەی وڵات و چارەسەریان بکرێت چونکە رۆژانە کەسی تازەیان لێ دەمرێت.

*** پێتوایـــە پەیوەندی نێوان کۆمـــەڵ و بزووتنەوە دەگاتە ئەو قۆناغەی کە لە ئایندەیەکی نزیکدا ببن بەیەك یان یەکگرتنی حیزبە ئیســـلامییەکان زۆر زۆر ســـەختترو ئاســـتەمترە لە یەکگرتنی حیزبە نەتەوەییەکان؟**

- بەپێی ئەزموونی ئەم چەند ســـاڵەی کە رابردووە، من وای بۆ دەچم کە یەکگرتنی هێزە ئیسلامییەکان لە کوردســـتاندا ئەگەر ئەستەم نەبێت ئەوە دوورەو شتی وا نزیك نییە، جارێ ئەوانەی کە ئێستا لە کاردان لەناو ئەو دوو حیزبەدا ئەوە ئەو کارانەیان پێ ناکرێ لەبەر زۆر ســـەبەب، ئەوانەش لە کەناردان و لەبەر هۆیەك یان زیاتر دووریان لێگرتووە، ئەو کارەیان پێ ناکرێ لەبەر زۆر هۆ بەڵام مومکینە جۆرێك لە هاو هەڵوێســـتی دروســـت ببێت کە بەڕای من هەر ئەوەش راســـتە و یەکگرتن و توانەوە لە ناو یەکتریدا ئەمڕۆ زەمینەکەی ساز نییەو رووداوی زۆر چاوەڕوانـــی ئـــەم ناوچەیە دەکات، فرە حیزبی لە کاری ئیســـلامیدا مایەی زیندوێتییەو مایەی نەمردنی کێشەکەشـــە کاتێك، کە حیزبێکی ئیســـلامی تووشی گلان و محنە دەبێت. حیزبە ئیسلامییەکانیش دەتوانن وەك حیزبە ناسیۆنالیزمەکان لەسەر هەڵوێستی موشتەرەك رێکبکەون و نە شبن بە یەك ئەگەر لەو هەمووە ئەدەبیاتە ئیسلامییە وەری ناگرن کە داوای یەك هەڵوێســـتی و یەك رایی دەکەن ئەوا با لە هێزە نەتەوایەتییەکان وەری بگرن و چاویان لێ بکەن.

*** ئایندەی یەکگرتوو لە کوردستان کە بەرنامەیەکی ئیخوانییە باشتر دەبێ یان بزووتنەوەو کۆمەڵ ئایندەیان باشتر دەبێ چونکە خۆیان بە مۆرکی کوردایەتی دادەنێن؟**

- وەڵامی ئایندە با ئایندە بیداتەوە.

تێبینی/

١- داوای لێبوردن دەکەم لەبەر هەندێ سەرقاڵی وەڵامەکانتان دواکەت.

٢- ئومێدەوارم وەك خۆی بڵاوبکرێتەوە.

# دیمانەی
# عوسمان ئۆجەلان



عوسمان ئۆجەلان جگە لەوەی برای عەبدوڵلا ئۆجەلانە، هاوکات لە دوای گرتنی براکەی بووە کەسی یەکەمی ناو PKKو، هوتافی بەرخودان و شۆڕشگێری بە گوێی دونیادا دەدا، بەڵام دواتر رووبەڕووی ســزای لەسێدارەدان بووەوە ئیتر ئەو حیزبەیشی بە جێهێشت و، ژیانێکی زۆر سادەی هەڵبژارد کە لە ژیانی هیچ سەرکردەیەکی ئەو سەردەمەی رۆژهەڵاتیی ناچێت.

عوســمان ئۆجەلان تێڕوانینەکانی بۆ سیاســەت و بۆ ژیان سەدا سەد پێچەوانەی سیاســەتی PKKیە، ئەو زۆر واقیعبینە و ژیان و دەوروبەرو گۆڕان و پێشهاتەکان وەکو خۆی دەبینێت کە هەیە، بەڵام گرفت بۆ PKKش دروست ناکات و تەنانەت بۆ ئەمرۆ حەز بە لاوازبوونیشیان ناکات، چونکە لەبەرامبەر رژێمی تورکیا رق ئەستوورە و رێگەچارەکانیشــی بۆ ئایندەی خەبات لە کوردســتانی باکوور هاوســەردەمانەن، حەزدەکات ببێتە خودان حزبێکی سیاســی، بەڵام زەمینــەی ئەوجۆرە حیزبە بۆ ئەو هێشــتا لەبار نییە، حەزیشی لەوەیە راگەیاندنی کوردی گرنگی پێ بدات، هەمیشە ئامادەیە بۆ هەڤپەیڤین و دیمانە، لەگەڵ ســەرکردایەتی کوردی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش خۆی گونجاندووەو گرفت دروست ناکات. پێم وایە ئایندەی کوردستانی باکوور بۆ ئەو جۆرە ســەرکردانە دەبێت کە دەتوانن واقیع بخوێننەوە، دوور لە دروشم و دروشمکاری رووت و قووت.

*** کاك عوسمان ئۆجەلان بەرلەوەی ببیت بە PKKئینتیمات بۆ هیچ هەبوو؟**

- من لە تەمەنی گەنجییەوە لە ناوە PKKبووم. ساڵی حەفتاکان بەدواوە رەوشێکی سیاسی بەمجۆرە هەبوو، ئەوکات بزاڤی شۆڕشگێڕی هەبوو. لاوانی خوێندکار بەشێکی زۆریان لەنێو ئەم رێکخستنە بەشداربوون.

بزاڤی شۆڕشـــگێڕی لە تورکیا تۆزێك کاریگەری لەســـەر ئێمە هەبوو. لە تەنیشت ئەمە یاخود هاوکات لە کوردستانی ئێراق بزاڤی شۆڕشگێڕی بەسەرۆکایەتی بارزانی نەمر بەردەوام بوو. شـــەڕ لە ئاستێکی زۆر گەرم و لە پێشدابوو. هەموو کەس گوێی لە شۆڕشی بارزانی نەمر بوو. ئەوکات بزاڤی نەتەوەیی کوردستانی ئێراق کاریگەری لەســـەر هەموو کوردان هەبـــوو. منیش یەکێك بووم لەم گەنجانـــەی کە کاریگەری بزاڤی شۆڕشـــی بارزانی نەمرمان لەسەر بوو. کوردایەتی ئەو کات بە مەلامستەفای رەحمەتی دەناسرا.

*** باشـــە، ئاپۆ پێش ئەوەیPKKدروســـت بکات، بیروبۆچوونی سیاسی یاخود ئینتیمای سیاسی هەبوو؟**

- ئاپۆ تا ساڵی ١٩٦٨هێڵێکی ئیســـلامی هەبوو خۆشەویستی بۆ سەعید نورسی بوو، لە تورکیا بەشێوەیەکی گشتی تا ساڵی ١٩٧٠ ئیسلامییەکان ئۆپۆزسیۆن بوون، لە دامەزراندنی کۆماری تورکیا سێ هێز هەبوو، هێزی کەمالیستەکان، هێزی ئیسلامی، هێزی نەتەوەیی کورد بوون. وەکو دەزانرێت هێزی نەتەوەیی تورك کەمالیست بوون وبە هێزی دەســـەڵات زوڵمیان لە ئیســـلامی و کورد دەکرد. ئیسلامی و کوردەکانیـش ئەو کاتەی دەرفەتیان هەبوایە دژایەتی رژێمیان دەکرد، بەڵام ئیســـلامییەکان لە کوردەکان بەهێزتر بوون، ئەو کاتیش ئیسلامییەکان بەفیکری بەدیع زەمان، سەعیدی نورسی، کە ئێستا ئەردۆغانیش سەر بە هەمان رێبازە. سەعید نورسی خۆی خەڵکی بەدلیسە.

*** واتا عەبدوڵلا ئۆجەلان بڕوای بە سەعید نورسی هەبوو؟**

- تا ســـاڵی ١٩٦٨ بڕوای بە سەعید نورســـی هەبوو، ئۆپۆزسیۆنێکی ئیسلامی بوو.

*** کەی بڕوای عەبدوڵلا ئۆجەلان گۆڕانی بەسەرداهات؟**

- لە ئەنقەرە، لە ئەســـتەمبۆڵ لە گەورە شـــارەکانی تورکیا، بەتایبەتی لە زانکۆ بزاڤی شۆڕشگێڕی چەپ پێشدەکەوت. لەگەڵ خوێندکارەکان گفتوگۆی دەکرد، لەنێو ئەم گفتوگۆیانە دەســـتی لە ئیسلامیەت بەردا، سەرەتا چەپ بوو بەڵام کورد نەبوو،

واته نەتەوەیی نەبوو. دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧١ کەوتە زیندان بۆ ماوەی (٧) مانگ لە زیندان مایەوە، لە زیندان لەگەڵ بیری چەپن بیری کوردایەتیشی پێشکەوت.

*** باشــە کە بڕوای بە چــەپ هەبوو چۆن بوو نەدەچووە ریزی حزبی شــیوعی تورکیا؟**

- لە تورکیا کەســێك چەپ بێت و شۆڕشــگێڕ بێت بە چاوێکی ســووك سەیری کورد دەکەن، دانیشــتویەکی شاری ئورفا بچێتە شارێکی گەورەی تورکیا بخوازێت و نەخوازێت خۆ بەکەم دەبینێت، خۆی بەمەغدوور دەبینێت، بەڵام چەپی تورکیا و حزبی شــیوعی و گروپی شۆڕشگێڕی دیکە بۆ چارەسەری کێشەی کورد نەدەبوونە وەڵام. ئاڵای نەتەوەی کورد مەلامســتەفای ئەمــر بەرزی دەکردەوە ئەمەش هەر وەکو چۆن کاریگەری لەسەر من هەبووە لەسەر بەڕێز ئۆجەلانیش کاریگەری هەبووە.

*** باشە بۆچی عەبدوڵلا ئۆجەلان ئەوکاتەی لە زانکۆبوو دەیخواست لەگەڵ گەنجە تورکەکان حزب دروست بکات، کەچی لەگەڵ گەنجە کوردەکان ئەم هەوڵەی نەدەدا؟**

- وەکو من گوتم ئاپۆ لە ســاڵی١٩٦٨بیری شۆڕشــگێڕی وەرگرت و قبوڵیکرد، ئەوکاتەیــش کە ئەو بووە چەپ، بەشــێکی زۆری هەڤاڵەکانــی تورك بوون هەروەها چەپیش بوون. لەبەر ئەمەش زیاتر لەگەڵ تورکەکان دانوستاندنی هەبووە.

*** ئەو دۆستی شۆڕشگێڕی کوردی نەبوون؟**

- لەگەڵ ئەوانیش دانوســتاندنی هەبوو، بەڵام هەندێك فکــری جیاوازی هەبوو. لە کوردســتانی تورکیا ئەوانەی کورد بوون (مەبەســتی لە خوێندکارەکانە)- شەڕی چەکدارییان نەدەخواست، بەڵام ئەو هەڤاڵە تورکانەی کە بەشێکیان شەهید بوون شەڕی چەکدارییان قبوڵ دەکرد، ئاپۆ لە سەرەتادا دەیزانی بەبێ شەڕی چەکداری شۆڕش لە کوردستان پێش ناکەوێت. کورد چەندین گروپی وەکو(DDKD) ناوەندی رۆشنبیری و کەلتووری (شۆڕشــگێڕی رۆژهەڵات) هەبوو دواتر بوونە چەندین پارچە، شەڕی چەکدارییان نەدەخواست. ســاڵی١٩٧٥ئەوکاتەی گروپی خەباتی نەتەوەیی دەرکەوت وPKK و کاوە شــەڕی چەکداریــان قبوڵ دەکرد، ئەوانی دیکە لە دژی شــەڕی چەکداری بوون.

*** ئەوکاتەی PKK دروست بوو هەروەها پێش ئەوەی دروستیش ببێت میتۆدەکەی خەباتی نەتەوەیی (کوردایەتی) بوو، پرسیار ئەوەیە تورك بۆچی دەهات بەشداری لەو خەباتە بکات؟**

- ئەوان تورك نین، ئەو هەڤالانەی لەگەڵ ئاپۆ بەشـداریان دەکرد ئەگەر سـەیری ڕەچەڵەکیـان بکەیـن، دەبینین ئەوان تورك نین، بۆ نموونە حەقـی قەرار دەتوانم بڵێم جێگری ئاپۆ بوو شۆڕشـگێڕێکی زۆر ئازا بوو، لە ئەنجامی پەلاماری سیخوڕێکی تورکیا لە ١٧ -٥- ١٩٧٨شـەهید کرا،، خۆی خەڵکی شاری ئوردیە. ئوردیە خەڵکی لازی تێدایـە، ئەوانی دیکە شۆڕشـگێڕی بەناوودەنگ کەمال پیر هەیە. کەمال پیر خەڵکی گونووش خانەیە، خەڵکـی گونووش خانە گورجین. ئەوانەی لەناوPKKدا پێیان دەگوترێت تورك یەکێکیان تورك نین. یان لازە یاخود گورجیە یا چەرکەزن.

*** ئەی دووران کالکان تورك نییە؟**

- دووران کالـکان تورکە خەڵکی ئەدەنەیە، بەڵام وەکـو حەقی قەرار و کەمال پیر نییە، زۆر جار ئەمانە وەکو دووران کالکان حیساب دەکرێن، با نموونەیەك بهێنم، حەقی قەرار و کەمال پیر رێزێکی شایستەیان لەبەرامبەر گەلی کورد هەبوو. سنووری خۆیان تێنەدەپەڕانـد، بۆ نموونە حقی قەرار بەردەوام خزمەتی دەکرد. ئێمە لە ماڵێك لەگەڵ حەقی قەرار بەیەکەوە بوویـن وێڕای ئەوەی کاری دەکرد کە دەگەڕایەوە ماڵەوە پێش هەمووان خواردنی دروسـتدەکرد، ماڵی پاك دەکردەوە، کەمال پیر یەك شتی دەگوت: دەیگوت قسەکردن بۆ ئاپۆیە، ئێمە تەنیا جێبەجێی دەکەین، کەمال پیر کەسێك بوو رێزی لـە گەلی کورد دەگرت، بەڵام دووران کالکان وەکو ئەشـقیا (یاخیبوو-چەتە- رێگر) بیەوێت ئەو ماڵە زەوت بکات، بڵێ ئەو ماڵە هی منە و خاوەن ماڵ لە ماڵ دەربکەیت، من دەتوانم بڵێم ئەو تەبیعەتەی کە (دووران کالکان) لەنێو شۆڕش کاری پێوەدەکات لە ١٠٠٪تورکانەیە. هەموو کەس دەزانێت کە تورك لە ئاسیای ناوین هاتوون.

*** دووران کالکان لەنێوPKKلایەنگری جەماوەری هەیە؟**

- کەمە زۆ کەمە، دەتوانم بڵێم لە ٥٪زیاتر نابێت. ئەوانە وەکو تورك لە ئاسیای ناوین هاتوون ئەنادۆلیان داگیرکرد و خەڵکی ئێرمیان دەرکرد، دووان کالکانیش لەنێو PKKدا بەمشـێوەیە هاتووە لەنێو کوردان شوێنی وەرگرتووە و کوردان دەردەکات. دووران کالکان ناخوازێت لەگەڵ کوردان بژیت.

*** ئەو دامەزرێنەری PKKیە؟**

- دامەزرێنەری PKKە یە، ئەگەر دووران کالکان هێزی خۆی هەبێت دڵنیابە ئاپۆ لەنێو PKKدەرکات، بەڵام ئەو هێزو توانایەی نییە.

*** باشــه کاك عوسمان پێش ئەوەی PKKدروســت بێت ئێوە جموجۆڵی سیاسیتان هەبوو، ئاپۆو، جەنابت و ئەندامانی دیکەی ماڵەوەتان، هەڵبەت تۆ تاڕادەیەك ئاگادار بوویــت کە عەبدوڵلا ئۆجــەلان دەخوازێت حزبێك دروســت بکات؟ئایا ئەو کاتە هیچ شتێکی لای تۆ باس دەکرد؟**

- بنەماڵەی ئێمە بنەماڵەیەکی سیاســی نیــن، پێش من و ئاپۆ لە بنەماڵەی ئێمە کەس کاری سیاســی نەکردووە. بەڵام یەك شــت هەبووە بنەماڵــەی ئێمە پەیوەندیان لەگــەڵ تورکان خــۆش نەبووە. زیاتــر پەیوەندیان لەگەڵ ئەرمەنیان خۆشــبووە. لە ناوچەکەی ئێمەدا پێشتر ئەرمەنی تێدا ژیاون، گوندەکەی ئێمە لە سێ لاوە بە گوندی ئەرمەنییەکان دراوســێیە، یەکێك لەم گوندانە ئەرەح- ی پێدەڵێن. ئەوەی دیکە(چین) ئەوەی تریان(عەینێ) ئەم گوندانە لە بنەڕەتدا ئەرمەنی بوون، بەڵام لەســاڵی ١٨٨٠ بەدواوە تورکەکان ئەرمەنیەکانیان دەرکردووەو تورکەکانی بالقان لەوێدا نیشتەجێ کراون لەبــەر ئەمەش باوك و باپیرانی ئێمە لەگەڵ ئەرمەنیەکان دۆســت بوون، ئەو کاتەی ئەرمەنیەکان دەرکراون زۆریــان پێناخۆش بووە لەبەر ئەمەش لە دڵی ئەواندا دژایەتی تورکان دروســتبووە. جگە لــەوەی ئەوکاتەی تورك لەوێدا نیشــتەجێ کراون لەگەڵ باپیــری ئێمە دژایەتی یەکتریان کردووە. باپیری ئێمە کــە پێیان وتووە عەبدێ ئاغا نزیکەی ٢٠٠ســاڵ بەر لە ئێستا کوژراوە، دواتر باپیری ئێمە ویستوویانە تۆڵەی خۆیان بســێننەوە، لەبەرئەوە پەیوەندی نێوان باپیری ئێمە و بەگــی تورکان خۆش نەبوەو بە واتایەکی دیکە کێشــەیەکی کۆمەڵایەتی هەبووە، سیاسی نەبووە، باوکم زۆر جار ئەم چیرۆکەی بۆ دەگێڕاینــەوە. دەتوانم بڵێم منداڵەکانی بــە دژایەتی تورکان پەروەردە دەکرد، بەڵام لە چوارچێوەیەکی نەتەوەییدا نەبوو، بەڵکو لە چوارچێوەی خێزانیدا.

*** پێش ئەوەی PKKدروســت بێت ئۆجەلانی برات باســی ئــەوەی دەکرد حزبێك دروست دەکەین شتێك لەمجۆرە؟**

- نەخێر ئاپــۆ لە زانکۆ بوو، جیاوازی تەمەنمان(٩)ســاڵ بوو، من بچووك بووم، لەبەر ئەمەش موخاتەبەی منیان نەدەکرد. چونکە (٩)ساڵ لەمن گەورەتر بوو، بەڵام ئەوکاتەی دەگەڕایەوە گوند لەگەڵ باوکم گفتوگۆی دەکرد. لەگەڵ گەنجانی گوند گفتوگۆی دەکرد منیش گوێم لێدەگرتن.

*** کاك عوسمان بەڕێزت لە ساڵی ٢٠٠٤وازت لە PKKهێنا لەم کاتەدا پەیوەندی PKKلەگەڵ پارتی و یەکێتی و حزبەکانی دیکە بەرەو ئاســایی دەچوو. بۆچی ئەو کاتەیPKK لەگەڵ پارتی و یەکێتی شــەڕی بوو هەڵوێســتت وەرنەگرت، کەچی ئەوان ئاشتبوونەوە ئینجا تۆ هەڵوێستت وەرگرت؟**

- ناکۆکی من و PKKلە ساڵی ١٩٩٣ەوە دەستی پێکردووە ساڵی ١٩٩٣من هاتمە قۆناغی جیابوونەوە لەم کاتەدا فکری من لەگەڵ PKKجیاوازبوو من دەمخواســت سیاسەتی دەرەوەی PKKبگۆڕێت، لەگەڵ ئێران و سوریا پەیوەندییەکانی لاواز بکات و لەگەڵ ئەمەریکا و ئەوروپاش پەیوەندی بەهێز بکات. خاڵی دووەم من دەمخواســت PKKسیاســەتی خۆی لەگەڵ هێزە نەتەوەییەکانی کــورد جیاواز بێت ئەوەی تریان دوژمنایەتــی لە نێوان PKKو هێزە نەتەوەییەکان نەمێنێت، دروشــمی نەهێشــتنی دوژمنایەتی لە نێو هێزە نەتەوەییەکان هەڵگرێ، بەڵام نەیانکرد.

*** لەگەڵ عەبدوڵلا ئۆجەلان باست دەکرد؟**

عوسمان ئۆجەلان: لەم شوێنانەی کە خەباتم دەکرد باسم دەکرد، من و ئاپۆ یەکترمان نەدەدیت من لە کوردستان بووم ئەو لە سوریا بوو.

*** دەوێرای لەگەڵیا باسی جیاوازی فیکر بکەیت؟**

- ڕووبەڕوو تۆزێك زەحمەت بوو لەبەر ئەوەی ئاپۆ ڕێگای نەدەدا گفتوگۆی لەگەڵ بکەین. ئەو کاتەی کۆبوونەوە ســازدەدران دواتر دیالــۆگ نەبوو مۆنۆلۆگ هەبوو هەندێکجار پرســیاری دەکرد دەبوایە لەماوەی کەمتر لە(٥)دەقیقە وەڵام بدیتەوە، ئاپۆ خۆی چەندین کاتژمێر قســەی دەکرد بەڵام لە پەیوەندی سەرۆك و کادیران دیالۆگ نەبوو، لە ٩٩٪مۆنۆلۆگ بوو، یەك لایەنە قسەی دەکرد، لەنێو کادیرانی PKKتەنیا یەك شتیان لێداوا دەکرد ئاپۆ قسە بکات و کادیرانیش پێکبهێنێت.

نــەك هەر تەنیا مــن بەڵکو کەس لەگەڵ ئاپۆ گفتوگــۆی نەدەکرد، تەنیا ئەگەر پرســیارێك هەبوایە ئەویش وەڵامی دەدایەوە. وەڵامێکی کورت هەروەها پێویســت بوو سەرجەم کادیران گوێڕایەڵی بەڕێز ئاپۆ بن، پەیوەندیەکە بەمجۆرە بوو.

*** تۆ لەم کاتەوە کە جیاوازی بیروڕات هەبوو بۆچی هەڵوێستت وەرنەگرت بەتایبەتی کە PKKلە ساڵی ١٩٩٥ لەگەڵ پارتی و یەکێتی و.. شەڕی دەکرد؟**

- ساڵی ١٩٩٣من هەڵوێستم وەرگرت بەڵام بڕوا بکە چ لە نێو حزب و چ لە دەرەوەی حزب پشتگیری زۆرم نەبوو.

*** پشتگیری بۆ بەرێزت نەبوو؟**

- بەڵــێ لەنێو حزب ئامادەیی من نەبوو لەبەر ئەوەی لەناو حزب لە ســاڵی ١٩٩١-١٩٩٢-١٩٩٣شــەڕ لە ئاســتێکی زۆر بەرزدابوو بە هیچ شێوەیەك ئۆپۆزسیۆن لەناو PKKەدا نەبــوو بەکورتــی PKKش لە هەموو بوارێکەوە بەهێــز بوو لەبەر ئەمە زەمینەی ئۆپۆزســیۆن نەبوو. بەڵام من دەمزانی کەموکوڕی هەیە، ئەو بڵندبوونەی ئاســتی شۆڕش دەرفەتی چارەسەری دروســت دەکرد. بەڵام سیاسەتی PKKنابێتە وەڵام. ئۆپۆزسیۆنی من ئۆپۆزسیۆنێکی شەخسی بوو لەڕێی گروپێك یاخود کوتلەیەك نەبوو لە دەرەوەی حزبیش کەسێك پشتگیرییەکی جددی لەمن نەکرد.

*** تۆ هەوڵت نەدابوو زەمینەی ئەو پشتگیرییە بۆ خۆت مسۆگەر بکەی؟**

- وەڵڵاهی منیش داخوازیم نەکردبوو کەسیش پشتگیری لێ نەدەکردم. لەبەر ئەمەش منیان خستە زیندان.

*** تۆ بە فەرمانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان گیرای؟**

- بە ئەمری حزب بوو، هەروەها ئاپۆش ئاگاداربوو. سێ مانگ و دوو ڕۆژ من لە ژووی تاکەکەسی دابووم، سێ ساڵ من دانیشتم.

*** ئەوکاتەی تۆگیرای عەبدوڵڵا ئۆجەلان پەیوەندی پێوەکردی؟**

- نەخێر.

*** ئەی ئەوکاتەی ئازادبووی؟**

- دوای ئەوەی ئازاد کرام لە کۆتایی ساڵی١٩٩٦ قسەم لەگەڵ کرد.

ئەوکات سزای لە ســێدارەدانیان بۆ من بڕیبووەوە. لەسێدارەدانێکی بە مەرج لەسەر من هەبوو ئەگەر لە فیکری خۆم بەردەوام بم ســزایەکە ئەنجام بدرێت. لەبەر ئەمەش من ماوەیەك بێدەنگ مام، ســاڵی ١٩٩٧ تا گرتنی بەڕێز ئۆجەلان من بێدەنگ بووم من فکری خۆم بڵاونەدەکردەوە.

*** عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەیزانی بیروڕای تۆ چییە؟**

- بەڵــێ هەموویــان دەیانزانی بیروڕای من جیاوازە منیــش خۆم بەخۆمم دەگوت ڕۆژێك دادێت ئەو بیروڕای خۆمە دەخەمە واری پراکتیکەوە لەبەرامبەر منیش هەموو کاتێــك بەتەدبیر بوون. من دەتوانم بڵێم ســزای ئیعدام منــی ڕاگرت، من دەمگوت جارێکــی دیکە کاتی خــۆی بێت بیروڕای خۆم دەخەمــە واری عەمەلییەوە، لەبەر ئەوەی مــن بڕوام بە بیروڕای خۆم هەبوو. لەبەر ئەمەش لە ســاڵی١٩٩٩ کە بەڕێز

ئۆجەلان گیرا دوژمنان پێیان وابوو ئیتر PKK لاوازو لاوازتر دەبێت و چیدی بڵاو نابێتەوە، شۆرش بڵاونابێتەوە، بۆیە من و هەڤاڵان بە گەرمی خەباتمان کرد، هەر لەبەر ئەمەش من گوتم ئێستا کاتی ریفۆرمی دیموکراتی نەهاتووە، بەڵام ساڵی ٢٠٠٢ من گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە کاتی هاتووە، ئێمە هەنگاوێکی بچووکمان لە ژێر چەتری (KADEK کۆنگرەی ئازادی و دیموکراتی کوردستان) هاویشت، من گوتم: لە کۆنگرەی دووەم ئێمە گۆڕانکاری زیاتر دەکەین بەڵام ساڵی٢٠٠٣ دوای شەڕی ئێراق بۆ کوردان بەگشتی رەوشێکی تازەبوو مداخەلەی ئێراق وایکرد ئێمە لە ساڵی ٢٠٠٤هەنگاو بهاوێژین، لەبەر ئەوەی موداخەلەی ئەمەریکا بۆسەر ئێراق کاریگەری لەسەر هەمووکوردان کرد هەروەها کاریگەری لەسەر ئێمەش کرد.

*** پێش ئەوەی لەنێو PKK دابنیشی لە ٢٠٠٤ئاپۆت ئاگادار کردەوە کەواز دێنی؟**

- حزب ئاگاداری ئاپۆی دەکردەوەو دەیگوت عوسمان ئۆجەلان دەخوازێت حزب خراپ بکات، بەمشێوەیە ئاگاداریان دەکردەوە.

*** تۆ هەواڵت بۆ رەوانە نەدەکرد؟**

- بەڵێ منیش هەواڵم بۆ رەوانە دەکرد. ئەوانیش (واتە حزب)یش هەواڵیان دەنارد منیش دەمناردەوە، لەسەرەتادا ئاپۆ بێلایەن بوو، دەیگوت ئاساییە لە نێو حزبێك دوو هێڵ هەبێت. یەك چەپ یەك راست ئاپۆ حزبێکی بەمشێوەیەی قبوڵ دەکرد.

*** ئایا لە ساڵانی ١٩٨٠هەشتاکان ئەوەی قبوڵ بوو؟**

عوسمان ئۆجەلان: نەخێر لە هەشتاکان ئەمەی قبوڵ نەبوو، بەڵام لە ٢٠٠٤ ئەوەی قبوڵ دەکرد ئەوکاتەی کێشەکان زەق بوونەوە بەڵام چەپەکان ئەوەیان قبوڵ نەکرد. بە پشتگیری ئێرانیش ویستیان ئێمە پاکتاو بکەن.

*** بەڵام ئەوەی زانرا کە تۆ وازت لە PKK هێنا ئاپۆ لەتۆ تووڕە بوو؟**

- زۆر

*** لەبەر ئەوە بوو کە وازت لێیانهێنا، یاخود لەبەر شتی دیکە بوو؟**

- لەبەر ئەوەی من وازم هێنا، چونکە تێڕوانینی من جیاواز بوو، لەبەر ئەمەش زۆر زۆر پێی ناخۆش بوو، عاجز بوو،بە خائین لەقەڵەمی دام،زۆر قسەی گران لەسەر من کران، ئەوکات لەبەر ئەوەی مافی هاوڕێتی(٣٠)ساڵ لەنێو ئێمەدا هەبوو، هەروەها لەبەر ئەوەی برا گەورەی منە، وەڵامم نەدایەوە پێی دەگوتم خائین بەڵام لەبەر ئەوەی

لە زیندان دابوو من وەڵامم نەدایەوە، تا ئێستاش من بە هیچ شێوەیەك وەڵامم نەداوەتەوە تەنیا وتوومە ئەم قسانە لایقی ئەو نابینم.

*** لـــە دیمانەیەکتدا دەڵێیت شـــەڕی PKKلەگەڵ تورکیـــا یارمەتیدەر بووە بۆ سەربەخۆیی کوردستانی ئێرە دەکرێت ئەمە باشتر روون بکەینەوە؟**

- وەکـــو دەزانرێت باکووری کوردســـتان گەورەترین پارچەی کوردســـتانە هەروەها سیاســـەتێکی ناوەندیی بەرامبەر بە کورد لە تورکیاوە سەرچاوە دەگرێت، ئێران، سوریا، ئێراق هەموویان چاویان بڕیوەتە تورکیا. تورکیا چ سیاسەتێك لەسەر کورد بەڕێوە ببات ئەویش بەگوێرەی بارودۆخی خۆی کەم تا زۆر هەمان سیاسەت بەڕێوە دەبات.

تورکیا نکۆڵی لە مافەکانی گەلی کورد دەکرد لە وڵاتانی داگیرکەری کوردســـتان کەم تا زۆر هەمان سیاسەتیان پەیڕەو دەکرد. تورك کوردیان بێ ماف هێشت داگیرکەران هەموویان کوردیان بێ ماف هێشت.

*** تورکیا ئێســـتاش نکۆڵی لە مافی کـــوردان دەکات بەڵام لێرەدا پارچەیەك هەیە رزگار کراوە، مەبەســـتم ئەوەیە دۆخی کورد لە کوردســـتانی باشور زۆر پێش رەوشی کوردستانی باکوور کەوتووە.**

- تورکیا ئێســـتاش نکۆڵی لە مافی گەلی کورد دەکات. راســـتە پێشـــتر تورکیا سیاســـەتی کوردی بەڕێوە دەبرد، ئێســـتاش لە دوای ئەوەی رژێمی ســـەدام رووخا کوردســـتان ئازاد بووە تورکیا جارێکی دیکە ئیعتراف بـــە کورد ناکات. لەبەر ئەوەی بەڕێز تاڵەبانی دیداری لەگەڵ ئەنجام نادەن تا ئێستا سەرۆك کۆمار وەڵامێکی باشی بەڕێز تاڵەبانی نەداوەتەوە دیســـان ســـەرۆکی هەرێمی کوردستان کاك مسعود بارزانی قبـــوڵ ناکات، هەروەها لە رێگەی راگەیاندنەوە بـــێ مافی (بێ رێزی) لەبەرامبەر سەرۆکەکانی کورد دەکەن.

*** ئەمە راستە بەڵام دەسەڵاتیشی نەماوە بۆ ئێراق.**

- راستە دەسەڵاتی نەماوە، بەڵام تورکیا هێشتا پێداگیری لە سیاسەتی کۆنی دەکات لەبەر ئەمەش دەتوانم بڵێم تورکیا رێبەرایەتی بۆ هەموو داگیرکەران دەکات.

داگیرکەرانی کوردســـتان داگیرکاری لەگەڵ تورکیا پیـــادە دەکەن، ئەگەر تورکیا هەنگاوی چارەســـەری بهاویشـــتبوایە، ئەوا لە هەموو پارچەکانی دیکە هەنگاوی چارەسەری کێشەی کورد دەستی پێدەکرد.

*** کاك عوسمان تۆ کە وازت لە PKK هێنا (١٨) ئەندامی سەرکردایەتی لەگەڵ ئێوە دوورکەوتنەوە یاخود جیابوونەوە، پێتوانییە بەشێکی زۆری ئەو ١٨ ئەندامەی سەرکردایەتی PKK پەیوەندیان لەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگری تورکیا یاخود وڵاتانی دیکە هەبوو؟**

- من دەتوانم بڵێم زروفی PKK زروفێکی زۆر توندبوو. لە بەرژەوەندی هیچ کەسێکدا نەبوو پەیوەندی لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتاندا هەبێت.

ئەو برادەرانەی کە جیابوونەوە تەنیا گومان لەیەك کەس دەکرا کە پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانیا هەبێت ئەویش رەحمەتی کانی یلماز بوو.

*** ئەوە تەنیا گومان بوو یاخود پشت راستکرابۆوە؟**

- من دەتوانم بڵێم نزیك بوو لە راستی، برادەرێکی کوردمان هەبوو لە ئەڵمانیا دەیگوت من کارم بۆ ئەوە کرد تا کانی یلماز لە زیندانی ئەڵمانیا دەربکەوێت، بێگومان بە رێنمایی ئاپۆ، کانی یلماز ئەو کاتەی ئازاد کرا لەگەڵ هەواڵگری ئەڵمانیا قسە دەکات، دەڵێت پەیوەندی لەگەڵ من ببەستن من دەتوانم لەم برادەرە زیاتر هاوکاریتان بکەم هەروەها ویستی پەیوەندی من لەگەڵ ئەڵمانییەکان تێك بچێت هەندێك زانیاری بەمشێوەیە هەبوو. هەروەها ئەو کاتەی بەرێز ئۆجەلان دەستگیرکرا لە رووسیا ماهیر وڵات و لە ئەڵمانیا کانی یلماز لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا و روسیا کارەیان کرد بۆ ئەوەی ئاپۆ لە ئیتاڵیا دەربکەوێت نەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ ئەمەریکا ببەستێت لەبەر ئەمەش من دەڵێم ئەو هەردوو کەسە بوونە هۆی دەرکەوتنی ئاپۆ لە ئەوروپا، برادەرانی دیکە بڕوا ناکەم پەیوەندیان لەگەڵ مخابەراتی تورکیا هەبێت برادەرانی سەربەخۆ بوون، بەڵام دەتوانم بڵێم سیاسی نەبوون بەشێکی زۆریان کادیری سەربازیی بوون. نەیان دەزانی سیاسەت بکەن، بە تێروانینی سەربازییانە سەیری کێشەکانیان دەکرد.

*** باشە بە نسبەت کانی یلماز پێشتر هیچ زانیاریەکتان هەبوو کە ئەو کەسە پەیوەندی بە موخابەراتی ئەڵمانیاوە هەیە؟**

- بەرێز ئاپۆ دەیگوت کانی یلماز پیاوی بەریتانیایە.

*** پێش دەستگیرکردنی ئاپۆ؟**

- بەڵێ

*** ئەی بۆچی ئیجرائاتیان بەرامبەری وەرنەگرت؟**

- PKK دەیخواست لەم رێگایەوە خەباتی ئەوروپای فراوان بکات، بەتایبەتی لە

ئەڵمانیا فشــارێکی زۆر لەســەر PKKهەبوو. لەم چوارچێوەیە کانی یلمازی بەکار دەهێنا.

*** کانی یلماز خۆی لە کوێ دادەنیشێت؟**

- کانی یلماز لە ئەورووپا بوو.

*** دەزانم لە ئەورووپا بوو، بەڵام لەکام وڵات؟**

- لە ئەڵمانیا بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لێپرســراوی خەبات شــوێنێکی دیاریکراوی نەبوو، هاموشۆی دەکرد.

*** ساڵی رابردوو PKKبانگهێشتی کردبووی؟**

- بەڵێ لە ساڵی ٢٠٠٦ بوو

*** ئەم بانگهێشتە بۆچی بوو؟ داوایان لێ کردی بگەڕێیتەوە نێو PKK؟**

- PKKبانگهێشــتی منی کرد. لە رێگــەی هەندێك برادەرەوە، بە منیان دەگوت پێویســتە هەموو رەفتارەکانی PKKقبوڵ بکەیت. PKKچۆن بخوازێت بەمشێوەیە رەفتار بکەیت. وەکو لێپرسینەوە و، دادگا و....

*** ئێستاش وایە؟**

- ئێســتاش بەردەوامە گۆڕانکاری بەســەردا نەهاتــووە PKKزوو زوو گۆڕانی تێدا ناکرێت من سوپاســم کردن بــۆ بانگکردنەکەیان، بەڵام هــۆکاری جیابوونەوەی من بەردەوامە لەبەر ئەمەش مــن ناتوانم بگەڕێمەوە ناو PKKبەڵام من ئامادەم بۆ دیالــۆگ و خەباتی هاوبەش هەرچەندە بیروڕای مــن جیاواز بێت بەڵام بۆ خەباتی هاوبەش گرفت دروست ناکات.

*** ئێستا لەگەڵ موراد قەرەیلان پەیوەندیت چۆنە؟**

- ئەو کاتەی لەنێو PKKبووم، پەیوەندی من لەگەڵ موراد قەرەیلان تۆزێك باشبوو، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە موراد بیروڕای نەتەوەیی هەیە. هەرچەندە ئێستا بڵێ من چەپم، راســت نییە. ئەگەر مرۆڤ بە تێڕوانینی راســت و چەپ سەیری موراد قەرەیلان بکات، لە خانەی راســتدا دەبینرێت و کەسایەتیەکەی بە هێڵی راستدا دەڕوات.

*** باشــە کاك عوســمان تۆ بڕوات بە خەباتی سیاســی هەیە DTP ش خەباتی سیاسی دەکات، باشە تۆ بۆچی لەگەڵ ئەوان خەباتی سیاسی ناکەیت؟**

- DTP هەمان پارتی PKKبەڵام رووە سیاسییەکەی.

*** باڵە میانڕەوەکە، باڵە سیاسییەکە.**

- زۆر لە برادەرانی DTP دەخوازن لەگەڵ من کار بکەن، منیش لەگەڵ ئەو رایەدام، پێــش ئەوەی لە PKKجیابیمەوە لە ســاڵی ٢٠٠٣ گفوگۆی فراوانم لەگەڵ موراد بوزلاق سەرۆکی پێشــووی DTP و ئەحمەد تورك سەرۆکی ئێستای DTP کردووە، دەتوانــم بڵێم بیروڕامان زۆر لەیەك نزیکە. ئەگەر وەکو یەك نەبێت لە یەکتری نزیکە. ئێمــە دەخوازین لەگەڵ یەکتری کار بکەین، بــەڵام PKKڕێگا نادات لەبەر ئەوەی PKKلەسەرDTP باڵادەستەو موداخەلەی خەباتی DTP دەکات. PKKدەترسێت ئەگــەر من لەگەڵDTP خەبات بکەم دەزانــێ کاریگەری من زۆرتر دەبێت لەهی ئەوان، لەبەر ئەمەش قەدەغەی داناوە. قەدەغە لەســەر من وDTP هەیە تا بەیەکەوە کار نەکەیــن، بەڵام من جارێکی دیکە پشــتگیری لەDTPدەکەم و دەخوازم لەگەڵ هەندێك برادەران لەگەڵ هەموویان دانووستاندنم بەردەوام بێت.

*** یەعنی ئێســتا پەیوەندیت لەگەڵ ئەحمەد تــورك هەیە، وەك دیالۆگ و بیروڕا گۆڕینەوە؟**

- من بیروڕای ئەحمەد تورك بە راست دەزانم و پشتگیری لێدەکەم ئەو برادەرە دەزانێت من ئامادەم لەهەر شوێنێك لەگەڵی دانیشم و گفتوگۆی لەگەڵ بکەم، بەڵام ئەو برادەرە رەوشــێکی تایبەتی هەیە. ئەگەر تورکیا وPKK بزانن پەیوەندیم لەگەڵ ئەحمەد تورك هەیە تەنگاوی دروســت دەبێت لەبەر ئەمەش پەیوەندیەکی بەمشــێوەیە لە بەرژەوەندی ئەحمەد تورك نییە، بەڵام ئێمە لە یەکتری حاڵی دەبین لە یەکتری تێدەگەین من خەباتی ئەوان لە چەندین لایەوە پشتگیری دەکەم.

*** ساڵێك بەر لە ئێستا دیمانەیەکمان لەگەڵ سازکردی گوتت رەنگە لەیەك دوو ساڵی ئاینندە لە کوردســتان حزبێکی سیاسی دروست بکەم، بەڵام تا ئێستا هیچ دیار نییە ئایا زەمینەی دروستکردنی ئەو حزبەت خۆشکردووە؟**

- تۆزێــك خەباتمــان بۆ کردووە، خەبــات بەردەوامە لەبەر ئەوەی ئــەو کاتەی ئێمە لەPKK جیابوونــەوە دژایەتیەکی زۆرمان لەگەڵدا کــرا لەلایەن PKKەوە ئەمەش وایکرد ئێمە تەنگاو بین، ئێستا دەتوانم بڵێم لەنێو خەڵکدا دژایەتیم کەم بۆتەوە خەڵکێکی زیاتریش قبوڵم دەکەن. دەتوانم بڵێم هەندێك زەمینە دروســتبووە بۆ ئەوەی ئێمە هێزێکی تازە پێشــبخەین خەڵکی کورد و کوردســتانی تورکیا رێزێکــی زۆریان بۆ ئێمە هەیە و فکری ئێمەش باشــتر قبوڵ دەکرێت، من دەتوانم بڵێم ئێســتا لەنێو بزاڤی نەتەوەی کورد

و کوردســـتانی تورکیا فکری ئێمە لە ٨٠٪ قبوڵ دەکرێت و لەسەر فکری منن، فکری PKKلە ٢٠٪خەڵکی بڕوایان پێی هەیە. بەڵام لە بواری رەسمیدا ئەو لە ٢٠٪باڵادەستن لە ٨٠٪ کەی تر باڵادەست نین.

*** زەمینەی ئەوە هەیە حزبێکی سیاسی لە کوردستانی باشوور دروست بکەیت؟**

- لەلایـــەن خەڵکەوە زەمینـــە باشـــە،بەڵام دەخوازرێت تورکیا لێبوردنێکی گشـــتی دەربکات.

*** ئەگەر لێبوردنێکی گشتی دەربکات دەگەڕێیتەوە؟**

- بەڵێ دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم و خەباتی سیاســـی دەکەم بیر لە دروســـتکردنی حزبێك دەکەمەوە، بڕیاردان گرنگ نییە بیرکردنەوە گرنگە ئەگەر لێبوردنێك بدرێت ئێمە دەتوانین خەباتی خۆمان بگەیینە قۆناغێکی دیکە. سەرەڕای ئەمانە من گۆڕانکاری لە PKKبە گرنگتر دەزانم PKKپێویستە دەست لە هێڵی چەپ بەردات. بەتایبەتی لە ساحەی سیاسی لەسەر ئەم دەستکەوتانە خەباتێك بەرەوپێش ببات قازانجێکی زۆر دەکات. ئەگەر ئەمە نەبێت ئەوکات دروستکردنی حزب رەوایە.

*** باشـــە کاك عوســـمان ئێســـتا لەنێو PKKلە رووی فکری، لە رووی سیاسی و عەمەلیەوە ناکۆکی هەیە؟**

- ئەو خەباتەی پێشـــتر ئێمە کردمان کاریگەریی هەیە. ئێستاش لەنێوPKK ناکۆکی لە نێوان باڵی نەتەوەیی و باڵی چەپ بەردەوامە، بەڵام چەپەکان باڵادەستن، هەر چەندە بەڕێز قەرەیلان ســـەرۆکی کۆمیتەیPKK یە، بەڵام دیسان چەپ دەسەڵاتدارن لەبەر ئـــەوەی PKKلە دامەزراندنی خۆی چەپ بووە ئیتر هێزی خۆی لە دامەزراندنەکەی وەردەگرێت. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناکۆکی بەردەوامە لە نێوان بەشی ئەمەریکا و بەشی ئەورووپا ناکۆکی هەیە، رەزا ئاڵتونیان نارد بە گوێرەی زانیاری من ئەورووپا رەزا ئاڵتوونی نارده لای PKKبۆ ئەوەی نەچێتە سەر هێڵی ئەمەریکا، بەڵکو لە هێڵی ئەوروپادا بمێنێت، رەزا ئاڵتوون ئەویش پێشوتر لەگەڵ ئێمە لەگەڵ گرووپی ریفۆرم دابوو ئەوانەی گۆڕانکاریان دەخواســـت دەتوانم بڵێم ئەوە ئێمـــەی زۆر زۆر هانددا ئەو کاتەی گوتمان دۆستایەتی ئەمەریکا بکەین ئەو پیاوی ئەورووپا بوو وەکو زوبێر ئایدار و رەمزی تارتال و رەزا ئاڵتوون لە دژی گرووپی ریفۆرم لەگەڵ گرووپی چەپی محافەزەکار یەکیانگرت.

*** باشە پەیوەندی تۆ لەگەڵ ئەمەریکیەکان چۆنە هاتووچۆتان گەرمە؟**

- ئەو کاتەی ئێمە لەنێو PKKدابووین دیالۆگێکی لاواز هەبوو.

*** لەسەر ئاستی خۆت؟**

- دانوستاندنی من لەگەڵ سیاسییان نەبوو بەڵکو لەگەڵ برادەران هەبوو.

*** برادەرانی سیاسی؟**

- برادەری سیاسی نین کۆمەڵایەتین، لەگەڵ یەکتری گفتوگۆمان کردووە.

*** مەبەستم ئەوەیە ئەمریکییەکان پەیوەندیت لەگەڵ ناکەن بۆ ئەوەی هاوکاریت بکەن بۆ دروستبوونی حزبێك تا PKKلاواز بکەیت و زیاتریش سەربە ئەمەریکا بیت؟**

- ئەو کاتەی ئێمە لەناو PKKبووین هەروەها دوای ئەوەی لە PKKجیابووینەوە هیچ کەسێك داخوازی بەمشێوەیەی نەبووە نە ئەمەریکا و نە هێزی دیکە.

ئێستا PKKگۆمان دەکات کە پارتی دیموکرات و یەکێتی نیشتمانی پشتگیری ئەو کەسانەیان کردووە کە لە PKKجیا بوونەتەوە.

*** من بۆ جەنابت پرسیار دەکەم؟**

- بۆ من و بۆ برادەرانی دیکەش تا ئێستا ئەمەریکا داخوازی بەمشێوەیەی نەبووە.

*** باشە لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی کە دانیشتوویت تورك پەیوەندیان پێوە نەکردیت بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە ژێر باڵی وان؟**

- سەرەتا تورك لە ڕێگای هەندێك ڕۆژنامەنووسان وەکو حسنی محلی و برادەری دیکەی ڕۆژنامەنووس پەیامیان هەبوو، پەیامی وان بانگکردنی ئێمە نەبووە بچینەوە ژێر باڵیان، بەڵکو تورك دەیانخواست بزانن فکری من چییە و لە نزیکەوە من بناسن،، هیچ کات بانگکردنیان نەبووە بۆ ئەوەی خەباتێکی سیاسی بکەم.

*** باشە کاك عوسمان تۆ دەڵێی ئەتاتورك و ئەجەوید و سلێمان دەمیرال منداڵیان نەبووە بۆیە لە سیاسەتدا زاڵمانەش بیریان دەکردەوە، ئەی تۆ کە ئەوەندە ساڵە لەنێو PKKدەژیت و لەناو ئێوەش ژن هێنان (زواج) قەدەغە بوو، ئەی بۆچی هەڵوێستی توندت نەنواند؟**

- من زۆر بروام بە تەحەمولی مرۆڤ هەیە، پێشوتریش من باسمکردووە ژیان بەمنداڵانەوە بەردەوام دەبێت.

*** بەڵام لە ناوPKK ژن هێنان قەدەغە بوو؟**

- ئەو کاتەی ئێمە لە ناو PKKبووین یەك بریارمان هەبوو ئەویش پێویست بوو ئێمە فیدائی بین، فیدائیش دەست لە هەموو شتێك دەکێشێتەوە، ئێمە پابەندی ئەو بەڵێنەی خۆمان بووین، نەبوونی ژن و خێزان بۆ ئێمە نۆرماڵ بوو یەعنی ئێمە ئەوەمان لە فکرو هەستی خۆمان دوورخستبووەوە ئێمە تەحەمولمان دەکرد. بەڵام کات گەیشتە ئەو رادەیەی

تەحەمولکردن شـــتێکی بێ مەعنا بوو. لە بەر ئەمەش بـــڕوام بەمە نەما کە هەر دەبێت لە ڕێگەی فیدائییەوە شـــۆڕش دروست ببێت، بە پێچەوانە ئەو بیروڕایەم لەلا گەڵاڵە بوو کە لەنێو کۆمەڵگا جێ بگری، ئینجا سیاســـەت بکەی ژیان و سیاســـەت لەگەڵ یەکترا بێت باشـــتر دەبێت، بەڵام ئەگەر زۆر لە کۆمەڵـــگا دووربکەویت و فیدائی بیت. ناتوانی سیاسەتیش بە باشی بەڕێوەببەی، من لە دوای ئەو ١٩٩٣بیروڕایەم بۆ دروست بوو.

*** باشـــە ئێســـتا پەیوەندی موراد قەرەیلان لەگەڵ مستەفا قەرەسوی، دووران کالکان، جەمیل بایق، عەلی حەیدەر قەیتان چۆنە، باشە یاخود خراپە؟**

- بە شێوە فەرمییەکەی کێشە دیار نییە، ئەوان لەوە دەترسن کێشەکانی خۆیان (یەکتری) زۆر گەورە بکەن، فشارێکی زۆریان لەسەرە، لەبەر ئەوەی تورکیا لەنێو هێرشدایە ئەوانیش تەنگاوییان هەیە لەم بوارەدا بە پێویســـت دەزانن پشتگیری لە یەکتری بکەن و کێشەکانی خۆیـــان دەرناخەن. بەڵام جارێکی دیکە کێشـــە هەیە. قەرەیلان دەخوازێت نزیکی ئەمریکا بێت، قەرەیلان دەخوازێت دژایەتی هێزە نەتەوەییەکانی کورد نەکرێت، بەڵام چەپەکان دەڵێن ئەمەریکا تەماحکارە. ڕەزا ئاڵتوون لەگەڵ ئەورووپا پەیوەندی خۆشـــە، دووران کالکان لە دژی ئەمەریکایە.

*** ئەی مستەفا قەرەسوو چۆنە؟**

- مســـتەفا قەرەسوو بۆ شۆڕشی جیهانی خەبات دەکات لە دژی ئیمپرالیزمی گلۆبال، شۆڕشـــێکی گلۆبالی دەکات، یەعنی دەخوازێت کوردی هەژار شەڕی جیهان بکات؟

*** ئەمانـــە چۆن دەتوانـــن لەگەڵ یەکتری بژین؟ هەریەکـــەو بیروڕای تەواو جیاوازی لە بەرامبەر ئەوی تر هەیە؟عەبدوللا ئۆجەلان کاریگەری هەیە؟**

- بەڵێ کاریگـــەری یەکەم هی عەبدوڵڵا ئۆجەلانـــە، دووەمیش لە ناچاری دێت، لەبەرئەوەی تورك زۆر توندن لە بەرامبەریان، ئەوانیش خۆیان ناچار دەبینن لەگەڵ یەکتری بن.

*** باشە دووران کالکان و مستەفا قەرەسوو پێش گرتنی ئۆجەلان لە نێو PKK ڕۆڵیان زۆر بوو؟**

- وەلامی هەموو کات دووران کالکان تۆزێك ڕۆڵی هەبووە ئاپۆش زۆرجار دەیگوت ئەمە چ شتێکە، منیش تێگەیشتم کە ئاپۆ بڕوای تەواوی پێ نییە. لە ساڵی ١٩٨٦

ئاپۆ قسەیەکی هەیە دەڵێ، تەنها یەك ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی ئێمە تۆ بناسین و بزانین تۆ چی و چ نی، پێویستە تۆ بخەینە ئەشکەوتێکی تاریك لەوێدا لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەین، ئەمە دەرهەق بە قەرەسوو، هەروەها دەیگوت پێویستە کاری عەمەلی نەدرێتێ.

قەرەسوو مرۆڤێکی بێ چارەیە، بەڵام دووران کالکان خۆی دەخستە نێو هەر کارێك.

*** باشە ئەوانە مستەفا قەرەسوو باسی شۆڕشی جیهانی دەکات ئەوە هزرێکی ترۆتسکیە، بەڵام ئەوانە زیاتر ستالینین، ستالینیش عەودالی شۆڕشی جیهانی نەبوو، دەکرێ ئەمە باشتر روون بکەیتەوە؟**

- قەرەسوو کەسایەتیەکی ستالینی بوو، بەڵام من دەتوانم بڵێم قەرەسوو لەوەش زیاتر شیعەیەکی عەرەبیەو بڕوای بە حەزرەتی عەلی هەیە. لە ساڵی ٢٠٠٣ لە ئێراق چووبووە کەربەلا بۆ ئەوەی پارچە قوماشێك بێنێ دواتر ئەو پارچە قوماشانەی لەسەر برادەرە عەلەوییەکانی دابەشدەکرد، دەیخواست وەکو شێخێك هەڵسوکەوت بکات لەلایەکی دیکە باسی شۆڕشی سۆسیالیستی جیهانیش دەکات.

*** چۆن بڕوای بە ئیمام عەلی هەیە و باسی شۆڕشی جیهانی دەکات؟**

- بەرای من ئەمەش لێپرسینەوە هەڵدەگرێت، کەسێك لە تورکیا کە تورك نەبوو ناویان دەنووسی (تورك ئۆغلو) واتە کوری تورك لەناو PKKەش ئەوەی زۆر لە سۆسیالیست دوورە وەکو سۆسیالیستی گەورە خۆیان نیشاندەدەن قەرەسووش بەمشێوەیە دەخوازێت لە ژێر ئەم بیرورا راستییە مەزهەبیە خۆی بشارێتەوە، کەسایەتیەکی مەزهەبیە زۆر دواکەوتووە دەرەبەگیشە مرۆڤێکی مۆدێرن نییە، بەڵام دەڵێ من چەپم لە ژێر ئەو پەردەیە سەرجەم تایبەتمەندیە ناشیرنەکانی دەشارێتەوە.

*** عەبدوڵلا ئۆجەلان و قەرەیلان ئەم راستیە دەزانن؟**

- هەموویان دەزانن هەندێکجار ئاپۆ بۆ ئەوەی خەڵکی عەلەوی لە شۆڕش نزیك بکاتەوە، دەیگوت قەرەسوو تۆ شێخی عەلەوییانی.

*** باشە کاك عوسمان کە جەنابت گیرای، کێ سوور بوو لەسەر ئەوەی کەتۆ بگیرێی مەبەستم لەنێو سەرکردایەتی PKKیە؟**

- ساڵی ١٩٩٣من هاتمە هەولێر سێ سەعات لەگەڵ کاك مەسعود دانیشتم گفتوگۆمان لەسەر پەیمانی نەتەوەیی کرد. کە گەڕامەوە هەر لە هەولێر بووم، رۆژی دواتر تەلەفونێکم

لەلایـــەن عەبدوللا ئاگرین بۆ هات، تەنها یەك پرســـیاری لێکـــردم گوتی: دوای دیدارەکەت لە حەفتانین (لە پشــت زاخۆیە) لە بارەگای پارتـــی دراوە. منیش گوتم ئاگاداری ئەوە نیم ئەگەر شـــتێکی وا هەبێت من هەڵوێســـتی خۆم رادەگەیەنم، من گەڕامەوە بۆ زەڵێ ئەوکات بارەگای من لە زەڵێ بوو من لێپرســـینەوەم کرد، شتەکە راستبوو گوتم کاکە من لەگەڵ بەڕێز کاك مەســـعود بارزانی دانیشـــتووم، گفتوگۆمان کردووە، ئێوە لـــە حەفتانین لە بارەگایەکی پارتیتان داوە، برادەرانیش بۆ ئەوەی کێشەکە گەورەتر نەبێت قسەیان نەکرد، منیش ئەو کات لە لاپەرەکەیدا دەســـت لەکار کێشانەوەی خۆم راگەیاند و گوتم: بەمشێوەیە ئەو کارە ناکەم. لەبەر ئەوەی من بەمشـــێوەیە دەست لە کارکێشانەوەم پێشـــکەش کردبوو، وەکو تاوانێك لەبەرانبەر من بەکاریان هێناو گوتیان تۆ لە ژێر کاریگەری پارتی دیموکرات کاردەکەیت.

*** کێ وایگوت؟**

- بەڕێز ئۆجەلان و هەموو ئەندامانی PKKوایان دەگوت، پێشووتریش من دووجاری دیکە لەگەڵ تاڵەبانی دانیشـــتبووم، لەبەر ئەمە دەیانگوت تۆ پیاوی ئیمپریالیزمی، پیاوی مسعود بارزانی پیاوی جەلال تاڵەبانی، بەم تۆمەتە تاوانباریان دەکردم.

*** کەسێك لە سەرکردایەتی دژی گرتنی تۆ نەبوو؟**

- رەنگە کەســـانێك هەبووبن پێیان خۆش نەبوو. بەڵام ئەو کات شـــۆڕش تۆزێك بەرەو پێش دەچوو، لەبەر ئەمەش هەموو لایەك قســـەیان وەکو یەکتری بوو هەندێکیش دەیانگوت عوسمان ئۆجەلان چۆن ئەوەندە ناو بانگی پەیداکردووە؟ بەشـــێك لە ئەندامانی ســـەرکرایەتی PKKلە گەورە بوونی من بچوکبوونی خۆیان دەدیت؟

*** ئێستا وەزعی PKKچۆن دەبینی پێتوایە ئاییندەی PKKباشتر دەبێت یان خراپتر؟**

- ماوەی چەند ســـاڵێك دەبێت من بیرورای خۆم باسکردووە بەرای من کورد ئێستا دەتوانێ لە رێگای خەباتی سیاسییەوە بە ئەنجام بکات، نەوەکو لە رێگەی خەباتی چەکداری ئەو کاتە جیابوونەوەش بیروڕای خۆم باسکرد. بەرای من لە کاتێکدا هیچ رێگای دیکە نەمێنێ ئەو کات رێگای شـــەڕی چەکداری پێویستە، ئەگەر تۆ هەموو رێگاکان بەکاربهێنی هیچ سوودێکیان نەبوو ئینجا رێگای چەکداری بەکاربێنی. بە شەڕی چەکداری کێشە دروست دەکات، دەتوانی کێشـــەی کورد بکەیتە رۆژەڤ ئێســـتاش ئەم کارە کراوە لە رێگەی شەڕی سیاسی خەباتی سیاســـی. کورد دەتوانێت کێشەکانی چارەسەر بکات، بۆ نموونە ئێستا لە تورکیا زیاتر لە ٢٠ ملیـــۆن کـــورد هەیە. ئەگەر تۆ بتوانیت لە نێو ئەم ٢٠ ملیۆنە ١٠ ملیۆن کورد رێکبخەین لە ناوەخۆ و لە دەرەوە چالاکی سیاسی ئەنجامبدەیت کێشەی کورد چارەسەر دەبێت.

بیروڕای من بە کورتی بەمشێوەیە، لەبەر ئەمەش دووبارە بەکارهێنانی شەڕی چەکداری کارێکی باش نییە بەڵام ئێستا کورد و تورك شەڕ دەکەن من وەکو هەندێك کەس چەپڵە لێنادەم بۆ لێدانی PKK لەبەر ئەوەی کورد و تورك لە نێو شەڕدان من لایەنی کوردان دەگرم. بۆ ئەوەی گەریلا کەم بکوژرێت و بە شێوەیەکی باشتر بتوانێت لە دوژمنی خۆی بدات پشتگیری گەریلا دەکەم، پشتگیری لە PKK ناکەم، بەڵکو لەبەر ئەوەی گەریلا کوڕی خەڵکن، بەراستی ٩٠٪ خەباتی گەریلا بۆ نەتەوەی کوردە، لەبەر ئەمەش ناخوازم گەریلا بکوژرێت دەخوازم سەربکەوێت لەبەر ئەمەش من لە یەکێك لە وتارەکانم نووسیومە بژی گەریلای کورد.

*** بەمەزندەی تۆ ژمارەی گەریلا چەندە؟**

-ژمارەی گەریلا نزیکەی (٦) هەزارە نیوەی ئەو ژمارەیە لە چیاکانی باکوورەو نیوەکەی تری لە چیاکانی باشوور و ئێرانە. بەڵام ئێستا شەڕ PKK تەنگاو دەکات ئەم تەنگاوییە لە هەڵبژاردنەکان بە دیار کەوت، PKK بەم سیاسەتەی ئێستای قازانج ناکات. پارتی عەدالەت و پەرەپێدان لە PKK سەرکەوتووتر بوو ئێستا مەترسی ئەوە هەیە لە هەڵبژاردنی شارەوانییەکان لە ساڵی ٢٠٠٨ شارێکی وەکو دیاربەکر لە دەست PKK دەربێنێت و بکەوێتە دەستی AKP لەبەر ئەمەش من وتارێکم نووسی لە ژێر ناوی زەنگ (جرس) بۆ کێ لێدەدات. بەڵام من لەم بڕوایەدام جەرەسی مەترسی بۆ PKK لێدەدرێت ئەگەر PKK تەگبیری بە پەلە نەکات، لە بڕوایەدام لە هەڵبژاردنی بەهاری ساڵی داهاتوو شاری دیاربەکرو هەندێك لە شارەکانی تر لە دەست PKK دەردەچێت. لەدەستدانی ئەم شارانە وەکو قەڵای نەتەوەییە کە ئیتر PKK ناتوانێت لەم شکانەدا پشتی راستبکاتەوە ئەمەش تەنها نابێتە شکستی PKK بەڵکو دەبێتە شکستی بزاوی نەتەوەیی کورد لەبەر ئەمەش کورد مەترسیەکی بەمشێوەیان لەبەردەمدایە، ئەو کاتەی شکستێکی گەورە رووبدات حیساب لە PKK دەخوازێت ئەو PKK ەی ئێستا زەحمەتە ئەو حیسابەی پێبدرێت.

*** PKK ئێستا خۆی هەست بەم مەترسیە ناکات؟**

- وەڵڵا هەموو کەس دەزانێت، رەوشەکە لە پێش چاوانە، بەڵام ئەوەش دیارە کە PKK بەم سیاسەتەی خۆی ناتوانێت تەدبیر وەربگرێت PKK تەنها یەك چارەی لە بەردەمدایە ئەویش گۆڕانکاری بکات. ریفۆرمی دیموکراتی کە لە ساڵی ١٩٩٣ پێویست بوو ئەنجامی نەدا. ساڵی ٢٠٠٣ پێویست بوو ئەنجامی نەدا ئێستا پێویستە زۆر بەپەلە ئەو ریفۆرمە بکات. پێویستە PKK یەکەمجار ریفۆرم بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ هێزە جیهانییەکان دۆستایەتی

پەیدا بکات و خەباتێکی زیاتر بکات ٢- لەگەڵ هێزە نەتەوەییە کوردەکان خەباتێکی گرنگ پێویستە و دژایەتی نەکات ٣- پێویستە بۆ ژیانی شەخسی ڕێگا بکاتەوە ئەگەر ئەم شتانە نەبێت دیموکراسی نابێت، نەساسی دیموکراسی لە مافی مرۆڤەوە دادێت چونکە تۆ ناتوانی ژیانی هاوسەری پێکبهێنی، تۆ ناتوانی لە حزب جیا ببیتەوە، مرۆڤ ناتوانێت ئیش و کاری تایبەتی بکات.

ئەگەر ئەمانە نەبن- مافی مرۆڤیش نییە ئەگەر مافی مرۆڤیش نەبێت دیموکراسی نییە. هەلومەرجی سەرەکی دیموکراسی لە مافەکانی مرۆڤ دەستپێدەکات ئەگەر PKK مافی مرۆڤ قبوڵ بکات لەگەڵ بزاڤی نەتەوەیی کورد پەیوەندی باشبکات لە کوردستانی تورکیا و پارچەکانی دیکەی کوردستان لەگەڵ جیهانیش ڕێك بکەوێت دەتوانم بڵێم PKK بەردەمی دەکرێتەوە PKK دەتوانێت لەم تەنگانەیە دەربکەوێت و خەباتی نەتەوەیی لە کوردستانی تورکیاو پارچەکانی دیکەی کوردستان لەگەڵ جیهانیش ڕێکبکەوێت و بکەوێتە قۆناغێکی نوێ ئەو کات تورکیا ناچار دەبێت دیالۆگی لەگەڵ بکات و کێشەی کورد چارەسەر دەبێت.

*** باشە ئێستا ئاپۆ وەزعی چۆنە لە زیندان؟**

- وەڵلا ڕەوشی تەندروستی باش نییە تەنگە نەفەسی و نەخۆشی سینۆزیتی هەیە دەڵێن شتی کاریگەری خراپیان لەسەر کردووە.

*** ژەهراوی کردنەکە ڕاستە؟**

- شتی کیمیاوی دەدەنێ کە بۆ ژیانی مرۆڤ باش نییە بۆ نموونە ژوورەکەیان بۆیاغ کردووە بە ماددەی ژەهراوی.

*** دکتۆری تایبەت نەچوونەتە لای؟**

- نەخێر هەمووی لە ژێر داخوازی دەوڵەتدایە.

*** مەبەستم پزیشکی نێودەوڵەتییە؟**

- سەردانیان کردووە بەڵام هێشتا ئەنجامەکانیان ڕانەگەیاندووە، (٣)مانگ لەمەبەر هەیئەتێکی پزیشکی نێو دەوڵەتی سەردانیان کرد لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردووە بەڵام ئەنجامەکەیان ڕانەگەیاندووە.

# دیمانەی
# نەوشیروان مستەفا



**نەوشێروان مستەفا**

# ئێمە تازە خەریکین بیر هەڵدەکەنین و خانوو دروستدەکەین، ئێمە بە تەمای پرۆسەیەکی زۆر هێمن و دیموکراتین

نەوشـــێروان مستەفا کەسایەتییەکی ناســـراوی ناو بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستانە، بەڵام رەنگە لە هەموو سەرکردەیەکی سیاسی کوردستانی زیاتر بۆچوونی جـــودا جودای لەســـەر بونیاد بنرێ، ئەمـــەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ســـەردەمە ئاڵۆزو تێکچـــرژاوەی کە بزووتنەوەی کـــوردی پێیدا تێپەڕ دەبوو، نەوشـــێروانیش لە نێو ئەم بزووتنەوەیەدا هەمیشـــە ناوێك، هێزێك، بیروباوەڕێك بـــووە، بۆیە لە هەموو کاتەکانی شەڕو ئاشتیدا، تۆپەکە لە لای نەوشـــێروان دوور نەکەوتۆتەوە،ئەم دوورنەکەوتنەوەیەی تۆپەکە بەشـــێك بووە لە ستراتیژییەتی نەوشێروان، باشترین نموونەش دابڕانی ئێستای نەوشێروانە لە یەکێتی نیشتمانی، بەڵام دابڕانێك دوور لەو ئەندام مەکتەب سیاسیانەی تری ناو حزبە کوردستانییەکانە کە لە حزب دووردەکەونەوە، بۆ خۆیان خەریکی ژیانی تایبەتی خۆیان دەبن، نەوشێروان دەیەوێ بڵێت راستە من لە سیاسەتی ئێستای یەکێتی دوورکەوتوومەتەوە، بەڵام نە لە سیاسەت دابڕاوم، نە پیاوێکی دستکورت و هەژاریشم لە سیاسەت تا بۆخۆم رێگای ژیانی تایبەتی بۆخۆم هەڵبژێرم،دەیەوێ بڵێت من هەمیشە لە ناو خەڵکم، بۆیە تا ئێســـتاش کەس نازانێ ئایندەی نەوشێروان چۆن دەبێت، چونکە نایەوێ تۆپەکە لەو دوورکەوێتەوە،بەمەش کۆمەڵێك پرســـیاری ئاڵۆز لای هەر خوێنەر و سیاســـییەکی ئەم وڵاتە دروستدەبێت، ئەوەیە لوغزەکە، نەوشێروان لە ساڵانی خەباتی حەفتاکان و بەتایبەت هەشتاکانیشـــیدا، جار جار دەیەویست موفاجەئە دروست بکات، هەر چەندە موفاجەئەی ئەمجارەی ئەگەر بتوانێ دوا مەفاجەئەو ســـەرکەوتووترینیان دەبێت، کە دەتوانێت تا رادەیەك ئەو لاپەڕە خوێناوییانەشی پێ رەشبکاتەوە، کە زۆرجار لێرەو لەوێ باســـیدەکەن، بە تایبەت سەردەمە دژوارەکانی شەڕی ناوخۆ، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا نەوشێروان بەم تەمەنەی ئێستای دەتوانێ ئەم موفاجەئەیە بکات، بەر لەوەی گوێبیســـتی خۆی بین بە بەڵێ یا نەخێر، لە ئایندەدا مێژوو وەڵامەمان دەداتەوە، تەنها

کەمێك چاوەڕوانی دەوێت.

من بەش بەحاڵی خۆم ئەوە یەکەمجارە بە راشکاوی و رووبەڕوو لەگەڵ کاك نەوشیروان گفتوگۆ بکەم، پێشــتر زۆر تێبینی و رەخنەم لەسەری هەبوو، چونکە رابردوویەك کە بۆتە بەشـێك لە ژیانی ئێمەو بەشێك لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشـتمانیشە، زۆر شــتمان پێدەڵێت، کە وەك کاك نەوشیروان وتی با گۆڕ هەڵنەدەینەوە، چونکە بۆگەن و ئێسك و پرووسك دێنە دەر.

یەك لەو خاڵەگرنگانەی کە ئەمڕۆ بۆ خەڵك گرنگە ئەوەیە نەوشـیروان مســتەفا ژیانێکی زۆر ســادەی هەیە، وەك دەڵێن لە ســاڵانی هەشتاکانیش وابووە،هیچ کاتێك نەیویســتووە ژیانی خۆی لە خەڵکی ئاســایی جیا بکاتەوە، وەك کەسـێکی خانەدان خۆی دەرگا لە میوان دەکاتەوەو هەر خۆیشــی تا بەردەرگای ماڵەکەی بۆ بەڕێکردن لەگەڵی دەچێت و زۆر بەخێرهاتنیشــی دەکات، لە خانوویەکی زۆر ئاسایی دەژێت،کە دەچیتە ژوورەوە هەســت ناکەی ماڵە بەرپرسەکانی ئەو سەردەمەیە، پێشتر وێنەی کاك نەوشـیروان لە زەهنی مندا، ئەوەبوو راستییەکان تەنها لەلای خۆیەتی و ئەوەندە بڕوای بە دیالۆگ نییە، پێم وابوو دەمارگرژەو رەفزەوییە، واقیع ناخوێنێتەوەو شــت بەســەر خەڵکیــدا فەرز دەکات، پێم وابوو زوو لەو قســانە تــوڕە دەبێت کە بە دڵی ئەو نین و هەڵدەچێ، پێم وابوو بۆ کەمکردنەوە یا نەهێشتنی جیاوازییەکان گەر بتوانی تەسفیەی جەســەدیت دەکات،پێم وابوو نەوشــیروان..... بەڵام لەگەڵ یەکەم دوانندنیدا، هەستم کرد نەوشــیروان ئێستا زۆر جەخت لەســەر دیالۆگ و گۆڕینەوەی راو رای بەرامبەر دەکاتەوە، حەز دەکات کێشــەکان دوور لە توندوتیژی بەرەو چارسەرکردن بچن،نایەوێ بە هیچ جۆرێك جارێکی تر کورد لەنێو خۆیدا خوێن بڕێژێ، نایەوێ ئەو ئەزموونەی بە خوێن هاتۆتە دی بە هۆی گەندەڵییەوە لە دەستی بدەین، نایەوێ تایبەتمەندی هەر شــارێکی کوردستان لەبەرچاو نەگیرێت و لە ناو حوکمڕانی گشتیدا بتوێتەوە، نایەوێ خەڵك بە دروشمی بریقەدار فریو بدرێ، نایەوێ...

بەڵام نەوشــیروان چەند دەتوانێ ئەو بۆچوونانەی خــۆی بهێنێتە دی، ئەمەیان با خوێنەر لە دوای خوێندنەوەی ئەم دیمانەیەی رای خۆی لەسەر بدات.

*** بابەتێك هەیە كە جێگەی پرسیارە، لە ساڵی ١٩٧٢ كاتێك كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستان دامەزرا، ئەو كاتە پارتی لە هەرەتی بڵاوبوونەوە و پەرسەندن دا بوو. رۆڵی كاك نەوشیروان لە دامەزراندنی ئەو كۆمەڵەیە دیار نییە، بە تایبەتی كە ئەوكات پێی دەوترا كۆمەڵەی ماركســی لینینی، رۆڵی تۆ چی بوو لەو دامەزراندنەدا، بە تایبەت كە ئەوكاتانە تۆ لە ڤیەنا بوویت؟**

- كۆمەڵە ساڵی ١٩٧٠ دامەزراوە. رۆڵی من لە پێشترا ئەوەبوو كە خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری رزگاری بووم. گۆڤاری رزگاری زەمینەی فكریی دروستكردنی كۆمەڵەی خۆشــكرد. ئەو زەمانە پارتی دوو كەرت بوو، كەرتێكیان خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا ســەركردایەتی دەكرد و كەرتەكەی تریش خوالێخۆشــبوو برایم ئەحمەد سەركردایەتی دەكرد. حزبی شــیوعیش ببــوون بە دوو كەرتەوە، كەرتێكیان لایەنگیــری لە یەكێتی سۆڤیەت دەكرد و كەرتەكەی تریش لایەنگری لە چین دەكرد. لە ناو كورددا بە تایبەتی ئــەو چوار باڵە یان چوار حیزبە هەبوون. ئەو كاتە ناكۆكییەكی زۆر قووڵی فكری لە نێوان خەتی یەكێتی سۆڤیەت و خەتی چین هەبوو. چین یەكێك بوو لەو وڵاتانەی كە بیری جۆرێك لە ماركسیزم - لینینیزم و بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگ ی بڵاو دەكردەوە، بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگ لەسەر بنچینەی ئەوەی كە نەخشەی رێگای رزگاربوونی گەلانــی بەو جۆرە دانابوو كە پێویســتە میللەتێك كاتێك خەبــات دەكات بۆ ئەوەی رزگاری بەدەســت بهێنێت دەبێت حزبێكی پێشڕەوی هەبێت بە شێوەیەكی نوێ، دەبێت بەرەیەكی یەكگرتووی گەلیی هەبێت، دەبێت لەشكرێكی رزگاری گەلیی هەبێت، ئێمە پێمان وابوو هیچ لەو (٣) سێ مەرجانە لە هیچ كام لەو حیزبانە نەبوون. لەبەرئەوە ئێمە هەوڵماندا لەســەر ئەو مۆدیلە نوێیە رێكخستنێك دروست بكەین. بەیاننامەی (١١)ی ئادار پەلەی كرد لە پێكهێنانی كۆمەڵە. چونكە بەیاننامەی (١١)ی ئادار بووە هۆی ئەوەی دوو باڵەكەی پارتی سەرلەنوێ یەكبگرنەوە و ئەمیان لەناو ئەوی تردا توایەوە. ئەمە بووە ســەبەبی ئەوەش ئەو باڵەی شیوعی كە سەر بە یەكێتی سۆڤیەت بوو وردە وردە زاڵ بێت و لە حكومەت نزیك بێتەوە و ئەوەندەی تر تەسفیە بكات. لەو كاتە ئەو بۆشــاییە فكری و سیاســیەی هەبوو كۆمەڵە توانی پڕی بكاتەوە. من ئەو كاتە لە ســاڵی ١٩٧٠ حوكمی ئیعدام درابووم لە لایەن مەحكەمەی سەورەوە لەسەر كێشەیەك كە بە راســتی دەســتی منی تێدا نەبوو، بەڵام وەكو تۆڵە كردنەوە ئەو ســزایە لەسەر مــن داندرابوو. لەبەرئەوە نەمدەتوانی بە ئازادی هاتووچۆ بكەم و بێم و بچم و لەگەڵ

خەڵکدا دانیشـــم و سیمینار و کۆبوونەوە بکەم. بە پێچەوانەوە وەختێك کە برایم ئەحمەد و گروپەکەی هاتن بۆ قەسرو ماکۆســـان، من لەگەڵیان هاتم و ماوەیەك لەگەڵیشیان مامەوە هەتاوەکو ڕێگایەکم دۆزیەوە کە لە ڕێیەوە ســـەفەری دەرەوە بکەم. دوای ئەوە ساڵی ١٩٧١ ســـەفەری دەرەوەم کرد. براکانی تر درێژەیان بە ئیشەکە دا و من یەکێك بووم لەو کەسانەی هاوکاریم کردووە لە دامەزراندنی کۆمەڵە ولە پێکهێنانی گروپەکانی ســـەرەتاکە. بەڵام ئـــەو ماوەیە بە حوکمی ئەوەی کە من دوور کەوتمـــەوە و چووم بۆ ڤیەننا، بەڵام ئاگاشـــم لێهەبووە کـــە برادەرانی تر ئیش و کاریان کـــردووە، هەرچەندە بەهۆی ســـەفەرکردنەکەم من وەك خۆم نەمدەتوانی بە چالاکی بەشـــداری تێدا بکەم، ئـــەو کاتەش کورد لەناو ئەوروپـــا ئەوەندە زۆر نەبوو تا بڵێین لە ناو کوردەکانی ئەوروپا ئیشم کردووە.

*** دەکرێ لە ڕێـــگای تۆوە بزانین بیرۆکەی دامەزراندنـــی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بۆ یەکەم جار هی کێ بوو؟**

- بیرۆکەکە لە راســـتیدا وەك گوتم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازیی چینی سۆڤیەتی. ئەو زەمانە گروپێك هاتبوون بۆ سلێمانی کە جیابببوونەوە لە حیزبی تودەی ئێرانی، ئەو گروپە بە ناوی شـــادومانی ئینقیلابی ئەو کارەیـــان دەکرد. ئەوانە کاریگەری زۆریان هەبوو لەســـەر ژمارەیەك لە کادیـــرە گەنجەکانی ئەو کاتەی کە لە باڵـــی مەکتەبی سیاسی کاریان دەکرد.

*** واتا تۆ لەو کەسانە نەبووی کە تەئسیرت لێ کرابێ؟**

- نەخێر من یەکێك بووم لەو کەسانە.

*** لە ساڵی ١٩٧٥ کاتێك ئەو نسکۆیە بەسەر کورد دا هات، تۆ ئەو کاتە پەیوەندی سیاســـیت لەگەڵ پارتی بوو یان لەگەڵ کۆمەڵە؟ یان لەگـــەڵ هەردووکیان بووی؟ چۆن؟**

- مـــن دوای یەکگرتنەوەی پارتی، نەبوومەوە ئەندام لە پارتی، هەر وەك دۆســـتی پارتی مامەوە. هەتا ئەو کاتەی من سەفەری ڤیەننام دەکرد هاتم سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتیم کرد، ئەو کاتە دکتۆر مەحمود لەوێبوو و زۆریان پێ خۆشبوو کە من وەك نیشانەیەك لە یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە لەوێ ببم بە ئەندامی لقی ئەوروپا. وابزانم کاغەزیشـــیان نووسی، بەڵام من لەدەرەوەی ڕێکخســـتن بووم. بەڵام لەگەڵ برادەرانی کۆمەڵە ئاگاییمان لەیەکتر هەبوو.

*** کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان دوای ساڵی ١٩٧٥ توانی بە هێزو تین و گوڕێکی ترەوە بکەوێتە شاخ و هەروەها لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانیش تا ناوەڕاستی هەشتاکان توانی لە شاریش هاوسەنگیەکی گەورە لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردی درووست بکات. چ پێویستی بەوە بوو بچێتە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان؟ لە کاتێکدا کۆمەڵە خۆی حزبێکی زۆر فراوان و گەورە بوو بە تایبەتی لەریزی گەنجەکان.**

- پێش دەستپێکردنەوەی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥-٧٦ کۆمەڵە رێکخراوێکی وەها گەورە نەبووە، هەرچەندە پتەوترین رێکخراو بوو لەچاو هەموو رێکخراوەکانی تر و لەرووی رێکخستنەوە لە هەموویان کارامەتر بوو، کادیری باشی هەبوو بەڵام بە ژمارە کەم بوون. ئەمە یەکەم. دووەم، بۆ زانیاریت ئەو کاتە مام جەلال سکرتێری کۆمەڵە بوو هەر لە سەرەتای دامەزراندنەوە تا ئەو فەترەیەش.

*** واتە یەکەم سکرتێری کۆمەڵە مام جەلال بوو؟**

- بەڵێ. درووستکردنی یەکێتی لەراستیدا جۆرێك بوو لە جێبەجێکردنی ئەو بیرەی کە هەم پارتی پێشڕەو هەبێت هەم بەرەی یەکگرتوویی گەل هەبێت و لەشکری رزگاریی دروست بکات. ئێمە هەوڵماندا ئەو مۆدیلە لە کوردستان دروست بکەین. واتە بەشداریکردنی کۆمەڵە ئێمە ئەو زەمانە وامان حیساب دەکرد وەك چۆن تۆ بەردێك دەخەیتە ناو ئاوەوە چەند هەڵقەیەك دروست دەکات، هەڵقەی یەکەم زۆر رۆشن و دیارە، هەڵقەی دووەم کەمتر رۆشنە، هەڵقەی سێیەم لەو کەمتر، وامان دانابوو کۆمەڵە ببێت بە نەوات بۆ کۆکردنەوەی ئەو هەڵقە جیاجیایانەی توێژە کۆمەڵاتیەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری.

*** مام جەلال چۆن وازی لە سکرتێری کۆمەڵە هێنا، با بزانین کاك نەوشیروانیش چەندەمین سکرتێرە؟**

- لەراستیدا رەنگە بە فەرمی من دووەم سکرتێری کۆمەڵە بووبم. ئەو کاتەی کە مام جەلال لە ساڵی ١٩٧٢ چووە دەرەوە، ئەوەی کە بە عەمەلی سەرپەرشتی رێکخستنەکانی کۆمەڵەی کردووە شەهابی شێخ نوری بووە. دوای ئەوەی کە کاك شەهاب گیرا و رێکخستنەکانی کۆمەڵە تووشی گرتن و راوەدوونان بوون کۆمیتەی هەرێمەکان دروست بوون. کاك ئارام مەسئولی کۆمیتەی هەرێمەکان بووە بەڵام ئەو کاتەش هەر مام جەلال سکرتێری کۆمەڵە بووە. پاش ئەوەی کە یەکێتی نیشتمانی

دامەزرا و بێجگە لە کۆمەڵە بزوتنەوەی سۆشیالیســـتی هاتە ناو یەکێتییەوە و خەتی گشـــتی دروست بوو، ئیتر ئەوساکە گفتوگۆمان لەگەڵ مام جەلال کرد کە ئایا وەکو ســـکرتێری کۆمەڵە ئەمینێتەوە یانیش دەبێت بە قاســـمی مشـــتەرەکی ئەو (٣) سێ باڵەی کە یەکێتیان دروســـت کردووە. ئەو (مام جەلال) قاسمە مشتەرەکەکەی هەڵبژارد و ئێمەش هەموومان قەبوڵمان بوو کە ببێ بە قاســـمی موشتەرەکی هەر سێ باڵەکەی ناو یەکێتی، بەڵام تا ئارام مابوو هەر مام جەلال بە فەرمی ســـکرتێری کۆمەڵە بوو، کاك ئارامیش کارەکانی بەڕێوەدەبرد، واتا بەرپرســـی کۆمەڵە بوو بەڵام سکرتێر نەبوو، بەڵکو هەر مام جەلال سکرتێر بوو.

*** بەڕێزت لە ڕێگای کۆنگرە و کۆنفرانس یا پلینیۆمەوە بووی بە سکرتێر یان مام جەلال دەستنیشانی کردی بۆ سکرتێری؟**

- نەخێر من دوای ئەوەی کە کاك ئارام شەهید بوو لە بەری قەرەداغ، کۆبوونەوەیەکی فراوانی کادیرەکانی کۆمەڵەمان لە شـــێنێ کرد، لەو کۆبوونەوەدا من هەڵبژێردرام کە سەرپەرشـــتی کاروبارەکانی کۆمەڵە بکەم. دوای ئەوە کۆبوونەوەیەکی فراوانی ترمان بەســـت، پاشان کۆنفرانســـی یەکەممان بەست و لەم کۆنفرانســـەدا من بە سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێردرام. ئێمە لە ســـەردەمی پێشـــمەرگایەتیدا (٣) سێ جار کۆنفرانسی کۆمەڵەمان بەستووە.

*** بەڵام لە هەشتاکان دوایی نەبەسترا؟**

- لە هەشـــتاکانیش بەستمان بەڵام دوای ئەوەی لە ١٩٨٦ شـــەڕی سەخت لەنێوان کورد و حزبی بەعس درووست بوو، لەراستیدا لە ترسی بۆردوومانکردن و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەمانتوانی کۆنگرەیەکی وەها ببەســـتین، ئەترســـاین کـــە زۆربەی کادیرەکانمان بکوژرێن.

*** رەنگە ئەو کاتە حەماسێکیش نەبوویێت بۆ بەستنی کۆنگرە؟**

- شەڕەکە ئەوەندە ســـەخت بوو، بوو بووە ئەولەویات. ئەوەی من باسی دەکەم دوای ١٩٨٦ ە.هۆکارەکەشـــی ئەو شەڕە سەختە بوو کە ئەو کاتە جێگایەك نەبوو تۆ بتوانی بە دڵنیایی کۆنفرانسی تێدا ببەستی.

*** لە ٢١-١١-١٩٧٦ کە شەهابی شێخ نوری و جەعفەر عەبدولواحید لە سەرکردایەتی کۆمەڵە و ئەنوەر زۆراب لە ڕێکخستنی بەغداد لە سێدارە دران. ئایا لەسەر کۆمەڵە لە سێدارە دران یان بەهۆی بیری نەتەوەیی و کوردایەتی بوو؟**

- یەکێك لەو شـــتانەی کە لەســـەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە ئێمە گرنگیمان پێ دەدا ئەوە بوو کە کۆمەڵە خۆی بپارێزێ لە لێدان. ساڵی ١٩٧٠ تا ١٩٧٥ ئێمە هێنی ئەوەمـــان هەبوو کە ئەگەر کەســـێك بگیرایە ڕەنگ بوو پارتی بیگرێ بـــە تۆمەتی ئەوەی کە جاسوســـی بەعســـیە، حکومەت بیگرێ بە تۆمەتی ئەوەی کە جاسوسی دەزگای پاراســـتنە. لەبەرئەوە ئەوەندەی بۆمان کرا هەوڵماندا هەڵقەی ڕێکخستنەکانی نـــا کۆمەڵە زۆر زۆر تەســـك بێت و ئێمە کادیری ڕێکخســـتن دروســـت بکەین نەك ڕێکخســـتنی جەماوەری. لەبەرئەوە ئەدەبیاتیشـــمان نەبوو، یەك دوو بڵاوکراوە وەختی خـــۆی بە هەڵە بڵاوکراوەتەوە، بـــەڵام دوایی کۆکراوەتەوە. کۆمەڵە تا ســـاڵی ١٩٧٦ هیچ شـــتێکی بە ڕەســـمی بڵاونەکراوەتەوە بۆ خەڵك. بە شێوەیەکی زۆر نهێنی کاری دەکرد لە ناو نوخبەیەکی هەڵبژێردراودا، بۆ نموونە لە ناو زانکۆی ســـلێمانیدا وەختێ کە ڕێکخســـتن دروست دەکەیت تەنها ئەو کەســـانەت ڕێکدەخست کە لەکاتی قەیران و تەنگژەکاندا دەتوانێ ســـەرکردایەتی ڕای گشـــتیبکات، ئەتوانێت لە ناو خوێندکاراندا ڕۆڵێکـــی کاریگەری هەبێت لەنـــاو کرێکاراندا ئەو کەســـانە ڕێکبخەیت کە لە کاتی ئەزەماتـــدا ئەتوانێت لە ناو چینی کرێکاراندا کار بکات، لەناو ڕۆشـــنبیراندا هەر بەم شێوەیە. واتە هەڵبژاردەی ئەمانە هەوڵدەدرا کۆبکرێتەوە و بە چەندین قۆناغدا تێدەپەڕین و بە هەڵقەی ڕۆشـــنبیری و ئەمانە تا ئەبن بە ئەندام. ســـاڵی ١٩٧٥ کاتێ کۆمەڵە هاتە ناو یەکێتییەوە ئیتر ئەو قۆناغە دەســـتی پێکرد. کاك شـــەهاب و ئەو برادەرانەی کە حوکمی ئیعدام دران بە تۆمەتی ئەوەبوو کە ئەمانە تەیارێکی مارکســـیان درووست کردووە و ســـەفەری دەرەوەیان کردووە و پەیوەندیان کردووە بە جیهاتی بێگانەوە، چونکە کاك شەهاب چەند جارێك چووبوو بۆ بەیروت فەڵەستینیەکانی بینیبوو. واتا بەشێکی ئەو برادەرانەی ئیعدام کران لەسەر ئەوە ئیعدام کران.

*** ئێستا یان جارانیش باس لەوە دەکرا کە جیاوازیەك هەبووە لەنێوان شەهید ئارام و شەهید شـــەهاب. هەریەکە و سەر بە باڵێکی سەربەخۆ بوون و کۆمەڵێك گرووپی دیکەیان لە خوار خۆیان هەبوو. یەعنی کۆمەڵێك پەیڕەوی شـــەهید شەهابی کردووە و کۆمەڵێکیش پەیڕەوی شەهید ئارامی کردووە. ئایا کاك نەوشیروان مستەفا پەیڕەوی کام باڵی دەکرد تا ئەو دوانە مابوون؟**

- ئەوە راست نییە، ئەوە راست نییە،یەك کەڕەت ناکۆکی لەناو کۆمەڵە دروست بوو، ئەویش ناکۆکیەکی فکری بووە، دوایی حەســـم بوو. ناکۆکیەکە دوای ساڵی ١٩٧٥ و تێکشکانی شۆرشی کوردبوو، لە ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە جۆرێك لە بۆچوون دروست بوو بوو کە ئایا ناکۆکی ســـەرەکی ئێمە لەگەڵ حکومەتی بەعســـە یان لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکایە. بەڵام لە دوای فەترەیەکی زۆر کەم ئەو موشکیلەیەش حەل کرا ئەوەی کە پێشبینی شۆرشی کرد و کاك شەهابیش پێشبینی شۆرشی کرد.

*** ئەی بۆ لە سەرکردایەتی کۆمەڵە و سەرکردایەتی ئێستاش هەندێ جاران ئەو شتانە باس دەکرێن. لە ســـەرکردایەتی یەکێتی ئەوانەی کە پێشان لە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی کۆمەڵە بوونە باسی ئەو جیاوازیە دەکەن لە نێوان شەهید ئارام و شەهید شەهابدا؟**

- من پێموایە ئەوە راســـت نییە. رەنگە ئەو برادەرانە لە بێئاگاییەوە قســـە دەکەن. تا ئەو زەمانەی کە کاك شەهاب و هاوڕێکانی لە سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون کاك ئارام کادیرێکی ئاسایی بووە لە کۆمەڵە، لە سەرکردایەتی نەبووە. دوای ئەوەی کاك شەهاب و هاوڕێکانی کەوتنە بەر گرتن و راونان و کۆمیتەی هەرێمەکان دروست بوو، لەوەیا کاك ئارام هاتە پێشەوە و بووە کەسی یەکەمی ناو کۆمەڵە.

*** باشـــە کاك نەوشیروان کە باسی شەڕی ناوخۆی هەشتاکان دەکرێت، لەبەرچی هەموو حزبەکانی بەرەی جود ئەوانەی کە ئێســـتاش ماون و جگە لەمانەش زۆر خەڵکی تەنانەت ناو یەکێتیش ئێستا نەوشـــیروان بە سەرکردەیەکی کاریگەری ئەو شەڕەی ناوخۆیە دادەنێن. وەك رۆژانە ئەوانەی ناو مەکتەبی سیاسیش ئەوە دەڵێنەوە کە نەوشیروان خەڵکی بە کوشتن داوە. باشـــە بۆ هەر کاك نەوشیروان ســـەرکردایەتی یەکێتی دەکرد،یان فیعلەن تۆ رۆڵێکی زۆرت هەبـــوو، بەکورتی بۆچی ناوی تۆ زیاتر لە هەر ناوێکـــی دیکە زەق دەکرێتەوە؟یان مەبەستێکی تر هەیە کە ئێمە نایزانین؟**

- رەنگـــە ئەوە دوو فاکتەری هەبێـــت. یەکێکیان فاکتەری ناوخۆی یەکێتییە کـــە ئەوە بەشـــێکە لەو ململانێیە ناوخۆییەی لە نێوان باڵە جیاجیاکانی ناو یەکێتیدا هەیە. بەشێکی

تریشیان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو توانا میدیاییەی کە کاتی خۆی حزبی شیوعی عێراق هەیبوو، لە راستیدا حزبی شیوعی رۆڵی زۆر گەورەیان هەبوو لەوەی کە ناوی من بە شەڕی ناخۆوە بنووسێنن بە تایبەتی دوای شەڕی (پشتئاشان) و ئەوانە. خۆت ئەزانی کادری راگەیاندن لە حزبی شـــیوعیدا زیاتر بوو، ئەو زەمانە یەکێتی سۆڤیەت مابوو، حزبی شیوعی لەگەڵ حزبی شـــیوعی تری دونیا پەیوەندیان هەبوو ئیتر هەڵمەتێکی جیهانییان دژ بە من دەســـت پێکرد.

*** باشـــە لەبەرچی ناوی تۆیان دیار خســـت؟ئایا لەبەرئەوە نەبوو فیعلەن رۆڵێکی باشت نەبینی؟**

- لەبەرئەوەی من سەرکردایەتی هەندێك لە شەڕەکانم کردووە.

*** واتا حەقیقەتێکی تێدا هەبووە بەرامبەر بە تۆ؟**

- من حەز ناکەم بگەڕێینەوە بۆ رابردوو گۆڕ هەڵبدەینەوە چونکە کەگۆڕ هەڵدەدەیتەوە عادەتەن بۆگەن و ئێســـك و پرووســـك دێتە دەرەوە. شـــەڕی یەکێتی لەگەڵ هەموو لایەنەکانی ترا، لەراستیدا بە پلەی یەك لەگەڵ پارتیدا بوو، چونکە پارتی وەکو تاکە حزب مەبدەئی تەعەددودیەتی قەبوڵ نەدەکرد. ئەو شـــەڕانە بەشێك بوو لە چەسپاندنی فکـــرەی تەعەددودیەت کە بۆ جاری یەکەم بوو یەکێتی هێنایە کوردســـتانەوە. فرەیی حزبی، فرەیی سیاسی و فرەیی رۆژنامەوانی تا ئەو زەمانە پارتی خۆی بە تاکە حزب دەزانی کە شیعاری ئەوەی هەبووپێشڕەوی کورد پارتیە و هیچ حزبێکی تر نییە. ئەمە وەختێك یەکێتی دروست بوو هەڵگەڕانەوە بوو لەو سەرەتایە.

*** بەس هەست ناکەی لە واقیعی عەمەلیدا یەکێتی نەیتوانی ئیستیعابی ئەو هەموو حزبە کوردســـتانیانە بکات، کە خەباتی رزگاری نیشـــتمانیان دەستپێکردبوو؟چونکە یەکێتـــی بەتەنیا لەبەرەیەك بوو و حزبەکانی تریـــش هەموویان لە بەرەیەکی تر. خۆی تەعەددودیـــەت ئەوەیە حزبەکانی تـــر قەبوڵ بکەی لە کاتێکدا پارتی لەنـــاو زۆرترین حزبەکانی کوردســـتانیدا بوو، بەرەی جودیان پێکهێنابوو، بەڵام یەکێتی بە تەنیا بوو و شەڕی دەکرد بۆ ئەوەی هەموو حزبەکانی تری وەکو سۆشیالیست وشیوعی و پاسۆك و....هتد پاکتاو بکات؟**

- من وەك گوتم نامەوێ باســـی ئەوە بکەین. بە جێیدەهێلین بۆ مێژوونووســـان، با ئەوان هەڵیسەنگێنن.

*** با بێینە سەر هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە.. خەڵکێکی زۆر چ ئەوانەی ئێستاش هەر خۆیان بە کۆمەڵە دەزانن یان لە ڕێگای کۆمەڵەوە توانیان ببن بە کادیرێکی کوردستانی و نیشتمانی،قسە ئەوەیە خەڵکی دەرەوەی کۆمەڵەش دەڵێن گورزێکی گورچك بڕ بوو کە درا لە کۆمەڵە و تەنانەت لە بزاڤی نیشتمانیش، باشە کاك نەوشیروان چۆن توانی ئەو بڕیارە بدات کە کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٨٨ هەڵبوەشێنێتەوە؟**

- من بە تەنیا ئەو بڕیارەم نەدا، ئەوە ژمارەیەکی زۆر پێش من لە کادیرەکانی کۆمەڵە ئەو گفتوگۆیانەیان دەست پێکردبوو لەگەڵ یەکێتی شۆڕشگێڕاندا، لە قاسمە رەشەوە ئەو گفتوگۆیانەیان دەستپێکردبوو. کە بڕیاری هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەشمان دا لە کۆبوونەوەیەکی زۆر فراواندا چەند سەد کەسێك تێیدا بەشدار بوون کە ئەو بڕیارەمان دا. بەڵام لە بیرت نەچێت وەختێك کە کۆمەڵەمان هەڵوەشاندەوە تەسلیمی دەست سەرکردایەتیەکم کرد کە جگە لە دوو کەسیان ئەوانی تر هەموویان کۆمەڵە بوون.

*** واتا خۆت قەناعەتت بە هەڵوەشاندنەوەکە هەبوو؟**

- بەڵێ ئەو زەمانە قەناعەتم پێ هەبوو. بەڵام ئەزموون دەری خست کە شتێکی هەڵەمان کردووە.

*** هەستت کرد کە غەدرێکت کردووە؟**

- ئێستا واتا ئەو دوو سێ ساڵە هەست دەکەم کە کارێکی هەڵەمان کردووە. لەوەوپێش پێم وابوو وەك بۆم باس کردی کە کۆمەڵەمان هەڵوەشاندەوە و تەسلیمی سەرکردایەتی یەکێتیمان کرد، ئەو کاتە لەناو سەرکردایەتی یەکێتیدا تەنها د.فواد مەعسوم و د.کەمال فواد کۆمەڵە نەبوون ئەوانی تر هەموویان کۆمەڵە بوون و دەیانتوانی هموو یەکێتی بکەن بە کۆمەڵە.

*** بەڵام نەیانکرد؟**

- بەڵێ نەیانکرد..

*** دەکرێت بزانین کاك نەوشـــیروان لەبەرئەوەی زۆر جاران هەســـت دەکرێت لە حزب دادەبڕێت واتا تووڕە دەبێت، وەك ماوەیەك لە زەڵمی دانیشـــتبووی خەریکی نووســـینی یاداشـــتەکانت بووی و هەندێ جاریش ســـەفەری دەرەوەت کردووە، هەنـــدێ جاری دیکەش هەســـت دەکەیت کاك نەوشـــیروان عادزە، دڵگیرە، تووڕەیە. دەکرێ بزانین ئەو هەموو جارانە کاك نەوشیروان ئیستیقالەی دەدا یان هەر بۆ خۆی تووڕە دەبوو و خۆی دوور دەخستەوە و دەچووە کەنار و لە ناوەند دووردەکەوتەوە؟**

- پێموایە ئێوەو مانان حەقە بە تەقدیرەوە ســـەیری ئەو هەڵوێســـتانەی من بکەن. چونکە ئەو کاتانەی من دوور دەکەوتمەوە لە راســـتیدا لەکاتی شـــەڕی ناخۆدا بووەو من بۆم بەجێهێشـــتوون. بـــۆ نموونە بۆت باس بکەم لـــە دوای هەڵبژاردنی یەکەمی پەرلەمانـــەوە من لەگەڵ برادەرەکانی خۆمانا ناکۆك بووین لەســـەر ئەوەی کـــە ئایا کادیرەکانی یەکێتی بێنین کاروباری حکومەتی پێ بسپێرین یاخود کادیرەکانی یەکێتی چاودێر(مراقب) بن بەســـەر حکومەت و، تەکنۆکرات بهێنین. ئەوە یەکێك لەو خاڵانە بووە بووە کە ئەو زەمانە من لایەنگری ئەوە بووم خەڵکی تەکنۆکرات بهێنین با ئەوەشت پێ بڵێم منیان تەرشیح کرد بۆ یەکەم سەرۆکی حکومەت، بەڵام نەمکرد چونکە باوەڕم پێ نەبوو. برادەرانی تر پێیان وابوو ئەگەر لە دەسەڵاتدا نەبین خەڵکمان لەگەڵ نابێت، لەبەرئەوە دەیانوت ئێمە خۆمان لە شۆرشدا ماندوو بووین بۆچی تەسلیمی خەڵکی تری بکەین. لە مەوزوعی یەکێتی و پارتیشـــدا من رەئیم وابوو، بێگومان پێش هەڵبژاردن من لەگەڵ کاك مەسعود قسەم کرد لەسەر ئەساسی ئەوەی لیستێکی هاوبەش دروست بکەین. من باوەرم وابوو لەبەرئەوەی میللەتەکەمان بە قۆناغێکی زۆر سەختدا تێپەڕیوە و تووشـــی کارەساتی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و رۆشنبیری بووە. ئەم قۆناخە میلەتەکەمان پێویســـتی بە ئیستیقرار هەیە، بۆ ئەوەش چاکترین شت ئەوەیە دوو حزبە ســـەرەکیەکە لیستی ســـەرەکیان هەبێت. ئەو زەمانە (١٩٩٢) پەرلەمان سەد ئەندامی هەبوو، وتم با پارتی ٣٥ کورســـی هەبێت و یەکێتی ٣٥ کورســـی هەبێت. ٣٠ یەکەی تر بۆ خەڵکی ســـەربەخۆ و تەکنۆکـــرات و حزبەکانی تر دابنێین بۆ ئـــەوەی ئەگەر لە نێوان یەکێتی و پارتیدا جۆرێك لە ناکۆکی دروســـتبوو، ئەو کاتە ئەو ســـی کەسە بتوانێت باڵانســـەکە راســـت بکاتەوە. بەڵام فکرەکەی من قەبوڵ نەکرا. من پێشنیارم کـــرد بۆ برادەرەکانی خۆمان کە ئەگـــەر لایەك حکومەت وەربگرن و لاکەی تر ببن بە ئۆپۆزیسیۆن. لەگەڵ پارتی قسە بکەین ئەگەر ئەوان حکومەت وەرگرن ئێمە دەبین بە

ئۆپۆزیسیۆن، ئەگەر ئێمەش حکومەتمان وەرگرت با ئەوان ببن بە ئۆپۆزیسیۆن. ئەو فکرەیەش لە لای برادەرەکانی ئێمە قەبوڵ نەبوو و پێیان وابوو پێکەوە حکومەتێکی ئیئتیلافی دروست بکەن. لەبەر ئەوە من عەقڵم نەیبڕی و وازم لێ هێنا. وە ئەگەر وازم لێ نەهێنابایە ئیحتیمالی هەبوو ئەو ناکۆکیانە، ئەو زەمانە مومارەسەی کاری دیموکراسی زۆر کەم بوو، رەنگ بوو ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان ئەو باڵانەی ناو یەکێتیدا. پێموابوو ئەولەویەت بۆ ئەوەیە کە یەکێتی بە ساغ و سەلامەتی بمێنێتەوە لەبەرئەوە من بۆم بەجێهێشتن. هەموو جارەکانیش وابووە کە ناکۆك بوو بووم لەگەڵ رەفیقەکانم لەجیاتی ئەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکەم بۆم جێهێشتوون.

*** هەست ناکەی لە سیاسەتدا ئەوە مەرفوزە؟ ئەو وازهێنان و خۆ دوورخستنەوەیە. سیاسەت وایە تۆ دەبێت ململانێش بکەیت و هەوڵیش بدەیت کەمینەی خۆت بکەیت بە زۆرینە.**

- ئەوە لە وڵاتێکدا کە حزبەکان چەکدار نەبن راستە، بەڵام لە وڵاتێکدا کە حزبەکان چەکدار بن و سەرکردایەتی حزبەکە و سەرکردایەتی سیاسی ئامادە بن بە چەك دیفاع لە مانەوەی خۆی لەو پۆست و پایانەدا بکات پێم وایە ئینسان بکشێتەوە باشترە وەك لەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکات. ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت رەنگە لە وڵاتێکدا بێت کە تەقالیدی دیموکراسی رەگداکوتاوی تێدابێت. لە ئەورووپا رەنگە وابێت بەڵام لە کوردستانێکدا کە هەموو چەکدارن پێم وایە ئەوە سەر ناگرێ.

*** لینین کە شۆڕشی ئۆکتۆبەری داگیرساند سەرەتا کەمینە بوو دوایی بە گفتوگۆی چڕو بەردەوام بوو بە زۆرینە. عەزیز محەمەدیش جەبهەی وەتەنی لەگەڵ بەعس کرد خۆ لە سەرەتا کەمینە بوو، بەڵام بە کۆبوونەوەی بەردەوامی ناو کۆمیتەی ناوەندی بوو بە زۆرینە. واتا لە سیاسەتدا وایە ململانێکە رەنگە هەندێك جار درێژخایەن دەبێت، ناشبێ سارد ببیتەوە. بەڵام کە دوور کەوتیەوە رەنگە ئەوانی تر ئیستیغلالی بکەن و زیاتر ئەو نەهجەی کە دەیانەوێت جێگیری دەکەن. فکرەکەی تۆش لەو کاتە زیاتر بچووك دەبێتەوە چونکە تۆ مەیدانەکەت بۆ جێهێشتوون. پێم وایە ئەوە لە سیاسەتدا زیاتر زیانت پێدەگەیەنێت، بۆیە ئەگەر بەردەوام بیت باشترە و هەوڵیش بدەیت نەگاتە پێکدادانی چەکداری. چونکە هەندێك جاران دەبێتە کۆڵدان، رەنگە تۆ بە نیشتمانپەروەری بزانی بۆ ئەوەی ئەو کێشەیەی هەیە با کەسی تێدا نەسووتێ بەجێیدەهێڵی؟**

- من نموونەیەکت بۆ باسکەم. کاتێك کە شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی دەستی

پێکرد من زیاتر له سـاڵێك بوو له لەندەن دانیشتبووم. هیچ دەستێکم له هەڵگیرسانی شەڕی یەکێتی و پارتی و، یەکێتی و بزوتنەوەدا نەبوو، من بەسەر شەڕەکەدا هاتمەوە. که هاتیشمەوە لایەنی گفتوگۆکه من دەمکرد. له گفتوگۆکەشدا یەك خاڵی بنەڕەتی هەبوو بە نسـبەت منەوە کە ئەمویست جێبەجێی بکەم ئەویش گێڕانەوەی برایم خەلیل و داهاتی برایم خەلیل بوو. یەعنی هەموو ململانێکەی من کە پێیان دەوتم مەوقیفی موتەشـەدیدە لەبەر ئەو هۆکارە بووە. وەختێك کە بینیم هیچ ڕێگە له ئاسۆی نزیکدا و هیـچ هیوایەکی ئەوە نییە کە لـە نێوانی یەکێتی و پارتـی دا ڕێککەوتن ببێت، ئاخر مەرحەلە من خۆم بە شەخسـی کاغەزم بۆ کاك مەسعود بارزانی نووسی و کاك مەسـعود یش جوابی بۆ نووسیمەوە و گەیشتینە دارشتنێك (سـیغەیەك)کە بگەینە ڕێککەوتن، بەڵام کە سەیرم کرد له ناو پارتی و یەکێتیشدا چەندین گرووپ هەن دژی ئەو ڕێککەوتنەن و نایانەوێت سەربگرێت. لەبەرئەوە جارێکی دیکەش بەجێمهێشت.

*** قسـەیەکی بەربڵاو هەیە دەڵێت کاك نەوشیروان تەنها سـلێمانی پێ شارە. واتە بیرێکی ناوچەگەری بەسـەریدا زاڵە. دەکرێ ئەمە لەسەر زاری خۆتەوە ڕاستی ئەمە بزانین؟**

- ئەسـڵەن من خۆم بە کوردسـتانی دەزانم نەك خۆم بە خەڵکی کوردستانی عێراق بزانم. یەك نیشانەم پێ بڵێ دەلیلی ئەوە بێت کە من ناوچەگەرێتی دەکەم.

*** دەڵێن گوتووتە هەولێر کوێی پیرۆزە تا شـەڕی تیا نەکرێ کاتێ ساڵی ١٩٩٤، ١٩٩٥ و ٩٦ و واتە ئەو سـاڵانەی کە شـەڕی ناوخۆ هەبوو. ئایـا فیعلەن تۆ وات گوتووە؟**

- وەکو مەبدەء من هەموو کوردستانم پێ پیرۆزە نەك هەر شاری هەولێر. له زاخۆوە تا خانەقین بە ناوچە دابڕاوەکانیشـەوە بە شتێکی پیرۆزی دەزانم، وەختی خۆیشی کە ئێمە خەباتمان کردووە له پێناوی نیشتمانەکەمان خەباتمان کردووە. نیشتمانەکەی ئێمەش بەتەنیا بریتی نییە لە شـاری سلێمانی. ئەوە قسەیەکی ناراسـتە و من وام نەوتووە، بەڵام ئەوەش نەگەڕێتەوە بۆ ئەو قسەوقسەڵۆکانەی کە باڵە ناکۆکەکانی ناو یەکێتی بۆ یەکتری دروستی دەکەن. ئەگینا ئەوەی کە من پێم دەڵێن موهەندسی شەڕی براکوژی بووە، من هەموو شەڕەکانی پێش ڕاپەڕینیش هەر لەسەر هەولێر کردوومە.

